# مختصر صحيح مسلم

للإمام زكي الدين عبد العظيم عبد القوي المنذري
المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردی كردن و ڕونكردنەوەی
نوری فارس حمه‌خان

سەرپەرشتی چاپ
مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

دار المعرفة
بيروت - لبنان

# مُخْتَصَرُ
# صَحِيحِ مُسْلِمٍ

لِلإِمَامِ زَكِيِّ الدِّينِ عَبْدِ العَظِيمِ بْنِ عَبْدِ القَوِيِّ المُنْذِرِيِّ

المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردى كردن و ڕونكردنه‌وه‌ى

**نورى فارس حمه‌خان**

سه‌رپه‌رشتى چاپ

مه‌لا مه‌حموودى گه‌لاڵه‌يى

( به‌رگى سێهه‌م )

بسم الله الرحمن الرحيم



🕮 ناوی کتێب ﴿ مختصر صحيح مسلم ﴾

🕮 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

🕮 تیراژ: (٣٠٠٠) دانــە.

🕮 ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٦٢٧)ی ساڵی (٢٠١١)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

🕮 ساڵی چاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٢ ك.

🕮 تایپ: (نیان حسین)



# ٢٧- نامەی تۆڵەی تاوان (حوددود)

{بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٢٢٨٧ هەتا ژمارە: ٢٤٠٠، زنجیرە: ١٠١ = زنجیرە: ١ هەتا زنجیرە: ٢٢ بەپێی پێڕست + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٠٢ هەتا زنجیرە: ٣٤٦ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣٣٢، زنجیرە: ٩١}.

## ٨١٤) تۆڵەی شەرعی کەسێ کچ یا کوڕبێ، بێوەژن یا بێوە پیاوبێ‌و داوێنپیسی بکا (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦)

### باب: حَدُّ البِكْرِ وَالثَّيِّبِ في الزِّنَا

١٠٣٦- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: كَـانَ نَبِـيُّ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ كُرِبَ لِذَلِكَ، وَتَرَبَّدَ لَهُ وَجْهُهُ، قَالَ: فَأُنْزِلَ عَلَيْـهِ ذَاتَ يَـوْمٍ فَلُقِـيَ كَذَلِكَ، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْهُ، قَالَ: « خُذُوا عَنِّي فَقَدْ جَعَـلَ اللَّـهُ لَهُـنَّ سَـبِيلاً، الثَّيِّبُ بِالثَّيِّـبِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِائَةٍ، ثُمَّ رَجْمٌ بِالْحِجَـارَةِ وَالْبِكْـرُ جَلْـدُ مِائَـةٍ ثُـمَّ نَفْـيُ سَـنَةٍ ». {الحديث: ٤٣٩٢ = ٤٣٨٤}:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو کەسرووش (وەحی = نیگا)ی بۆدەهات، سەخڵەت دەبوو، ڕەنگی دەبرِسکاو دەگۆڕا. فەرمووی: ڕۆژێ سرووشی بۆهات، تووشی هەمان سەخڵەتی‌و ڕەنگ گۆڕان بوو، کە ئەو حاڵەتە بەریدا، فەرمووی: (بڕیارەکانی ئایینی پیرۆز لەخۆم وەربگرن، بڕیارەکانی ئایینی پیرۆز لەخۆم وەربگرن: ئاماژە بەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ:

{فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً — نساء/٤/١٥} ئەو ژنانە کەلەم ئایەتەدا باسکراون، خودا ئەم یاسەیەو ئەم ڕێگەیەی بۆدانان: ژن‌و پیاو، کە ژنەکە شووی کردبێ‌و پیاوەکەیش ژنی هێنابێ، ئەگەر داوێن پیسییان ئەنجامدا، یەکی سەرو سەد داری حەددیان لێ دەدرێ‌و بەردە

بارانیش دەکرێن تامردن! کچو کوڕیش ئەگەر داوێن پیسییان کرد، یەکی سەرو سەد داری حەدیان لێ دەدرێو تاماوەی ساڵێکیش شاربەدەر دەکرێن). {تاج/٣، زنجیره: ٩٢، ژماره: ٢٣٥٥}.

## ٨١٥) بەردە بارانی ژنو پیاو، کاتێ داوێنپیسی بکەن

## بابٌ: رَجْمُ الثَّيِّبِ فِي الزِّنَا

١٠٣٧- عَنِ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِى كِتَابِ اللَّهِ تعالى فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِى كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوْ الاِعْتِرَافُ. {الحديث: ٤٣٩٤ = ٤٣٨٦ فم}:

عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسم بیست (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر دوانگە (واتە: لەسەر مینبەر)ەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بێگومان کەخودا موحەممەدی ناردووە لەگەڵ ئایینی ڕاستو دروستداو قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی، ئایەتی بەردە بارانکردنی داوێنپیسان جاران ئایەتێ بوو لە قورئان کە ئەمە دەقەکەیەتی: {الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ} واتە: پیاوو ژنی سەرە، ئەگەر زینایانکرد، بەبێ چەندو چوون سەنگە سەریان بکەن). ئیمامی عومەر فەرمووی: ئێمە بەخودی خۆمان ئەو ئایەتی ڕەجمەمان خوێندوەو لە مەبەستەکەی تێ گەیشتووین، هەرچەندە ئەم ئایەتە لە تیلاوەتدا نەسخ بۆتەوەو لە خوێندنەوەدا سڕاوەتەوەو لە قورئاندا نانووسرێ، بەلام دەگەرو کاریگەریو بڕشتی هەرماوەو هێشتا حوکمی پێ دەکرێ، بۆیە پێغەمبەر خۆی

(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەردەمی خۆیا، کاری پێ دەکردو داوێنپیسانی بەردەباران دەکرد، ئەوەتانێ ئێمەی یاران‌و جێنیشینانی ئەویش، لەپاش خۆی داوێنپیسان بەردەباران دەکەین، بەڵام دەترسم کە موسوڵمانان بکەونە سەردەم‌و ڕۆژگارێکەوە، کەسێ پەیدا ببێ بڵێ: لەنامەی خودادا ئایەتی بەردەباران کردنی تیانییە، ئەوسا بە نەکردنی ئەرکێ، کەخودا لەقورئانا ایناوە لەسەریان، تاوانبار دەبن‌و لەڕێگە دەردەچن! بێگومان کە بەردەباران کردن فەرمانی نامەی خودایەو ڕاست‌و دروست‌و هەقە، وەئەم فەرمانە (واتە: ئەم حوکمە) بۆ ئەو پیاوو ژنانەیە، کە لەوەو پێش ژنیان هێنابێ‌و بەدەستیان گرتبێ، یاخود شوویان کردبێ‌و مێرد چووبێتە لایان‌و بەدەستی گرتبن، واتە: موحصەن بن.

وەلێ لەهەل‌و مەرجێکا کە بەڵگە هەبێ، کە بریتییە لەچوار شایەتی نێرینەی دادپەروەر، یاسك دیاری بداو سکەکە هیچ ئەگەرێکی تری نەبێ، یاپێ لێنان‌و چوونە ژێروو دانان بەتاوانا، لە ئارادا هەبێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٦ — ش/د/ت/ن} .

## ٨١٦) حەدد جێبەجێ دەکرێ لەسەر کەسێ کەپێ لەکردنی تاوانی داوێنپیسی بنێ. (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦)

## بابٌ: حَدُّ مَنِ اعْتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِالزِّنَا

١٠٣٨- عَنْ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِرَجُلٍ قَصِيرٍ أَشْعَثَ، ذِي عَضَلاَتٍ، عَلَيْهِ إِزَارٌ، وَقَدْ زَنَى، فَرَدَّهُ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ أَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « كُلَّمَا نَفَرْنَا غَازِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَخَلَّفَ أَحَدُكُمْ يَنِبُّ نَبِيبَ التَّيْسِ يَمْنَحُ إِحْدَاهُنَّ الْكُثْبَةَ، إِنَّ اللَّهَ لاَ يُمْكِنِّي مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ إِلاَّ جَعَلْتُهُ نَكَالاً (أَوْ نَكَّلْتُهُ)، قَالَ: فَحَدَّثْتُهُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ: إِنَّهُ رَدَّهُ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ. وفي رواية: فردّه مرتين أو ثلاثاً. {الحديثان: ٤٤٠٠ و ٤٤٠١ = ٤٣٩٢، ٤٣٩٣ فم}:

جابیری کوڕی سەمورە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی کورتە باڵای قژنەی تێکسمڕاویان هێنا بۆ دادگایی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کراسی لەبەردا

نەبوو، تەنیا دەرپێیەکی لەپێدابوو، داوێنپیسی کردبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دووجار گێڕایە دواوە، لەپاشا کابرا هەروازی نەهێنا، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، بەردەبارانیان کرد، هەتا مرد. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (گشت جارێ کەدەچین بۆ خەباتو تێکۆشان لەڕێگەی خوادا، بۆ پەخشی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، کەسێکتان خۆی ئەدزێتەوە، وەك سابرێن دەمرقێنێ، بە جامۆڵکەیێ شیر ژنێ فریو دەداو داوێنپیسی لەگەڵ دەکا، هەرکاتێ خودا دەستم گیربکا، لەیەکێ لەمانە دەیکەم بە پەندی زەمانە، یا فەرمووی: دەیکەم بە پەندی بسات). راوی کە شوعبەیە دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەم بۆ سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕایەوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چوارجار گێڕایە دوواوە. لەگێڕانەوەیەکا: دووجار یا سێجار گێڕایە دواوە. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٧}.

ئەم پیاوەی لەم فەرموودەدا باسکراوە، ماعیزی ئەسلەمی بوو (ڕەزای خودای لێ بێ) ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی دائەنرێ بەهاوەڵی پێغەمبەر، چیرۆکی بەردەباران کردنی لە صەحیحەیندا هەیە، دادەنرێ بە مەدینەیی، لەپاش ئەوەی داوێنپیسی لێی روویدا، تەوبەیەکی جوانی کردو پەشیمان بۆوەو هاتە خزمەتی پێغەمبەرو پێی لەتاوانی خۆی ناو وازی نەهێنا، هەتا بەردەباران کرا، لە فەرموودەیەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئەوە شێت بوویت واوادەڵێیت؟ ماعیز گوتی: نەء. لە گێڕانەوەیەکی تردا، بۆئەوەی کە پێغەمبەر پەشیمانی بکاتەوە، پێی فەرموو: رەنگە هەر ماچت کردبێ؟ گوتی: نەء، تاپێی فەرموو: {هَلْ نِكْتَهَا؟ قَال: نَعَمْ. واتە: ئایا گاوتە؟ گوتی: ئا}. جا ئەوجا فەرمووی: (ژنت هێناوە؟) گوتی: ئا، هێناومە، جا ئەوسا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد سەنگە سەریانکرد. لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە تۆبەیەکی وەهای کرد، ئەگەر بێتو دابەش بکرێ بەسەر نەتەووەیەکی گەورەدا، بەشی هەموویان دەکا).

یاخوا پیرۆزی بێ تەوبەی بەڕاستی. لە فەتحولولهیمدا لەم شوێنەدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێستا ماعیز لە روبارەکانی بەهەشت خۆ هەڵ دەکێشێ). {أبو داود، رقم: ٤٤٢٨} . {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٧، چ/٤} .

## ٨١٧) پێلێنەر چوارجار پێلێنان لەداوێنپیسی دووبارە دەکاتەوە، چاڵێ بۆ بەردەبارانکراو هەڵ دەکەنرێ ژنی دووگیان دوادەخرێ تا مناڵەکەی دادەنێ، بەردەبارانکراو نوێژ لەسەر تەرمەکەی دەکرێ. (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦)

## باب: تَرْدِيدُ الْمُقِرِّ بِالزِّنَا أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، وَالْحَفْرُ لِلْمَرْجُومِ، وَتَأْخِيرُ الْحَامِلِ حَتَّى تَضَعَ، وَالصَّلاَةُ عَلَى الْمَرْجُومِ

١٠٣٩- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ الأَسْلَمِيَّ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَزَنَيْتُ، وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ تُطَهِّرَنِي، فَرَدَّهُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ زَنَيْتُ، فَرَدَّهُ الثَّانِيَةَ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ: « أَتَعْلَمُونَ بِعَقْلِهِ بَأْسًا؟ تُنْكِرُونَ مِنْهُ شَيْئًا؟» فَقَالُوا: مَا نَعْلَمُهُ إِلاَّ وَفِيَّ الْعَقْلِ مِنْ صَالِحِينَا فِيمَا نُرَى، فَأَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمْ أَيْضًا، فَسَأَلَ عَنْهُ، فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِهِ وَلاَ بِعَقْلِهِ، فَلَمَّا كَانَ الرَّابِعَةَ، حَفَرَ لَهُ حُفْرَةً، ثُمَّ أَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ، قَالَ: فَجَاءَتِ الْغَامِدِيَّةُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ زَنَيْتُ فَطَهِّرْنِي، وَإِنَّهُ رَدَّهَا، فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ تَرُدُّنِي؟ لَعَلَّكَ أَنْ تَرُدَّنِي كَمَا رَدَدْتَ مَاعِزًا، فَوَاللَّهِ إِنِّي لَحُبْلَى، قَالَ: « إِمَّا لاَ، فَاذْهَبِي حَتَّى تَلِدِي ». قَالَ: فَلَمَّا وَلَدَتْ أَتَتْهُ بِالصَّبِيِّ فِي خِرْقَةٍ قَالَتْ: هَذَا قَدْ وَلَدْتُهُ، قَالَ: « اذْهَبِي فَأَرْضِعِيهِ حَتَّى تَفْطِمِيهِ »، فَلَمَّا فَطَمَتْهُ أَتَتْهُ بِالصَّبِيِّ فِي يَدِهِ كِسْرَةُ خُبْزٍ، فَقَالَتْ: هَذَا يَا نَبِيَّ اللَّهِ قَدْ فَطَمْتُهُ، وَقَدْ أَكَلَ الطَّعَامَ، فَدَفَعَ الصَّبِيَّ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَحُفِرَ لَهَا إِلَى صَدْرِهَا، وَأَمَرَ النَّاسَ فَرَجَمُوهَا، فَيُقْبِلُ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بِحَجَرٍ فَرَمَى رَأْسَهَا فَتَنَضَّحَ الدَّمُ عَلَى وَجْهِ خَالِدٍ، فَسَبَّهَا، فَسَمِعَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَبَّهُ إِيَّاهَا، فَقَالَ: « مَهْلاً يَا خَالِدُ! فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا صَاحِبُ مَكْسٍ لَغُفِرَ لَهُ »، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا، وَدُفِنَتْ. {الحديث: ٤٤٠٧ = ٤٣٩٩ فم} :

بورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر ستەمم لەخودی خۆم کردووە، داوێنپیسیم کردووە، دەمەوێ کەتۆ پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەر ئەو جارە ڕەتیکردەوە، جا بۆ سبەینێ هاتەوە خزمەتی، گوتیەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، پاکم بکەرەوە، بۆ جاری دووەم پێغەمبەر ڕەتیکردەوە، وەڵامی نارد بۆ هۆزەکەی فەرمووی: (ئایا کەموکوڕی لە هۆشیدادەبینن؟ نەنگێکی تیادا گومان دەبەن؟). گوتیان: ئەوەی ئێمە ئاگامان لێیەتی هۆشی تەواوە، بەپێی بۆچوونی ئێمە لە پیاو باشانی ئێمەیە، جا بۆجاری سێیەم هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دیسان پێغەمبەر ناردیەوە بۆلای هۆزەکەی، پرسیاری لەبارەی ماعیزەوە لێ کردنەوە، دیسان گوتیانەوە: هیچ گومان نابەین، نە لەخۆیا، نە لەئەقڵیدا، جا بۆ جاری چوارەم کە هاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە بەردەباران بکرێ، چاڵێکی بۆ هەڵکەنرا، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانیکرد بەردەبارانیان کرد.

فەرمووی: ژنێکیش لەهۆزی غامید هات، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، بە جێبەجێ کردنی حەددی شەرعی پاکم بکەرەوە، پێغەمبەریش گەڕاندیەوەو حەددی بەسەردا جێبەجێ نەکرد، جا بۆ سبەینێ ژنەکە هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی دەمگەڕێنیتەوە؟ ڕەنگ بێ وەك چۆن ماعیزت گەڕاندەوە، منیش بگەڕێنیتەوە، دەی سوێندم بەخودا، سکم پڕە لەداوێنپیسی.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی کەهەر وازناهێنیتو ناتەوێ نهێنی خۆت بپۆشیت، دە ئێستا بڕۆ هەتا منداڵەکەت دەبێ). فەرمووی: جا کەژنەکە منداڵەکەی بوو، لە پارچەیێ پەڕۆدا منداڵەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو گوتی: ئەمە منداڵەکەمە کە بوومە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دە ئێستە بڕۆ، شیری پێ بدە، هەتا لەشیر دەیبڕیتەوە). جاکاتێ ژنەکە منداڵەکەی گەورەکرد، هەتا لەشیر

برِييەوە، منالّەكەی هێناوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەتێ نانی بەدەستەوە بوو دەیخوارد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە منالّەكەمە، ئەوەتا بڕیومەتەوە لەمەمك‌و ئەوەتا نان‌و ئاو دەخوا، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) منالّەكەی دایە دەست پیاوێ لە موسوڵمانان، كە سەرپەرشتی بكا، ئەوجا فەرمانی كرد: چاڵێكیان بۆ ژنەكە هەڵكەند، قووڵییەكەی هەتا سەر سینگی بوو، وە فەرمانی كرد بەخەڵكەكە بەردە بارانیان كرد، لەوكاتەدا خالیدی كوڕی وەلید بەردێكی هێنا كێشای بەسەری ژنەكەدا، خوێنەكە فیچقەی كرد، چوو بەدەموچاوی خالیدا، لەسەر ئەوە خالید جمێنی بەژنەكە دا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جمێنەكەی خالیدی بیست، كەدای بەژنەكە، فەرمووی: (هێواش! ئەی خالید! بەو كەسە كەگیانی منی بەدەسە، ئەم ژنە تەوبەیەكی جوانی وەهایكرد، ئەگەر باجگرو گومرگ خۆریش تەوبەی واجوان بكەن خودا لێیان خۆش دەبێ‌و تەوبەكەیان قەبووڵ دەكا).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو، تەرمی ژنەكەیان ئامادەكرد، وەك شۆردن‌و كفن كردن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەكەی كرد، ئەوجا لە گۆڕستانی موسوڵمانان تەرمەكەیان ناشت. {تاج/ ٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١}.

### ٨١٨) ئەگەر خاوەن نامەكان، خاوەن پەیمان بوون (واتە: ئەهلی ذیمە بوون) لەسەر داوێنپیسی سەنگەسار دەكرێن
### بابٌ: رَجْمُ الیهُودِ أَهْلِ الذِّمَّةِ فی الزِّنَا

١٠٤٠- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أُتِىَ بِيَهُودِىّ وَيَهُودِيَّةٍ قَدْ زَنَيَا، فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى جَاءَ يَهُودَ، فَقَالَ: «مَا تَجِدُونَ فِى التَّوْرَاةِ عَلَى مَنْ زَنَى»؟ قَالُوا: نُسَوِّدُ وُجُوهَهُمَا وَنُحَمِّلُهُمَا، وَنُخَالِفُ بَيْنَ وُجُوهِهِمَا، وَيُطَافُ بِهِمَا، قَالَ: «فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ»، فَجَاءُوا بِهَا فَقَرَءُوهَا، حَتَّى إِذَا مَرُّوا بِآيَةِ الرَّجْمِ، وَضَعَ الْفَتَى الَّذِى يَقْرَأُ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ وَقَرَأَ مَا بَيْنَ يَدَيْهَا، وَمَا وَرَاءَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ وَهْوَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): مُرْهُ فَلْيَرْفَعْ يَدَهُ، فَرَفَعَهَا فَإِذَا تَحْتَهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله

عليه وسلم)، فَرُجِمَا، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُمَا، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَقِيهَا مِنَ الْحِجَارَةِ بِنَفْسِهِ. {الحديث: ٤٤١٢ = ٤٤٠٤ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٤٦ = ٣٦٣٥، ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣ + تجريد رقم: ١٣٣٧ = ٣٣٢٩ فتح الباري}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکەو ژنێکی جوولەکە شەڕواڵ پیسییان کردبوو، هێنایانن بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆلای جوولەکەکان فەرمووی: (ئەگەر کەسێ داوێنپیسی بکا، بەپێی تەورات ئێوە چی لێ دەکەن؟).

گوتیان: ڕووی هەردوولایان ڕەش دەکەینو بەروپشت سواری دوو وڵاخیان دەکەینو دەیانگێڕین بەناو دێدا، تابن بە پەندی پساتێو ریسوابن. فەرمووی: (ئەگەر ڕاست دەکەن تەوراتەکە بهێنن). جا تەوراتەکەیان هێناو دەستیان کرد بەخوێندنەوەی، هەتا گەیشتنە سەر ئایەتی رەجم کردن، ئەو لاوەی کە دەیخوێندەوە ئەو ئایەتەی کرد بەژێر دەستییەوەو پەڕاندیو نەیخوێندەوە، بەڵکوو ئایەتەکانی پێشو پاشی ئەم ئایەتەی خوێندەوە. عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، کە زانایەکی گەورەی جوولەکە بوو، ئیسلام بوو بوو، کە ئەوکاتە لەخزمەتی پێغەمبەردا بوو، ئەم عەبدوڵڵایە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێی بفەرموو، کە دەستی هەڵبڕێ، جا کەدەستی هەڵبڕی ئایەتەکە لەژێر دەستیابوو. ئینجا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو، ژنو پیاوەکەیان سەنگەسار کرد، ئیبنو عومەر دەفەرموێ: من خۆم یەکێك بووم لەوکەسانە کە بەردەبارانیان کردن، تەماشام کرد: کە پیاوەکە خۆی دەدایە بەر بەردەکان، تا بەر ژنەکە نەکەون! {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٨ چ/٤ — ش/د/ت/ن}.

## ٨١٩) داری حەدد دەدرێ لە کەنیزەك (ژنی کۆیلە) ئەگەر داوێنپیسی بکا
## بابٌ: جَلْدُ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ

١٠٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سُئِلَ عَنِ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ وَلَمْ تُحْصِنْ؟ قَالَ: « إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: لاَ أَدْرِي أَبَعْدَ الثَّالِثَةِ أَوِ

الرَّابِعَة. {الحديث: ٤٤٢٢ = ٤٤١٤ فم. تجريد/٢، رقم: ٩٧٣ = ٢١٥٢، ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەبارەی کەنیزەکەوە، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: ئەمەتە، ئەگەر داوێنپیسی کردو لەسەری چەسپاو لەهەمان کاتا موحصەن نەبوو، واتە: نەدرابوو بەشوو، ئایا لەکاتی وادا حەددی شەرعی لەسەرە یانا؟ فەرمووی: (ئەگەر کەنیزەك داوێنپیسی کرد، داری حەددی لێدەن، ئەگەر دووبارە داوێنپیسی کردەوە، دووبارە داری حەددی لێدەن، ئەگەر بۆجاری سێیەم داوێنپیسی کردەوە دیسانەوە داری حەددی لێ بدەن، ئیتر ئەگەر تالآن فرۆشی کردووەو فرۆشتوویەتی بەپەتێکی موو بیفرۆشێ!).

ئیبنو شەهاب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نازانم لەپاش جاری سێیەم بیفرۆشێ، یا لەپاش جاری چوارەم. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٩، ٢٣٦٠ ج/٤ — ش/د/ت/ن}.

## ٨٢٠) ئاغای کۆیلە داری حەدد ئەدا لەکۆیلەی خۆی
## باب: إِقَامَةُ السَّيِّدِ الحَدَّ عَلَى رَقِيقِهِ

١٠٤٢- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَ عَلِيٌّ كرم اللّه وجهه فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَقِيمُوا عَلَى أَرِقَّائِكُمُ الْحَدَّ، مَنْ أَحْصَنَ مِنْهُمْ، وَمَنْ لَمْ يُحْصِنْ، فَإِنَّ أَمَةً لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) زَنَتْ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَجْلِدَهَا، فَإِذَا هِيَ حَدِيثُ عَهْدٍ بِنِفَاسٍ فَخَشِيتُ إِنْ أَنَا جَلَدْتُهَا أَنْ أَقْتُلَهَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: « أَحْسَنْتَ ». وزاد في رواية: (اتْرُكْهَا حتى تَماثَل). {الحديث: ٤٤٢٥، ٤٤٢٦ = ٤٤١٧، ٤٤١٨ فم = ف.م = فتح الملهم}:

ئەبو عەبدوڕەحمانی سەلەمی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) وتارێکی دا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! داری حەدد بدەن لەبەندەو کەنیزەکەکانتان، چ ژنو پیاوبن، چ کوڕو کچ بن، واتە: چ ژیانی هاوسەرێتییان دیبێ، وە چ نەیان دیبێ، چونکە جارێکیان کەنیزەکێکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)

داوێنپیسی کردبوو، حەزرەت فەرمانی کرد بەمن کە داری حەددی لێ بدەم، کەڕوانیم واتازە منالّی بووەو هێشتا زەیستانە، ترسم هەبوو: ئەگەر داری حەددی لێ بدەم لەوانەیە کە لەژێر داری حەددەکەدا بیکوژم، لەبەرئەوە جێبەجێ کردنی حەددەکەم دواخست، جا کەئەمەم عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: (ئافەریم چاکت کرد!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦٠}.

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٤٤٢٦)دا: فەرمووی: (باشت کردووە، وازی لێ بهێنە تا چاك دەبێتەوە).

### ٨٢١) سزای دزیی و ئەو ئەندامەیە لەماڵی دزراو، کەدەبێ بەهۆی بڕینی دەستی دز. (٤٣٧٤ - ٤٣٨٥). حَدّ السَّرِقَةِ

### بابٌ: مَا يَجِبُ فِيهِ الْقَطْعُ

١٠٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلاَّ فِى رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا ». {الحديث: ٤٣٧٨ = ٤٣٦٨ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٦٩ = ٦٧٨٩، ٦٧٩٠، ٦٧٩١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دەستی دز بەپێی شەرع، کاتێ دەبڕێ کە بایی چارەکێ دیناری زێڕ بدزێ، یا بایی زیاتر بدزێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٣، ج/٤}.

### ٨٢٢) دەستی دز دەبڕێ لەسەر شتێ کەبایی سێ درەم بێ

### بابٌ: الْقَطْعُ فِيمَا قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ

١٠٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَطَعَ سَارِقًا فِى مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ. {الحديث: ٤٣٨٢ = ٤٣٧٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧١ = ٦٧٩٥، ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینیی قەڵغانێ کەبایی سێ درەم بوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٤، ج/٤}.

## ٨٢٣) لەسەر هێلکەیێ دەست دەبڕێ
## باب: القطع فِي البَيْضَة

١٠٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ». {الحديث: ٤٣٨٤ = ٤٣٧٦ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٦٨ = ٦٧٨٣ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرەتو لەعنەتی خودا لەدز، کە ئەوەندە نەفسی سووکە، لەسەر دزینی هێلکەیێ، یا بەهۆی دزینی گوریسێکەوە، بەپێی شەرع، دەستی دەبڕن). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٢، چ/٤}.

## ٨٢٤) جڵەوگیری لەتکاکردن بۆ جێبەجێ کردنی حەددێکی شەرعی(٤٣٨٦ - ٤٣٨٨)
## بابٌ: النَّهْىُ عَنِ الشَّفَاعَةِ فِي الحُدُود

١٠٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَكَلَّمَهُ فِيهَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ »؟ فَقَالَ لَهُ أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَاخْتَطَبَ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَإِنِّي وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا »، ثُمَّ أَمَرَ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقُطِعَتْ يَدُهَا، قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): فَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا بَعْدُ، وَتَزَوَّجَتْ، وَكَانَتْ تَأْتِينِي بَعْدَ ذَلِكَ فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٣٨٧ = ٤٣٧٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٧٠ = ٣٧٣٣، ٢٦٤٨، ٣٤٧٥، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠}:

**عائیشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **کەهاوسەری پێغەمبەرە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ژنێکی مەخزوومی دزیی کردبوو، قوڕەیش زۆر بەتەنگیەوە بوون، ئەمەیش لەسەردەمی پێغەمبەردا بوو، لەکاتی غەزای ئازادکردنی مەککەدا بوو، گوتیان: بەکێ بڵێین کە لەبارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا قسە بکا؟ گوتیان: کێ پڕکێشی ئەوە دەکا لە ئوسامەی کوڕی زەید بەولاوە، کە خۆشەویستی پێغەمبەرە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **جا کەژنەکەیان برد بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئوسامە لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕەنگی گۆڕاو فەرمووی: (چۆن هەڵەی وادەکەی، تکا دەکەی بۆ جێبەجێ نەکردنی حەددێ لە حەددە شەرعییەکان، کە خودای گەورە خۆی داینـاوە؟) جا ئوسامە لە هەڵەکەی خۆی پەشیمان بۆوەو عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوونم لەخودا بۆ بکە، کەلەم هەڵەیە لێم خۆش بێ!**

**جا سەر لەئێوارێ، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەڵسایەوە وتارێکی دا، لەپێشا سوپاسو ستایشێکی جوانی خودای کرد، بەشێوەیە کەهەر شایانی ئەوبێ، ئەوجا فەرمووی: (پاش سوپاسو ستایشی خودای گەورە، ئەی خەڵکینە! دەزانن کە بۆچی نەتەوەکانی پێش ئێوە لەناو چوون؟ چونکە کاتێ کەسێکی خانەدان لەناویانا دزی بکردایە، وازیان لێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر لازەبوونو بێ نەواکانیان دزییان بکردایە حەددیان لێ دەدان، جوولەکەکان وابوون، حەددیان لەئاغاو بەگەکانیان نەدەدا، بەڵام هەژارێکیان دزی بکردایە دەستیان دەبڕی. جا سوێندم بەیەزدانی پاك من ناهەقی وا قەبووڵ ناکەم، گریمان فاطیمەی کچی موحەممەدیش، کەکچی خۆمە، دزی بکا، بەپێی یاسا نامەی خودا، دەستی دەبڕم!**

**عائیشە فەرمووی: ئینجا فەرمانی کرد دەستی ژنەکەیان بڕی، لەوەدوا، تەوبەیەکی جوانی کرد، وە شووی کرد، وەگەڵێ جار دەهات بۆلای منو هاموشۆی دەکردم، جا ئەگەر کارێ، داخوازییەکی ببوایە، بەمنی دەگوت، منیش عەرزی حەزرەتم دەکرد، ئەویش داخوازییەکەیی جێبەجێ دەکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٨، چ/٤ — ش/د/ت/ن}.**

## ٨٢٥) سزای مەینۆشیی - ژمارەی جەڵدی حەددی ئارەقخواردنەوە چەندە
## حَدُّ الخَمرِ - بابٌ: كَمْ يُجْلَدُ فِي شُرْبِ الخَمْرِ

١٠٤٧- عَنِ حُضَيْنُ بْنُ الْمُنْذِرِ أَبِي سَاسَانَ قَالَ: شَهِدْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَأُتِيَ بِالْوَلِيدِ قَدْ صَلَّى الصُّبْحَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: أَزِيدُكُمْ؟ فَشَهِدَ عَلَيْهِ رَجُلَانِ، أَحَدُهُمَا حُمْرَانُ أَنَّهُ شَرِبَ الْخَمْرَ، وَشَهِدَ آخَرُ أَنَّهُ رَآهُ يَتَقَيَّأُ، فَقَالَ عُثْمَانُ: إِنَّهُ لَمْ يَتَقَيَّأْ حَتَّى شَرِبَهَا، فَقَالَ: يَا عَلِيُّ قُمْ فَاجْلِدْهُ، فَقَالَ عَلِيٌّ: قُمْ يَا حَسَنُ فَاجْلِدْهُ، فَقَالَ الْحَسَنُ: وَلِّ حَارَّهَا مَنْ تَوَلَّى قَارَّهَا، فَكَأَنَّهُ وَجَدَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جَعْفَرٍ قُمْ فَاجْلِدْهُ، فَجَلَدَهُ، وَعَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَعُدُّ، حَتَّى بَلَغَ أَرْبَعِينَ، فَقَالَ: أَمْسِكْ، ثُمَّ قَالَ: جَلَدَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَرْبَعِينَ، وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ، وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ. {الحديث: ٤٤٣٢ = ٤٤٢٣ فم. أبو داود. حدود: ٤٤٨٠. تحفة الأشراف: ١٠٠٨٠}:

ئەبو ساسان، کەناوی حوصەینی کوڕی مونزیر بوو فەرمووی: لەخزمەتی عوسماندا بووم، کاتێ وەلیدی دایك برای عوسمانیان بۆ دادگایی هێنا بۆلای، بەسەرخۆشی بەرنوێژیی نوێژی بەیانی کردبوو، کە دوو رکاتەکە دەکا دەڵێ: ئایا دەتانەوێ کە زیادیی بکەم بۆتان؟ دوو پیاویش شایەتییان لێدا، یەکێکیان کە حومرانی کوڕی ئەوبان بوو، کە ئازادکراوی حەزرەتی عوسمان بوو، فەرمووی: ئارەقی خواردبۆوە، ئەوی تریشیان گوتی: منیش دیم کە دەڕشایەوە، عوسمانی برایشی فەرمووی: بۆیە رشاوەتەوە چونکە خواردوویەتیەوە: تا نەخواتەوە ناڕشێتەوە! ئینجا عوسمان فەرمووی: ئەی عەلی! هەڵسە دارکاریی بکە (واتە: جەڵدەی ئارەق خواردنەوەی لێ بدە) عەلیش بەحەسەنی کوڕی فەرموو: ئەی حەسەن! هەڵسە دارکاریی بکە، حەسەن فەرمووی: کێ خۆشییەکەی دەنۆشێ، باهەر ئەویش تاڵییەکەی بچێژێ! وەك بڵێی حەسەن لەدڵەوە حەزی لە وەلید نەبێو رقی لێ گرتبێ، لەبەر ئەم خووە پیسەی. جا عەلی فەرمووی بە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر! ئادەی تۆ هەڵسە دارکاریی بکە. جائەو دارەکانی لێ دەداو عەلی دەیژماردن، هەتا بوون بەچل دار، عەلەی فەرمووی: ئیتر

بەسە، ئینجا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی چل داری لێ دەدا، ئەبوبەکریش هەروەها، بەڵام عومەر هەشتا داری لێ دەدا، ئەمانە هەموویان هەر سوننەتن‌و ڕێگەی شەرعن، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم چلەکەم پێ باشترە، لەبەرئەوە کە ئەمەیان سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٢٣٧٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- وەلیدی کوڕی عوقبە خۆی‌و عومارەی برای لەرۆژی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بوون، پێغەمبەر کردی بەسەرکاری سەر زەکاتی هۆزی بەنی موستەلیق، عوقبەی باوکی لە غەزای بەدردا کوژرا، یەکێبوو لەسەرکردەی ناموسوڵمانەکان، لەپاش کوشتنی باوکی، وەلید لەپەنای عوسمانی دایك برایدا گەورە بوو، وەلید شاعیر بوو، ئازابوو زۆر سەخی بوو.

١٠٤٨- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا كُنْتُ أُقِيمُ عَلَى أَحَدٍ حَدًّا فَيَمُوتَ فِيهِ فَأَجِدَ مِنْهُ فِي نَفْسِي إِلاَّ صَاحِبَ الْخَمْرِ، لأَنَّهُ إِنْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، لأَنَّ النبي (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَسُنَّهُ. {الحديث: ٤٤٣٣ = ٤٤٢٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٦٦ = ٦٧٧٨ فتح الباري}:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: داری حەدد لە هەرکەسێ بدەم، لەو کەسانەی کەداری حەددیان بەپێی شەرع لێ دەدرێ، وەك بوختیانکەرو داوێنپیس، ئەگەر بەو داری حەددەی منە بشمرێ دەربەستی نیم‌و خەم‌و خەفەتی پێ ناخۆم، چونکە ئەو جۆرە حەددانە، پێغەمبەر خۆی دیاریکردوون‌و دایناون، بەڵام ئەگەر گریمان داری حەددی مەینۆشی لەکەسێ بدەم‌و بەوداری حەددەی منە بمرێ، ئەوە پەستم دەکا، وە خوێنی ئەو کابرایەیش دەدەم کە لەکاتی وادا بمرێ، لەژێر داری حەددی مەینۆشیدا، چونکە حەددی مەینۆشی پێغەمبەر نەدیاریکردووەو نەدایناوە! لەسەر ئەم شێوەی ئێستا، کە هەشتا داری لێ دەدرێ). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٢٣٧٤}.

## ٨٢٦) ژمارەی دار لێدانی تەمێکردن. (٤٤٣٥)
## بَابٌ: جَلْدُ التَّعْزِيرِ

١٠٤٩- عَنْ أَبِى بُرْدَةَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يُجْلَدُ أَحَدٌ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ، إِلاَّ فِى حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ». {الحديث: ٤٤٣٥ = ٤٤٢٦ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧٢ = ٦٨٤٩، ٦٨٥٠. أبو داود. حدود: ٤٤٩١. ترمذى. حدود: ١٤٦٣. ابن ماجة. حدود: ٢٦٠١. تحفة الأشراف: ١١٧٢٠}:

**ئەبو بەردە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (مەگەر بۆ حەددی شەرعی، ئەگینا لەسەر هیچ سەرپێچییەکی تر، لەدەدار (جەڵدە) زیاتر لەکەس نادرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٢٣٧٧، ج/٤}.**

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو بوردەی ئەنصاری، ناوی هانی کوڕی نیارە، خاڵی بەرائی کوڕی عازیبە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەکانی پاش بەدر بووە، هەروا ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە، فەرموودەی لە بوخاری‌و موسلیمدا هەیە، لە بوخاریدا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە، ئەبو بوردە بێ وەچە بووە، مناڵ‌و مناڵە زای لەپاش بەجێ نەماوە.

لایەنگیری عەلی بوو لەهەموو نەبەردەکانیدا، دەڵێن: لە دەوروبەری ساڵی چل‌و یەك، یادوو، یا پێنج مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

## ٨٢٧)کەسێ شایانی حەددێ بێ لەحەددە شەرعییەکان، وە ئەو حەددەی بەسەردا جێبەجێ کرا، ئیتر ئەوە دەبێ بەکەفارەتی ئەو گوناهە بۆی(٤٤٣٦ - ٤٤٣٩)
## باب: مَنْ أَصَابَ حَدّاً فَعُوقِبَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ

١٠٥٠- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَمَا أَخَذَ عَلَى النِّسَاءِ أَنْ لاَ نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ نَسْرِقَ، وَلاَ نَزْنِىَ، وَلاَ نَقْتُلَ أَوْلاَدَنَا، وَلاَ يَعْضَهَ بَعْضُنَا بَعْضًا، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَتَى مِنْكُمْ حَدًّا فَأُقِيمَ عَلَيْهِ فَهُوَ كَفَّارَتُهُ، وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ

غَفَرَ لَهُ ». {الحديث: ٤٤٣٦ = ٤٤٢٩ فم. تجريد/١، رقم: ١٨ = ١٨، ٣٨٩٢، ٣٨٩٣، ٣٩٩٩، ٤٨٩٤، ٦٧٨٤، ٦٨٠١، ٦٨٧٢، ٧٠٥٥، ٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨. ترمـــــذى. حدود: ١٤٣٩، نسائى. بيعة: ٤١٧٢، ٤١٧٣، ٤١٨٩، ٤٢٢١، ٥٠١٧}:

**عوبادەی کوڕی صامیت** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ لە کۆڕێکا، دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر، لەخزمەتیدا بووین، ئایەتی دوازدەهەم لەسوورەتی مومتەحینەی بۆمان خوێندەوە، کەباسی پەیمان وەرگرتن لەژنانی واتیادا، کە دەفەرموێ:**

**{ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ — سوورەتی ژمارە/٦٠ ئایەتی ژمارە/١٢ لەسوورەتی مومتەحینە}:**

واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات، کە پەیمانو بەیعەتت پێ بدەن، لەسەرئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بەهیچ جۆرێ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدەنو دزی نەکەنو حیزی نەکەنو منداڵی خۆیان نەکوژنو کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەنو بوختانی درۆ لەنێوان دەستو پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن، لەبەینی دەستو پێی خۆیان دایبنێنو بەدرۆو بەناهەق بیکەن بەمناڵی مێردەکانیان، وە لەکردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەم پەیمانە، لەخودا بپاڕێرەوە بۆیان کە لێیان خۆش بێ، بەڕاستی خودا تاوانبەخشو میهرەبانە).

وەبەپێی ئەم ئایەتی پەیمانی ژنانە، پەیمانی لەئێمەیش وەرگرت کە: هاوبەش (شەریك) بۆ خودا دانەنێنو دزیو حیزی نەکەینو، دەست پاكو داوێن پاك بینو، منداڵی خۆمان لەبەر نەبوونی نەکوژینو، لەخۆمانەوە بەخوتو خۆڕایی بوختانو شەڵتاخ بۆ یەکتری هەڵ نەبەستین، وە لەکردنی چاکەو کاری خێر درێغیو سەرپێچی نەکەین) ئەوجا فەرمووی پێمان:

(جا هەركەسێ لەئێوە هەتا سەر ئەم پەیمانەی بردە سەر، ئەوە پاداشی باشی دەكەوێتە سەر خودا، وە ئەگەر كەسێكتان تووشی شتێ لەمانە بوو، یاتووشی هەر تاوانێكی تربوو، كەشایانی ئەوەبێ كە حەددی یاسایی، بەپێی یاسا نامەی خودا لێ بدرێ، وە ئەو حەددەی لێ درا، وەیا تۆڵەی ئەو تاوانەی بەپێی شەرع لێ سەندرا، ئەوە دەبێ بەكەفارەت بۆیو ئەو تۆڵە لێ سەندنە بریتی تاوانەكەی دەكەوێو پاكی دەكاتەوە، وە ئەوەی تووشی شتێ بوو لەمانەو لە غەیری ئەمانە، بەلاّم لەم جیهانەدا خودا بۆی پۆشی، ئەوە كاری دەكەوێتە دەست خودا، جا ئەگەر خودا حەزبكا، لەودنیادا تۆڵەی ئەوەی لێ دەستێنێ، یا بەمیهرەبانی خۆی لێی خۆش دەبێ). {تاج/١، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٥ + ژمارە: ٦٠ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٢٤٠٠، ج/٤}.

بۆئەوەی كەباش لەحاڵەكە حاڵی ببین، كەچۆن چۆنی ژنان منالّی بێگانە دەكەن بە منالّی مێردەكەیان، تەماشای تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: (٥٨)، ژمارە: (٢٢٠٥) بفەرموون، كە لەم فەرمووده پیرۆزەی بوخاریدا، چەند جۆرێ لەم بابەتە دیاری كراون، وەك جۆری خۆچاك كردن لەپیاوی خانەدان بەنیازی منالّی خانەدانو وەك جۆری فرە مێردی. هەروەها بڕوانە: تەجریدی بوخاری، ناسراو بە موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەرگی/٤، لاپەڕە/٨٣، ژمارە: ١٣٩٥ = ٣٥٠٨ فتح الباری هەتا ژمارە: ١٣٩٦.



# ٢٨- نامەی دادوەریو شایەتیدان

## كِتَابُ الْقَضَاءِ وَالشَّهَادَاتِ

{بڕوانە: ریاض. زنجیرە: ٨٢، ٨٣، ژمارە: ٦٧٨، ٦٧٩، ٦٨٠ + تەجرید/٣، ژمارە: ١١١٨ هەتا ژمارە: ١١٢٥ + تاج/٣ لە زنجیرە: ١٠٢ هەتا زنجیرە: ١٢١ لە ژمارە: ٢٤٠١ هەتا ٢٤٩٦ + فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٨٧، ٣٨٨، ٣٨٩، ٣٩٠، ٣٩١، لە لاپەڕە: ١٠٣٥ هەتا لاپەڕە: ١٠٤٨ چاپی ئێران + زنجیرە: ٤٠١ هەتا زنجیرە: ٤٠٦ = لاپەڕە: ١٠٧٤}.

### ٨٢٨) بڕیاری شەرع بەپێی رووكارە (حوكم بەپێی زاهیرە) هەندێ كەسیش لە بەڵگە سازیدا بەدەمو پلترە. (٤٤٤٨ - ٤٤٥١)

### بَابٌ: الْحُكْمُ بِالظَّاهِرِ وَاللَّحْنُ بِالْحُجَّةِ

١٠٥١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَمِعَ جَلَبَةَ خَصْمٍ بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: « إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَهُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ، فَأَقْضِي لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ، فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا ». {الحديث: ٤٤٥٠ = ٤٤٤٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٦٧ = ٢٤٥٨، ٢٦٨٠، ٢٩٦٧، ٢١٦٩، ٧١٨١، ٢١٨٧}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرەكانی بێ) فەرمووی: دوو پیاو هاتنە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێ كەلەپووریان هەبوو، لەسەری بوو بوو بەناكۆكیان، لەبەردەرگای هۆدەكەی پێغەمبەرا بوو بەدەمەقاڵێیان، كەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داوای رووت نەبێ، كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لەقرە قرِیان بوو، چووە دەرەوە بۆلایان، كاتێ لە مەسەلەكە حاڵی بوو، فەرمووی: (منیش هەر ئادەمیزادمو، وەك ئێوە غەیبزان نیم، لەبەرئەوە بەپێی رووكاری كارەكە بڕیار دەدەم، جاوادەبێ كەدوو هاوداوا دێن بۆلای من، بۆ دادگایی، وادەبێ یەكێكیان لەوی تریان بە دەموپلترەو

قسـه زانـتره، منـیش وادەزانم کەڕاسـت دەکـا، وەلـەم ڕووەوە بڕیـاری بـۆ دەدەمو بەظاهیر داواکە دەباتەوە، دەی بزانن: هەرکەسێ لەسـەر قسـەی نـاڕەوای خـۆی مـن شتێ بڕیاربدەم بۆی، بەوە نابێ بەهی ئەو، کەواتە باوەری نـەگرێ، چـونکە شـتی وا بەو بڕیاردانەی منە، کە لەسەر شایەتیو بەلگەو قسەی نـاڕەوای خـۆی بـووە، نابـێ بەهی خۆی، بەڵکوو ئەوە پارچەیێ ئـاگری رووتـە مـن بـڕی دەدەم بـۆی! ئـیتر پـاش ئەم روونکردنەوەیە ئارەزووی خۆیەتی ئەو پارچە ئاگرەیـە هەڵدەگرێ، یـا وازی لێ دێنێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٣، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٢٤٩١}.

**٨٢٩) باسی رق ئەستوورو شەڕانی.** (٦٧١٧ - ٦٧٢٥)

**باب: فی الألَدّ الخَصِمِ**

١٠٥٢- عَـنْ عَائِشَـةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُـا) قَالَـتْ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الأَلَدُّ الْخَصِـمُ ». {الحـديث: ٦٧٢٢ = ، تجريـد/٣، رقـم: ١٠٦٦ = ٢٤٥٧، ٤٥٢٣، ٧١٨٨. ترمـذى. تفسـير: ٢٩٧٦. نسـائى. آداب القُضَـاةِ: ٥٤٣٨. تحفة الأشراف/١٦٢٤٨}:

حـەزرەتی عائیشـە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە، لەهەموو کەسێ زیاتر، رقی لەپیاوی شەڕانی شەڕ فرۆشی رق ئەستووری ڕەزا قورسو ڕەزا گرانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٢٤٩٤، چ/٤}.

**٨٣٠) بەڵگەو نیشانە لەسەر داواکارە، داوا لێکراویش، ئەگەر نەچووە ژێری، ئەوا سوێندی لەسەرە.** (٤٤٤٥ - ٤٤٤٦)

**باب: القَضاءُ باليَمِينِ علَى المدَّعی علَیْهِ**

١٠٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لاَدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَـى الْمُـدَّعَى عَلَيْـهِ ». {الحـديث: ٤٤٥٠ = ٤٤٤٠ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١٠٦٧ = ٢٤٥٨، ٢٦٨٠، ٢٩٦٧، ٢١٦٩، ٧١٨١، ٢١٨٧}. {الحـديث: ٤٤٤٥ = ٤٤٣٥ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٦٤٤ = ٤٥٥٢، ٢٥١٤، ٢٦٦٨ = فتح البارى + ١٠٨٢ تجريد/٣، لاپەڕە: ١٧٥ = ٢٥١٤ فتح البارى}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (ئەم خەڵکە ئەگەر بەقسەی رووتو بەداوای بێ بەڵگە، داوای هەرچی بکەنو بدرێ پێیان، ئەوا گەلێ کەس بەنارەوا، داوای سەروماڵو نامووسی زۆر کەسی تر دەکەن، وەوای لێ دێ دەبێ بە تێکەو لێکەو بگرەو بەردەو، سەرەنجام کەس لەسەرو ماڵو نامووسی خۆی دڵنیا نابێ، بۆئەوەی کەنەبێ بە پاشا گەردانی، بەڵگە لەسەر داواکارە، تەنیا بۆ لابردنی گومان، سوێند لەسەر داوالێکراوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٢٤٧٠، چ/٤}.

## ٨٣١) بڕیاردان بەپێی سوێندو شایەتیی شایەتێ. (٤٤٤٧)
## بابُ: القَضَاءُ بِاليَمِينِ وَالشَّاهِدِ

١٠٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ. {الحديث: ٤٤٤٧ = ٤٤٣٧ فم}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بڕیاری دەدا بۆئەو کەسە کەسوێند بخوا کەشتەکە هی ئەوەو لەهەمان کاتا شایەتێکیشی هەبێ کە شایەتی بۆبدا کە شتەکە هی ئەوە). ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوا کراوە بەکوردی: ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسوێندی داواکارو بەشایەتێ، بڕیاری بۆ داواکاردا — م/د/ت/ن). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٢٤٧٤، چ/٤}.

## ٨٣٢) لەکاتی تووڕەییدا، دادوەر نابێ کەسێ دادگایی بکا. (٤٤٦٥ - ٤٤٦٦)
## بابٌ: لاَ يَقْضِي القَاضِي وَهُوَ غَضْبَانُ

١٠٥٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبِي وَكَتَبْتُ لَهُ إِلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ وَهُوَ قَاضٍ بِسِجِسْتَانَ أَنْ لاَ تَحْكُمَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يَحْكُمْ أَحَدٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ ». {الحديث: ٤٤٦٥ = ٤٤٥٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٢١٠٩ = ٧١٥٨ فتح الباري}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرە، فەرمووی: عوبەیدوڵڵای برام لەسیجستان دادوەر (قازی) بوو، باوکم نامەیەکی بەمن نووسی بۆی‌و بۆینارد، بۆی نووسی: لەکاتی تووڕەییدا، دادگایی کەس مەکە، چونکە من خۆم بۆئەوە لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (دادوەر لەکاتی تووڕەییدا، دادگایی کەس نەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٢٤٦٧، چ/٤}.

## ٨٣٣) دادوەر کاتێ بڕیار دەدا ئەگەر بۆ دۆزینەوەی بڕیاری دروست تێکۆشێ، ئیتر بیپێکێ، یا هەڵەبکا، پاداشی بۆهەیە. (٤٤٦٢ - ٤٤٦٤)

## باب: إذا حكَمَ الحاكِمُ فاجْتَهَدَ فأَصابَ أوْ أخطأ

١٠٥٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يقول: « إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ ». {الحديث: ٤٤٦٢ = ٤٤٥١ فم. تجريد/٥، رقم: ٢١٢٣ = ٧٣٥٢ فتح الباري. أبو داود. أقضية: ٣٥٧٤}:

عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دادپرس (حاكم = قازی) ئەگەر لەکاتی بڕیاردانا، چاك تێکۆشی‌و باش وردبێتەوە بۆ گەیشتن بەهەق‌و بۆ پەیبردن بەرووی ڕاستیی پرسەکەو، ئەنجا بڕیارەکە دەرکا، ئەوە لەم کاتەدا ئەگەر بڕیارەکەی ڕاست بوو، ئەوە دوو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر لە بارودۆخی وادا بڕیارەکەی هەڵەبوو، ئەوە یەك پاداشی بۆ هەیە، چونکە ئەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵساوەو درێغی نەکردووە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٢، چ/٤}.

## ٨٣٤) ڕاجیایی تێکۆشەرانی شەرع لەبڕیاردا. (٤٤٧٠ - ٤٤٧١)

## بابٌ: إِخْتِلاَفُ الْمُجْتَهِدِينَ فِي الْحُكْمِ

١٠٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « بَيْنَمَا امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ، فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ هَذِهِ لِصَاحِبَتِهَا: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ أَنْتِ، وَقَالَتِ الأُخْرَى: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ، فَقَضَى بِهِ

لِلْكُبْرَى، فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ، فَأَخْبَرَتَاهُ، فَقَالَ: ائْتُونِى بِالسِّكِّينِ أَشُقُّهُ بَيْنَكُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لاَ، يَرْحَمُكَ اللَّهُ، هُوَ ابْنُهَا، فَقَضَى بِهِ لِلصُّغْرَى »، قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ إِنْ سَمِعْتُ بِالسِّكِّينِ قَطُّ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ، مَا كُنَّا نَقُولُ إِلاَّ الْمُدْيَةَ.
{الحديث: ٤٤٧٠ = ٤٤٥٩ فم، تجريد/٤، رقم: ١٣٦٤ = ٣٤٢٦، ٣٤٢٧، ٦٧٦٩، ٣٤٨٢} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ دووژن، دوو کوڕی خۆیان پێ دەبێ، گورگێ لەولاوە دێ، کوڕی ژنێکیان دەفرێنێ، ژنەکە بەهاوڕێکەی دەڵێ: گورگەکە کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەویش دەڵێ: نەء، کوڕەکەی تۆی بردووە، جابۆ دادگاییو سکاڵا دەچنە لای داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). داوودیش بڕیار دەدا: کە ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەورەکەبێ، جا کەدێنە دەرەوە دەگەن بە سولەیمانی کوڕی داوود (دروودی خودایان لەسەر بێ) وە باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئادەی چەقۆیەکم بۆ بێنن دەیکەم بەدوو لەتەوە بۆتان! جا ژنە بچکۆلەکە دەڵێ: نا، رەحمەتی خودات لێ بێ وای لێ مەکە، کوڕی ئەوە، ئەویش کەڕوانی ژنە بچکۆلەکە سکی بە منالەکە دەسووتێ، زانی کە منالی خۆیەتی، جا لەبەرئەوە دایەوە بەژنە بچکۆلەکە). ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا ئەو رۆژە نەبێ، ناوی چەقۆم نەبیستبوو، ئێمە جاران لە وڵاتی خۆمان هەردەمانگوت سیکاردو کێرد. {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨٠، ژمارە: ٢٧٠ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٦٩، ژمارە: ١٨٢٧/٢٠ - ٢٩١}.

## ٨٣٥) دادوەر ناوبژی لەنێوانی هاوداواکانا دەکا. (٤٤٧٢)
## باب: الحاكِمُ يُصْلِحُ بَيْنَ الخُصُومِ

١٠٥٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ، فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِى اشْتَرَى الْعَقَارَ فِى عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ، فَقَالَ لَهُ الَّذِى اشْتَرَى الْعَقَارَ: خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّى إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأَرْضَ، وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ، فَقَالَ الَّذِى شَرَى الأَرْضَ: إِنَّمَا بِعْتُكَ الأَرْضَ وَمَا فِيهَا، قَالَ: فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ الَّذِى تَحَاكَمَا إِلَيْهِ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لِى غُلاَمٌ، وَقَالَ الآخَرُ: لِى

جَارِيَةٌ، قَالَ: أَنْكِحُوا الْغُلاَمَ الْجَارِيَـةَ وَأَنْفِقُـوا عَلَـى أَنْفُسِـكُمَا مِنْـهُ وَتَصَـدَّقَا ». {الحـديث: ٤٤٧٢ = ٤٤٦١ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٨٤ = ٣٤٧٢} :

ئـەبو هـورەيـرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: (جـارێ پيـاوێ خانوويـەكی كـڕی لـەپياوێكی تـر، كڕيارەكـە كووپەڵـەيێ زێـڕی تيـا دۆزييەوە، جا بەفرۆشيارەكەی گوت: زێڕەكە هی تۆيە، لـێم وەرگـرەوە، چـونكە مـن تــەنيا زەوييەكـەم لـەتۆ كڕيـوە، خـۆ زێڕەكـەم لێ نـەكڕيوی، ئـەويش گـوتی: مـن زەوييەكە خۆیو هەرچی واتيادا، فرۆشـتوومە بـەتۆ، زێڕەكـە هـی خۆتـە مـن وەری ناگرمەوە. فەرمووی: جابۆ دادگاییو ناوبژيكردن چوون بۆلای پيـاوێو كـرديـان بـە فەرمانڕەواو ناوبژيوان (حەكەم = ناوبژيكەر).

پياوەكە گوتی: ئايا منالّتان هەيە؟ يـەكێكيان گـوتی: مـن كـوڕێكم هەيـە، ئـەوی تـريشيان گوتی: منيش كچێكم هەيە، ئەويش گوتی: كەواتە كچەكە لە كوڕەكە مـارە بكەنو زێڕەكەيش بۆ خۆتان خەرج بكەن بۆ مەسرەفی شايی، وەخێريشی لێ بكەن، ئيتر ئەوانيش وايان كرد). {تاج/٣، زنجيرە: ١٢١، ژمارە: ٢٤٩٣}.

## ٨٣٦) نموونەی باشترين شايەت. (٤٤٦٩)

## بابٌ: خَيْرُ الشُّهَدَاءِ

١٠٥٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِـيِّ: أَنَّ النَّبِـيَّ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَـالَ: « أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِى يَأْتِى بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا ». {الحديث: ٤٤٦٩ = ٤٤٥٨ فم. ترمذي. شهادات: ٢٢٩٥، ٢٢٩٦، ٢٢٩٧. أبو داود. أقضية: ٣٥٩٦} :

زەيدی كوڕی خاليدی ئەلجوهەنی (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەسا باپێتان بڵێم كە شايەتی بـاش كامەيـە؟ ئـەو شـايەتەيە كـە لەخۆيەوە بەبێ پێگوتنو رووڵێنان، ئەو شايەتيی خۆی بدا). {تـاج/٣، زنجيرە: ١١٦، ژمارە: ٢٤٧٥}.



# ٢٩- نامەی دۆزراوە - (كِتَابُ اللُّقْطَةِ)

{تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٥٥، ١٠٥٦ + فیقهی ئاسان، بەرگی/٢، لاپەڕە: ٥٤٦ چاپی یەکەم، زنجیرە: ٢٣٨، بەرگی/١، زنجیرە: ٢٤٠ چاپی ئێران} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٥٩ - ١٩٦٤}

## ٨٣٧) بڕیاری هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو. (٤٤٧٣ - ٤٤٨٥)
## بابٌ: الحُكم فِي اللُّقْطَة

١٠٦٠- عَنْ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ بن زيد الْجُهَنِيَّ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قال: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ اللُّقَطَةِ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ؟ فَقَالَ: « اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ لَمْ تعرِفْ، فَاسْتَنْفِقْهَا، وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ ». وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الإِبِلِ؟ فَقَالَ: « مَا لَكَ وَلَهَا؟ دَعْهَا، فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ الْمَاءَ، وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا »، وَسَأَلَهُ عَنِ الشَّاةِ؟ فَقَالَ: « خُذْهَا فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ ». {الحديث: ٤٤٧٧ = ٤٤٦٦ فم. تجريد/١، رقم: ٧٩ = ٩١، ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢}:

زەیدی کوڕی خالیدی ئەلجوهەنی، هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حوکم و بڕیاری زێڕو زیوی دۆزراوە چییە؟ فەرمووی: (پریاسکەو دەمبێنەکەی نیشانە بکە، وەتا ساڵێ جاڕی بۆ بدە، جا ئەگەر لەو ماوەدا خاوەنەکەی پەیدابوو ئەوا بیدەرەوە پێی، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی پەیدا نەبوو، ئەوسا خەرجی بکە، وە لەهەمان کاتدا، وایدابنێ کە سپاردە (وەدیعە)یە لەلات، هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە، دەبێ بیدەیتەوە پێی).

لێی پرسی: ئەی بڕیاری وشتری بزر چییە؟ فەرمووی: (تۆ دەخڵت چییە بەسەریەوە؟ تۆ دەخڵی مەکە، ئەو پێڵاوو کوندەی خۆی پێیە، بۆ خۆی ئاو دەخواتەوەو لەوەڕ دەخوا، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوەو دەیباتەوە.

وەلێی پرسی: ئەی بڕیاری بزنو مەڕی گومبوو چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بیبەرەوە، چونکە ئەگەر تۆ نەیبەیتەوەو خاوەنەکەی نەیدۆزێتەوەو برادەرێکی تر نەیباتەوە، دیارە کە گورگ دەیخوات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٦٠، ١٩٦١}.

## ٨٣٨) هەڵگرتنەوەی داکەوتووی حاجیان

١٠٦١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النبي (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ. {الحديث: ٤٤٨٤ = ٤٤٧٣ فم. أبو داود. لقطة: ١٧١٩}:

عەبدورەحمانی کوڕی عوسمانی تەیمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە هەڵگرتنی شتی داکەوتووی حاجی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ١٩٦٥}.

**روونکردنەوە:**

عەبدورەحمان برازای طەلحەیە، لە ئیسلامبوانی رۆژی ئازادکردنی مەککەیە، ئامادەی غەزای یەرمووك بووە، لەگەڵ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحدا، گێڕانەوەی لە موسلیمدا هەیە، بەلام لەبوخاریدا گێڕانەوەی نییە، هەندێ دەفەرموون لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی زوبەیردا لەیەك رۆژدا، لەساڵی حەفتاو سێی کۆچی لەمەککە کوژراوە، هەندێ تر دەفەرموون: لە ئەلحەرووره نێژراوە، کاتێ مزگەوتی حەرام گەورە کراوە، گۆڕەکەی کەوتۆتە ناو مزگەوتەکەوە.

## ٨٣٩) کەسێ گومبوویێ حەشاربدا. (٤٤٨٦ - ٤٤٨٧)

## بابٌ: مَنْ آوَى الضَّالَّةَ فَهُوَ ضَالٌّ

١٠٦٢- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « مَنْ آوَى ضَالَّةً فَهُوَ ضَالٌّ، مَا لَمْ يُعَرِّفْهَا ».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ گومبوویێ بدۆزێتەوەو حەشاری بداو بەپێی شەریعەت ناونیشانی هەڵنەدا، ئەوە خۆشی گومڕایەو ڕێگەی ڕاستی ون کردووە). {تاج/٢، زنجیره: ١٨٤، ژماره: ١٩٥٩، چ/٤}.

## ٨٤٠) نەیی کراوە لەدۆشینی ئاژەڵی خەڵکی بەبێ مۆڵەتی خاوەنی.

(٤٤٨٦ - ٤٤٨٧)

## باب: النهي عَنْ حلْبِ مَوَاشِي النَّاسِ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ

١٠٦٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ، فإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَتَهُمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ ». {الحديث: ٤٤٨٦ = ٤٤٧٥ فم. بخاري. لقطة: ٢٤٣٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەس ئاژەڵی کەس نەدۆشێ، مەگەر بەڕەزای خۆی، کامتان پێتان خۆشە کە ڕەفەکەتان بشکێنن‌و خواردنەکەتان ببەن، دیارە کەس ئەمەی پێ خۆش نیە، دە ئەو خەڵکەیش گوانی ئاژەڵەکانیان دۆڵابی خۆراکەکەیانە! کەواتە: کەس ئاژەڵی کەس نەدۆشێ، مەگەر بەخواستی خۆی). {تاج/٢، زنجیره: ١٨٤، ژماره: ١٩٦٣}.



# ٣٠- نامەی میوانداری - (كِتَابُ الضِّيَافَةِ)

## ٨٤١) کەسێ بەئەرکی میوانداریی هەڵ نەسێت
## بَابٌ: فِي حُكْمِ مَنْ مَنَعَ الضِّيَافَةَ

١٠٦٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تَبْعَثُنَا، فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلاَ يَقْرُونَنَا، فَمَا تَرَى؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ، فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ ». {الحديث: ٤٤٩١ = ٤٤٨٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٦٨ = ٢٤٦١، ٦١٣٧ فتح الباري}:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتمان کرد: قوربان! وادەبێ تۆ دەمان نێری بۆ کارو فرمانێ، جاری واهەیە دەچینە ناو گوندێك، میوانداریمان پێ ناکەن، جالەم بارەیەوە فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی پێمان: (کاتێ دەبن بەمیوانی خەڵك، ئەگەر ئەوەی کەباوە بۆ میوان دەکرێ بۆیانکردن ئەوا لێیان قەبووڵ بکەن، دەنا ئەگەر نەیانکرد خۆتان ئەوەی کەمافی میوانە لێیان بستێنن!).

## ٨٤٢) فەرمانکردن بەمیوانداریی. (٤٤٨٨ = ٤٤٩١)
## بَابٌ: الأَمْرُ بِالضِّيَافَةِ

١٠٦٥- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، وَجَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُقِيمَ عِنْدَ أَخِيهِ حَتَّى يُؤْثِمَهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَكَيْفَ يُؤْثِمُهُ؟ قَالَ: « يُقِيمُ عِنْدَهُ وَلاَ شَيْءَ لَهُ يَقْرِيهِ بِهِ ». {الحديث: ٤٤٨٩ = ٤٤٧٨ فم}:

ئەبو شورەیحی خوزاعی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (میوانداریی سێ ڕۆژە، خەڵاتەکەی شەوو ڕۆژێکە، دروست نییە بۆ موسوڵمان کەلەلای برای ئایینی خۆی بەناوی میوانداریییەوە دایکوتێ هەتا تووشی

گوناهی دەکا) هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! (چۆن چۆنی تووشی گوناهی دەکا؟) فەرمووی: (ئەوەندە لەلای دەمێنێتەوە بێزاری دەکا، نییەتی نان‌و ئاوی بداتێ‌و وەك میوان میوانداریی پێ بکا، لەباروودۆخی وادا دوور نییە، کە غەیبەتی بکا).

## ٨٤٣) دەسگیرۆیی یەکتری بەماڵی زیادە. (٤٤٩٢)
## بابٌ: المُواسَاةُ بِفُضُولِ المَالِ

١٠٦٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَهُ، قَالَ: فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ زَادَ لَهُ»، قَالَ: فَذَكَرَ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ مَا ذَكَرَ، حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لاَ حَقَّ لأَحَدٍ مِنَّا فِي فَضْلٍ. {الحديث: ٤٤٩٢ = ٤٤٨١ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەسەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، لەوکاتەدا پیاوێ بەسواری وڵاخێ هات، بەهەر چوارلادا چاوی دەگێڕا، بە ئومێدی ئەوەی کە کەسێ دەسگیرۆییەکی بکا. جابەم بۆنەیەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ وڵاخی سواریی لەخۆی زیادی هەیە، با بەخێر بیدا بەکەسێ کە وڵاخی سواری نییە، وە هەرکەسێ توێشووی لەخۆی زیادی پێ هەیە، با بەئومێدی پاداشی باشی بیدا بەکەسێ کە توێشووی پێ نییە).

فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی گەلێ زیادە ماڵی تری کرد، کە مرۆڤ بیکا بەخێر، تەنانەت هاتینە سەر ئەو بڕوایە کە کەسمان مافی ئەوەی نییە کەماڵی زیادە نەکا بەخێرو بۆ خۆی هەڵی بگرێ).

## ٨٤٤) فەرمانکردن بە کۆکردنەوەی پاشەڕۆك‌و بنبۆڵی توێشە بەرەو نانەبەرەو شتی واو دەستگیرۆیی لەم لایەنەوە. (٤٤٩٣)
## بابٌ: الأَمْرُ بِجَمْعِ الأَزْوَادِ إِذَا قَلَّتْ المُوَاسَاةُ فِيهَا

١٠٦٧- عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَزْوَةٍ، فَأَصَابَنَا جَهْدٌ، حَتَّى هَمَمْنَا أَنْ نَنْحَرَ بَعْضَ ظَهْرِنَا، فَأَمَرَ

نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَجَمَعْنَا مَزَاوِدَنَا، فَبَسَطْنَا لَهُ نِطَعًا، فَاجْتَمَعَ زَادُ الْقَوْمِ عَلَى النِّطَعِ، قَالَ: فَتَطَاوَلْتُ لأَحْزُرَهُ كَمْ هُوَ؟ فَحَزَرْتُهُ كَرَبْضَةِ الْعَنْزِ، وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، قَالَ: فَأَكَلْنَا حَتَّى شَبِعْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ حَشَوْنَا جُرُبَنَا، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَهَلْ مِنْ وَضُوءٍ »؟ قَالَ فَجَاءَ رَجُلٌ بِإِدَاوَةٍ لَهُ فِيهَا نُطْفَةٌ، فَأَفْرَغَهَا فِي قَدَحٍ، فَتَوَضَّأْنَا كُلُّنَا نُدَغْفِقُهُ دَغْفَقَةً أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، قَالَ: ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةٌ، فَقَالُوا: هَلْ مِنْ طَهُورٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَرِغَ الْوَضُوءُ ». {الحديث: ٤٤٩٣ = ٤٤٨٢ فم}:

ئیياسـی كـوڕی سـەلەمە، لەباوكیـەوە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەغەزایـەكا، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، تووشی برسێتییەكی سەخت بووین، تەنانەت نیازمـان هەبوو، كەهەندێ لە وشترەكانمان سەربڕین، جا لـەپاش پـرس‌و راو راوێـژ، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمانی كـرد، چـی مـاوە لـە توێشـە بـەرەو نانـە بـەرەكانمانا، لەپاشەڕۆك‌و بنبۆڵ، هەڵمانڕشتە سەر كەوڵێكی راخراو بـۆ ئـەم مەبەستە، سـەرەنجام لەم هەمە جۆرو هەڕەمەیـە، هـەنێ شت كۆكرایـەوە لەسـەر كەوڵەكـە، كـەبرێتی بـوو لەهەموو توێشووی خەڵكەكە، كەخۆم بۆ قـوتكردەوەو سـەرنجم دا، تـا بیخـەملێنم كـە چەندێ دەبێ، وام خەملاند كەهەمووی پڕ بەجێگە پاڵكەوتنی بزنێ دەبێ، سـوپاكەی ئێمـە هـەزارو چوارسـەد كـەس بـووین، هـەموومان تێرمـان خـوارد لێـی، وەهـەموو جەواڵەكانمان لێ پڕكرد، ئەمەیش هەمووی لەپیت‌و فەڕی نزای پیرۆزی پێغەمبـەرەوە بـوو. جا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئایـا ئـاو هەیـە بـۆ دەسـتنوێژ؟) جـا پیـاوێ جەوەندەیـەكی خـۆی هێنـا، چـۆڕێ ئـاوی تیـابوو خـاڵی كـردە نـاو جامێكـەوە، هەمووومان ئەو هەزارو چوارسەد كەسە، دەستنوێژێكی تێرو تەسەلمان لێ گرت، بـەخوڕ ئاومان دەكرد بەئەندامەكانی دەستنوێژدا.

جا لەپاشا هەشت كەسی تر هاتن، داوای ئاوی دەستنوێژیان كـرد، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاو بۆ دەستنوێژ نەماوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٣١٨٧}.

ئەم گێڕانەوەی ئێرە كە لە سەلەمەی كـوڕی ئەكوەعەوەیـە، هـەمان گێڕانـەوەی ئەم فەرموودەیە، كە لەئیماندا رابوورد، ژمارە: ١٣٧، ١٣٨، بۆئەوەی كە بـەجوانی لـەم فەرموودە پیرۆزە تێ بگەی بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٣١٨٧. چاپی چوارەم.



# ٣١- نامەی خەباتو تێكۆشان

## كِتَابُ الجِهَادِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، زنجیرە: ١١، هەتا زنجیرە: ١٠٥ = ژمارە: ٤٢٩٧ هەتا ژمارە: ٤٦٤٩ + تەجریدی بوخاری، بەرگی/٣، لاپەڕە: ٢٧٩ لەژمارە: ١١٤٦ هەتا ژمارە: ١٢٨٦} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٢٨٥ هەتا ژمارە: ١٣٥٧}.

### ٨٤٥) فەرمایشتی خودای گەورە: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا} لەگەڵ باسی گیانی شەهیدان

### بابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا} وَذِكْرِ أَرْوَاحِ الشُّهَدَاءِ

١٠٦٨- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ هَذِهِ الآيَةِ (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: « أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمُ اطِّلاَعَةً فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي، وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا، فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا قَالُوا: يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا، حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا ». {الحديث: ٤٨٦٢ = ٤٨٤٧ فم}:

مەسرووق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارمان كرد لەعەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبارەی هۆی هاتنی ئەم ئایەتەوە: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ - ئالی عیمران/٣/١٦٩}.

واتە: گومان مەبەن بەو كەسانە كە لەڕێگەی خودادا كوژراون، كە ئەوانە مردوون، بەڵكوو ئەوانە نەمردوونو زیندوونو وان لەخزمەتی خودادا، وەزۆر بەقەدرو ڕێزەوە خودا رزقو ڕۆژییان بۆ دەنێرێ، لە حەیاتێكی حەقیقیو لەژیانێكی ڕاستیدا، لە جەستەیەكی بەرزەخیی ناسكدا، وەك جیسمی لەتیفی

فریشتە، هەتا رۆژی قیامەت ئاوا دەژین‌و دەمێنن، تاکاتی حەشر، ئەوسا دەڕۆنەوە بەرگ‌و لەشە پێشووەکەیان‌و شادمان‌و دڵخۆشن بەو بەهرەو بەخششەی کەخودا بەهۆی سەربەرزیی شەهیدبوونەوە، بە فەزڵی خۆی داویەتی پێیان...).

مەسرووق فەرمووی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیارمان کرد لە عەبدوڵڵا، فەرمووی: ئێمەیش سەبارەت بەمە پرسیارمان کرد: لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەڵاما فەرمووی: (گیانی شەهیدان وان لەناو سکی چەند مەلێکی سەوزدا، وە ئەو مەلانە لەناو بەهەشتا بە ئارەزووی خۆیان گەشت‌و گوزار دەکەن‌و حەزیان لەچی بێ دەیخۆن، هەمووجارێ لەپاش گەشتەکەیان بۆ حەوانەوەو حەسانەوە، دەگەڕێنەوە بۆناو چراخانێ، کە هەڵواسراون لە سێبەری تەخت‌و بارەگا (عەرش)دا، جا جارێ پەروەردگاریان سەر دەکێشێتە ناویان‌و پێیان دەفەرموێ: (حەزتان لەچی ترە تابیدەم پێتان؟ شەهیدەکان دەفەرموون: ئەی پەروەردگارمان! لەمەزیاتر چی ترما بوێ، ئەوەتا بۆخۆمان لەبەهەشتا، بەئارەزووی خۆمان دەسووڕێینەوەو دەخۆین‌و دەخۆینەوەو رادەبوێرین! هەتا سێجار ئەم گفتوگۆیە، لەنێوانی شەهیدان‌و پەروەردگاریانا دووبارە دەبێتەوە. جا کاتێ شەهیدەکان دەبینن کەخودا وازیان لێ ناهێنێ، هەتا داوای شتێ تر نەکەن، عەرزی دەکەن: ئەی خودایە! دەمانەوێ گیانمان بکەیتەوە بەبەرمانا، هەتا بگەڕێینەوە بۆ جیهان، جارێکی تر لەپێناوی ئایینی پیرۆزی تۆدا، بکوژرێینەوە!

کاتێ پەروەردگار دەبینێ، کە شەهیدەکان هیچ پێویستییەکی تریان لەبەهەشتا نییە وازیان لێ دێنێ‌و پێیان نافەرموێ: چی ترتان دەوێ تاپێتانی بدەم). {تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٨٤، ج/٤}.

### ٨٤٦) دەرگاکانی بەهەشت وان لەسای سێبەری شمشێردا. (٤٨٨٨ - ٤٨٨٩)

### باب: إنَّ أبْوابَ الجَنَّةِ تَحْتَ ظِلالِ السُّيُوفِ

١٠٦٩- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ

السُّيُوفِ ». فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللّـه (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَقْرَأُ عَلَيْكُمُ السَّلاَمَ، ثُمَّ كَسَرَ جَفْنَ سَيْفِهِ، فَأَلْقَاهُ، ثُمَّ مَشَى بِسَيْفِهِ إِلَى الْعَدُوِّ فَضَرَبَ بِهِ حَتَّى قُتِلَ. {الحديث: ٤٨٩٣ = ٤٨٧٨ فم}:

ئەبوبەكری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی قەیس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: رووبەڕووی دوژمن راوەستابووین، لەوكاتەدا لەباوكم بیست، كە ناسراوە بە ئەبوو مووسای ئەشعەری دەیفەرموو: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دڵنیابن كەوا دەرگاكانی بەهەشت وان لەژێر سێبەری شمشێردا). كابرایەكی رووتەڵەی شڕۆڵە هەڵسایەوە گوتی: ئەی ئەبو مووسا! ئایا تۆ بۆخۆت بەگوێی خۆت ئەمەت لەزاری پیرۆزی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوتووە، یا كەسێكی تر بۆی گێڕاویتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ بە گوێچكەی خۆم لەوم بیستووە. ئیتر ئەو برادەرە گەڕایەوە بۆلای برادەرەكانی خۆی‌و گوتی: بۆ دواجار لەلایەنی منەوە سڵاوتان لێ بێ، من دەڕۆم بۆ كوشتار، تا نەكوژرێم ناگەڕێمەوە!

ئەوجا دەستی دایە مشتووی شمشێرەكەی‌و لەكێلان دەری هێناو كێلانەكەی شكان‌و فڕێیداو، جارێكی تر بەتەمای نەما، ئینجا بە شمشێری رووتەوە رووی كردە دوژمن‌و دەستی كرد بەشەڕە شیرو هەر شمشێری وەشاند هەتا شەهیدكرا). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٠٢} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١٥} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١٤}.

## ٨٤٧) هاندان لەسەر خەباتگێران‌و گەورەیی خەباتگێران. (٤٨٣٦ - ٤٨٤٣)
## بابٌ: الترغيب في الجهاد وفضله

١٠٧٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّـه (صلى الله عليه وسلم): « تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِى سَبِيلِهِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ جِهَادًا فِى سَبِيلِى وَإِيمَانًا بِى وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِى فَهُوَ عَلَىَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِى خَرَجَ مِنْهُ،

نَائلاً مَا نَالَ مِنْ أجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، وَالَّذى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه، مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِى سَبِيلِ اللَّـهِ إلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِه حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ، وَالَّذى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه لَوْلاَ أنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلاَفَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِى سَبِيلِ اللَّـهِ أَبَدًا، وَلَكِنْ لاَ أجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ وَلاَ يَجِدُونَ سَعَةً وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّى، وَالَّذى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّى أَغْزُو فِى سَبِيلِ اللَّـهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ ».
{الحديث: ٤٨٣٦ = ٤٨٢١ فم. تجريد/١، رقم: ٣٤ = ٣٦، ٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٦٣، ٧٤٥٧. نسائى. إيمان: ٥٠٤٥. تحفة الأشراف: ١٤٩٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: کەسێ بڕوا بۆ خەبات‌و غەزاو تێکۆشان لەڕێی خودادا، خودا بۆخۆی دەبێ بە دەستەبەر (زامن)ی‌و، دەفەرمویٚ: خۆم کەفیلی ئەوم کەیەکێ لەم دوو خەڵاتە گەورەیەی پێ بدەم: یا بیبەمە ناو بەهەشت (لە حاڵەتی شەهیدبوونا) یابیبەمەوە بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو پاداشی گەورەو تالانییە زۆرەی کە دەستی دەکەوێ! بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کەدەچێ بۆ ئەو غەزاو کۆششە تەنیا مەبەستی ڕەزامەندیی خودابێ‌و باوەڕو ئیمانی بەمن‌و بە پێغەمبەرانی من هەبێ، بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، دیارە کەیەزدانی پاکە، هەرکەسێ لەڕێی خودادا زامار بکرێ، لەڕۆژی قیامەتا کەدێ بۆ دیوانی خودا زامەکەی تازەو نوێیە وەکوو تازە ئەودەمە زامارکرابێ ئاوایە، لەسەر هەمان شێوەیە، ڕەنگەکەی سووری تلیقییە، وەکوو خوێنی ئاسایی، بەڵام بۆنەکەی بۆنی میسکە، ئیتر بەو زامە شەهید بووبێ یانا جیاوازیی نییە لەوەدا، کە لەڕۆژی قیامەتا لەسەر ئەو شێوەیە دێ بۆ دیوانی خودا بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەترسم کە موسوڵمانان تووشی ڕەنج‌و سەختەتی ببن، دەنا ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە ئەوا لەگەڵ هەموو تاقمە موسوڵمانێکا کەدەچن بۆ غەزاو خەبات خۆشم لەگەڵیانـدا دەچووم، بەڵام ئەمە ناکرێ: چونکە نەخۆم ئەو توانایەم هەیە کە وڵاخی سواریی بۆ هەموویان پەیدا بکەم‌و، نەخۆشیان ئەو دەستەیان دەڕوا، لەهەمان کاتا زۆریش

بەزەحمەتی دەزانن‌و لەشانیان گرانە ئەگەر من بچم بۆ غەزاو ئەوان لەگەڵم نەیەن بۆ ئەو غەزایە!

بەوخودایە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، بەحەزی دڵ پڕبەدڵ حەزدەکەم کە لەڕێگەی خودادا بچم بۆ غەزاو لەو غەزایەدا بکوژرێم، دیسان زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٢٩٨، چ/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٠/١٢٩٤/٣٤٩}.

## ٨٤٨) بەهۆی غەزاو خەباتگێڕانەوە، پلەو پایەی بەندەی موسوڵمان بەرز دەبێتەوە. (٤٨٥٦)

## بابٌ: رَفْعُ دَرَجَاتِ الْعَبْدِ بِالجِهَادِ

١٠٧١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « يَا أَبَا سَعِيدٍ: مَنْ رَضِىَ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَبِيًّا، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ » فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَىَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: « وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِى الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ »، قَالَ: وَمَا هِىَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ، الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ ». {الحديث: ٤٨٥٦ = ٤٨٤١ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو سەعید! ئەوەی خودا بەخودای خۆی بزانێ‌و ئیسلام بە ئایینی خۆی دابنێ‌و موحەممەد بە پێغەمبەری خۆی قەبووڵ بکا، ئیتر بەهەشت بۆخۆی مسۆگەر دەکا!). فەرمووی: منیش ئەم فەرمایشتەم زۆر بەلاوە خۆش‌و دلگیربوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆمی دووبارە بکەرەوە، ئەویش دووبارەی کردەوە بۆم، ئەنجا فەرمووی: (بەڵام پایەیەکی تریش هەیە، بەندەی ئیماندار لەبەهەشتا سەد پلە پێی بەرزدەبێتەوە کە نێوانی هەموو دوو پلەیەکی بەقەد نێوانی ئاسمان‌و زەوی دەبێ!).

گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەو پایەیـە چـییە کەئەوەنـدە پاداشـەکەی گەورەیـە؟ فـەرمووی: (ئـەوە پایـەی کۆشـشو غـەزاو تێکۆشـانە لەڕێگـەی خـودادا) دووجار ئەم وشە پیرۆزەی دووبارە کردەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٤، چ/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٠١}.

## ٨٤٩) باشترین کەس خەباتگێڕە لەڕێگەی خودادا بەسەرو بەسامان. (٤٨٦٣ - ٤٨٦٨)

## بابٌ: أَفْضَلُ النَّاسِ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِنَفْسِه وَمَالِه

١٠٧٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّهُ عَنْـهُ): أَنَّ رَجُـلاً أَتَـى النَّبِـيَّ (صـلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: « رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِمَالِـهِ وَنَفْسِـهِ »، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: « مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَعْبُدُ اللَّهَ رَبَّهُ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَـرِّهِ ». {الحديث: ٤٨٨٣ = ٤٨٤٨ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٤٧ = ٢٧٨٦ ، ٦٤٩٤ فتح البارى} :

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کرد، گوتی: قوربـان! چاکترین کـەس کێیـە؟ فەرمووی: (ئەو پیاوە موسوڵمانەی کە بەگیانو سامانو بەسـەرو بـەماڵ، لەڕێگـەی خودادا تێ دەکۆشێ).

پیاوەکـە گـوتی: ئـەی لـەدوای ئـەو کـێ چـاکترین کەسـە؟ فـەرمووی: (ئـەو موسـوڵمانەی کـە لەپەنایـەکا، خـودای خـۆی بـەجوانی دەپەرسـتێو سـەری خـۆی کزدەگرێو لەخودای گەورە دەترسێو ئازاری کەس ناداو مەردووم لەشـەڕو وەزەنـی بەدوورن!). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٢، چ/٤}. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٢٨٩}.

## ٨٥٠) ئەوەی بمرێو غەزای نەکردبێو لەدڵیشەوە بەتەمای غەزا نەبووبێ(٤٩٠٨)

## بابٌ: مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ

١٠٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ »، قَـالَ عَبْـدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: فَنُـرَى أَنَّ ذَلِـكَ كَـانَ عَلَـى عَهْـدِ رَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم).

{الحديث: ٤٩٠٨ = ٤٨٩٣ فم. أبو داود. جهاد: ٢٥٠٢. نسائي. جهاد: ٣٠٩٧. تحفة الأشراف/ ٢٣٠٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی بمرێو غەزای نەکردبێو لەدڵیشەوە لەژیانیدا بەتەمای غەزاکردن نەبووبێ، ئەوە کەدەمرێ ڕەگێکی ناپاکیو مونافیقی واتیادا). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٢١١، چ/٤}.

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: وادەزانم کە ئەمە هەربۆ سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابووە. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ٣٩٥/١٣٤١/٥٧، چ/٤}.

## ٨٥١) گەورەیی غەزاکردن لەدەریادا. (٤٩١١ - ٤٩١٤)

## بابٌ: فَضْلُ الجِهَادِ فِی البَحْرِ

١٠٧٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ، ثُمَّ جَلَسَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: « نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ (يَشُكُّ أَيُّهُمَا قَالَ) قَالَتْ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ». (كَمَا قَالَ فِي الأُولَى) قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: « أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ »، فَرَكِبَتْ أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ الْبَحْرَ فِي زَمَنِ مُعَاوِيَةَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ فَهَلَكَتْ. {الحديث: ٤٩١١ = ٤٨٩٦ فم. تجريد/ ٥، رقم: ٢٠٨٦ = ٧٠٠٢، ٢٧٨٨، ٢٧٨٩، ٦٢٨٢، ٦٢٨٣. أبو داود. جهاد: ٢٤٩١. ترمذي. جهاد: ٢٤٩١. نسائي. جهاد: ١٦٤٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (گەلێ جار پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەچوو بۆ دێنی ئوم حەرام، کە پووری هەقی من بوو، خوشکی دایکم بوو، وە پووری شیریی پێغەمبەریش بوو، مەحرەمی بوو، نامەحرەم نەبوو، ئوم حەرام ناوی رومەیصای کچی میلحان بوو، خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، رۆژێ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هات بۆسەردانی ئوم حەرام، نانی بۆدانا، دوایی هەنێ سەری پێغەمبەری دۆزی، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) خەوی لێ دەکەوێو سەرخەوی نیوەڕۆ لەوێ دەشکێنێ، کاتێ خەبەری دەبێتەوە پێ دەکەنێ، ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باوكو دایکم بەقوربانت بن، ئەوە بۆچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: (لەخەوما کۆمەڵێ لەگەلی ئیسلامی خۆمم بینی، دەبن بەخەباتکارو غەزاکار لەڕێگەی خودادا، سواری پشتی ئەم دەریایانە دەبن، شوێنو جێگەیان لەناو پاپۆڕو کەشتییەکاندا، ئەوەندە باشو خۆشو فەرەحو کەشخەیە، دەڵێی پاشان لەسەر تەختو قەنەفەی شاهانە دانیشتوون). ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! داوا لەخودا بکە کەمن یەکێ لەم چینەی ئۆمەتت بم.

فەرمووی: (تۆ لەوانیتو لەچینی غەزاکارانو شەهیدانی ناو دەریایت). ئەنجا دیسان پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) سەری نایەوەو جارێ تر خەوتەوە، کە هەڵسایەوە دیسان پێدەکەنی، کاتێ لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کردەوە، هەمان وەڵامی پێشووی دامەوە، کە کۆمەڵانێ تریش لە ئۆمەتی پێغەمبەر، لەبارو دۆخێکی شاهانەدا دەچن بۆ خەباتگێڕانو غەزاکردن، لەڕێگەی خودای گەورەداو، ئەویش لەخۆشی ئەوە پێدەکەنێو موعجیبە پێیان). ئوم حەرام فەرمووی: منیش عەرزیم کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! نزام بۆبکە کەخودا بمکات بەیەکێ لەو کۆمەڵانە. فەرمووی: (تۆ لەکۆمەڵە پێشینەکانی!).

لەپاشا لەکاتی سەرکاریی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیاندا، کە نوێنەری ئیمامی عوسمان بوو لەسەر وڵاتی شام، عوبادەی مێردی، لەدەریاوە ئوم حەرامی لەگەڵ خۆی برد بۆ غەزای قوبروس، کاتێ هاتەوەو گەڕایەوەو گەیشتە وشکانی،

هێستره ماچەیەکیان بۆیبرد، کاتێ ئوم حەرام سواری هێسترەکە بوو، گلاندیو کەوتە خوارەوە مرد. بەپێی دووعاکەی پێغەمبەر، کەبۆیی کرد شەهید بوو). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣١٣، چ/٤}.

## ٨٥٢) خێری پاسەوانیی ناو سەنگەرەکانی سەر سنوور. (٤٩١٥ - ٤٩١٦)

## بابٌ: فَضْلُ الرِباطِ فِي سَبِيلِ اللّه

١٠٧٥- عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ. وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِى كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، وَأَمِنَ الْفَتَّانَ ». {الحديث: ٤٩١٥ = ٤٩٠٠ فم}:

سەلمانی فارسی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (شەوو رۆژێ پاسەوانی ناو سەنگەرەکانی سەر سنووری نێوانی وڵاتی ئیسلامو وڵاتی دوژمن خێرترە لەرۆژوو وشەو نوێژیی یەك مانگ، وە ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە، لەم جۆرە بارودۆخانەدا بمرن، هەموو رۆژێ هەتا رۆژی قیامەت، پاداشی رۆژوو وشەو نوێژیی یەك مانگی تەواوی بۆ دەنووسرێ، وە وەك شەهید لەبەهەشتا خودا رزقو رۆژی بۆ دەبرێتەوەو گیانی لەبەری باخەکانی بەهەشت دەخوات، وە لەتاقیکردنەوەی ناو گۆڕیش، لەلایەنی نەکیرو مونکەرەوە، رزگاریان دەبێ!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٤٣٣٧، ٤٣٣٩} بڕوانە: ژمارە: ٩٤٩ لەپێشەوە رۆیشت لەم کتێبە پیرۆزەدا + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٢٩٢}.

## ٨٥٣) تاقێ کۆششو تێکۆشان لەرێگەی خودادا لەهەموو سامانو موڵکی جیهان چاکترە. (٤٨٥٠ - ٤٨٥٥)

## بابٌ: غَدْوَةٌ فِى سَبِيلِ اللّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا

١٠٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَغَدْوَةٌ فِى سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ». {الحديث: ٤٨٥٠ = ٤٨٣٥ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٥٠ = ٢٧٩٢، ٢٧٩٦، ٦٧٦٨، نسائي. جهاد: ٣١١٨}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تاقێ كۆشش و تێكۆشان لەڕێگەی خودادا (چی تاقی بەیانی بێ و چی تاقی ئێوارەبێ) لەهەموو سامان و موڵكی جیهان چاكترە). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٩٤٣ — ٦، ٤. چاپی یەكەم = زنجیرە/٢٣٤، ژمارە: ١٢٩٠} + {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٠}.

**٨٥٤) فەرمایشتی خودای گەورە: (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ). (٤٨٤٤ - ٤٨٤٩)**

**بابٌ: في قوله تعالى: {أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ}**

١٠٧٧- عَنْ النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ إِلاَّ أَنْ أُسْقِيَ الْحَاجَّ، وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ إِلاَّ أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ. فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَقَالَ: لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ...) الآيَةَ إِلَى آخِرِهَا. {الحديث: ٤٨٤٨ = ٤٨٣٣ فم}:

نوعمانی كوڕی بەشیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من خۆم لەلای دوانگەكەی پێغەمبەردا بووم، پیاوێ گوتی: لەپاش قەبووڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، باشترین كاری باش لەبیرو باوەڕی منا، ئاودانە بەحاجیان لەكاتی حەجا، لەبەرئەوە ئەگەر من ئەم كردەوە باشە بۆخۆم دابین بكەم، دەربەستی كردنی هیچ كارێكی باشەی ترنیم!

پیاوێكی تر گوتی: لەپاش قەبووڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، باشترین كاری باش لەبیرو باوەڕی منا، ئاوەدانكردنەوەی مەسجیدولحەرامە، لەبەرئەوە ئەگەر من ئەم كارە باشە بۆ خۆم مسۆگەر بكەم، دەربەستی كردنی هیچ كارێكی باشی ترنیم!

پیاوێکی تـر گـوتی: غـەزاو تێکۆشـان لەڕێگـەی خـوادادا، گـەلێ چاکترە لەمانـەی کەئێوە دەیانڵێن. جا ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) پیایانا هەڵشاخاو فەرمووی: (بەم رۆژی هەینیە، لەلای دوانگەکەی پێغەمبەردا دەنگتان بـەرز مەکەنـەوە، بـەڵام ئـارام بن هەتا نوێژی هەینی دەکەم، دەچمە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی ئەمەی کەئێوە راجیاییتان هەیە لەسەری، پرسیار لـە پێغەمبـەر خـۆی دەکـەم. جا بەم بۆنەیەوە خودای گەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: {أجعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ — ٩/ التوبة/ ئايەتی ١٩}:

واتـە: چـۆن ئێـوە لەخۆتانـەوە کەسـانێ کـە ئـاو دەدەن بـەحاجیان، یـا مەسجیدولحەرام ئاوەدان دەکەنەوە، بەخزمەتو شتی وا، چۆن ئـەم جۆرە کەسـانە دەبەنـە ئاستی کەسانێ کە بـاوەڕی تـەواویان بـەخودای گـەورەو بـەرۆژی قیامـەت هەیەو لەهەمان کاتا، لەڕێگەی خودادا غەزا دەکەنو تێدەکۆشـن، ئـەم دوو کۆمەڵـە لەلای خودا وەکوو یەك نین، بەڵکوو کۆمەڵەی دووەم زۆر بڵندو پایە بـەرزن لـەلای خودا، خودای گەورە رێنمایی کۆمەڵەی ستەمکاران ناکا).

## ٨٥٥) هاندان لەسەر داواکردنی شەهیدبوون. (٤٩٠٦ - ٤٩٠٧)

## بابٌ: التَرغِيبُ فِي طَلَبِ الشَهَادَةِ

١٠٧٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ ». {الحديث: ٤٩٠٦ = ٤٨٩٢ فم}:

سەهلی کوڕی حونـەیف (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەڕاستیو بـەدڵ لـەخودای گـەورە، داوای شـەهیدبوون بکا، خودای گەورە پایەی شەهیدیی پێ دەبەخشێو دەیباتە پلەو پایەی شەهیدان، بابـە دەردی خودایش لەسـەر نـوێنی خـۆی بمـرێ!). {ریـاض/١، زنجیـرە: ٤، ژمـارە: ٥٧/٤، چ/٢ + ریاض/٣، زنجیرەی: ٢٣٤، ژمارە: ٣٨/١٣٢٢/٣٧٦}.

**روونكردنەوە:**

سەهلی کوڕی حونەیف ئەنصارییە، لەهۆزی ئەوسە، لەموسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، بەدرییە، لەجەنگی ئوحوددا خۆگربوو، لەوکاتە زۆر سەختو دیژوارەدا پەیمانی بە پێغەمبەردا کە هەتا مردن پشتی بەرنەداو سەنگەر چۆڵ نەکا، هەروا ئامادەی خەندەقو هەموو شەڕگاکانی تر بووە، لەپاش شەڕەکەی ئەلجەمەل عەلی کردی بەسەرداری سەر بەصرە، لەساڵی هەشتاو هەشتی کۆچیدا، لەکووفە مردووە، ئیمامی عەلی نوێژی مردووی لەسەر کرد، شەش (الله اکبر)ی لەنوێژەکەدا کرد.

### ٨٥٦) گەورەیی پایەی شەهیدیی لەڕێگەی خودای گەورەدا. (٤٨٤٤ - ٤٨٤٩)

### باب: فَضْلُ الشَّهَادَةِ فِي سَبِيلِ اللّهِ تَعَالَى

١٠٧٩- عَنْ أَنسَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَأَنَّ لَهُ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ ». {الحديث: ٤٨٤٥ = ٤٨٣٠ فم. بخاري. جهاد: ٢٨١٧}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو کەسەی کەچووە ناو بەهەشت حەزناکا کە بگەڕێتەوە بۆ دونیا، ئەگەر هەرچی لەسەر رووی زەوی هەیە بیدەن پێی ناگەڕێتەوە، مەگەر شەهید، بەڵام شەهید حەزدەکا کە بگەڕێتەوە بۆ جیهانو دەجاری تریش بکوژرێتەوە! چونکە بەچاوی خۆی دەبینێ کە شەهید چەندە بەقەدرو بەڕێزو قورسو گرانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٣٢٢} + {ریاض الصالحين/٣، لاپەڕە: ٢١١، چاپی/٢، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١١}.

### ٨٥٧) ڕۆڵی نیازو نیازپاکی لە دامەزراندنی کارو کردەوەکاندا. (٤٩٠٤ - ٤٩٠٥)

### بابٌ: النِّيَّةُ فِي الأَعْمَالِ

١٠٨٠- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لاِمْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ،

فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ ». {الحديث: ٤٩٠٤ = ٤٨٨٩ فم. تجريد/١، رقم: ١}:

**عومەری کوڕی خەتاب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (هەموو کارو کردەوەیێ بەپێی نیازو نێتەکەیەتیو هیچ کارێ بەبێ نیازو خواستی دڵ دانامەزرێ وەهەموو کەسێکیش بەپاداشی نیازو نییەتی خۆی دەگا، چ چاك چ خراپ، کەوابوو هەرکەسێ مەبەستی لەکۆچکردنو هیجرەتەکەی لە مەککەوە بۆ مەدینە، ڕەزای خوداو پێغەمبەر بێ، ئەوا کۆچکردنەکەی قەبووڵەو بە پاداشی گەورە دەگا، وە هەرکەسێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دنیایی بێ، کە دەستی بکەوێ، یاخۆ لەبەر ئافرەتێ بێ کەمارەی بکا، ئەوە کۆچکردنەکەی بەپێی نیازەکەیەتیو هیچ خێری ناگا لەسەری). {تاج/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٨٣، چ/٤}.**

**ڕوونکردنەوە:**

١. کردەوەی جەستەیی (عەمەلی بەدەنی) فەرزبێ یان سوننەت، بەبێ نێتو نیاز لێهێنان دانامەزرێ، بەڵام ئەمە بەزۆری وایە، دەنا هەندێ کردەوە بەبێ نێتلێهێنانیش دادەمەزرێ، وەك قورئان خوێندنو زیکرو سیواك کردنو بانگ دان، هەروا وازهێنان لەحەرامیش بەبێ نیازهێنان دەبێ، جاری واهەیە حەرام بەس بەنێتەکەی دەچەسپێو بەندە شایستەی تۆڵە دەبێ. بڕوانە خاڵی (٦) لەم خاڵانە.

٢. هەندێ کردەوەی باش، ئەگەر بەدوو نیاز بکرێ، وەك ئەوە کارێ بەمەبەستی ڕەزای خوداو بەنیازی مەبەستێکی ڕەوای دنیایی بکرێ، وەك ژنهێنانو خانوو کردن، ئەوە بەپێی نیازی ڕەزامەندی خودا پاداشی باشی بۆ هەیە، بەڵام بەپێی نیازی دووهەم پاداشی بۆ نییە، نەهی باش نەهی خراپ.

٣. زۆرینەی کات سووڕگەی بڕیار لەم بابەتەدا، بەپێی نیازی دڵە. بڕوانە: خاڵی (٦) لەم خاڵانە، بۆ پاداشی لەسەر نیازی باش.

٤. بەپێی پەڕاوە گەورەکانی یاسانامەی خودا، نیاز (نێت) دوو جۆری سەرەکی هەیە، لەبەشی یەکەما تەلەففوز بەنێت مەرجە، وەك حەج و عەمرەو شت نەزرکردن و وەقف، لەبەشی دووەما نێت بەزمان مەرج نییە، بەس بەدڵ دادەمەزرێ، بەوێنە: نیازهێنان بەقسە لەنوێژدا، لەلای هەندێ مەرج نییە، هەندێ دەڵێن: کرك کردن بەنیاز لەنوێژدا بە ئەڵڵاهو ئەکبەری تەحەرروم لەگەڵ نیازی دڵا، مەزاهیبی ئەربەعە دەفەرموون: واباشە لەپێش گوتنی ئەڵڵاهو ئەکبەردا کرك بەنێت بکرێ، وەك ئەوە بەزمان بڵێ: نێتمە نوێژی ئەم نیوەڕۆیە دەکەم، یا نێتمە نوێژی ئەم بەیانییە دەگێڕمەوە بۆ خودا.

٥. مەبەست لەنیاز (نێت) لەم فەرموودەیەدا واتا زمانییەکەیەتی، نەوەك واتا زاراوەیی فیقهییەکەیەتی، چونکە ئەگەر کەسێ لەبەر هۆیەکی دڵداریی، کارێکی خێر ئەنجامبدا، پێویستی بەوە نییە کەبڵێ: (نێتمە کۆچ دەکەم لەبەرئەوەی دایکی قەیس مارە بکەم!!) بەڵام بەبێ گومان کەواتا زاراوەییەکەی نێت دەگرێتەوە، چونکە هەمیشە واتای زاراوەیی بەشێکە لە بەشەکانی واتای زمانی، وەك دەگوترێ: (المعنى الاصطلاحي فرع من المعنى اللغويّ).

٦. نموونەی گوناه کە بەنیاز (نێت)ی رووت دابمەزرێ وەك لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (... سێیەم: کەسێ خودا ماڵی پێ بدا بەڵام عیلم و زانستی پێ نەدا، جاخۆی بەنادانی چەپ و گووپی تیابکاو تەقوای خودای پێ نەکاو مافی خزم و خوێشی لێ نەدا، وەسیلەی رەحمی پێ بەجێ نەهێنێ و مافی خودای لێ نەدا، ئائەمە پیسترین پایەی هەیە.

چوارەم: بەندەیێ خودا نەماڵ و نەزانستی پێ نەدابێ، کەچی بڵێ: بریا ماڵم دەبوو، منیش وەك فیسارە کەس بە نەفامی خەرجم دەکرد، جا ئەم نەگبەتە، بەهۆی نیازی پیسیەوە، لەتۆڵەی تاوانا لەگەڵ کەسی سێیەمدا چون یەکن، ئەمیش لەپیسترین پایەدایە وەك ئەو). {ئەم فەرموودەیە، تەرمەزی بەڕشتەیەکی دروست (ساخ = صحیح) گێڕاویەتەوە، بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٩١، ج/٤}.

ئـەم خـاڵی چـوارەمە دژی ئـەم فەرموودەیـەی ترنییـە کـە دەفـەرموێ: (... وە ئەگـەر کەسـێ ویسـتی خراپـەیێ بکـا، بـەڵام نـەیکرد، ئـەوە خـودا لـەلای خـۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ...). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٨٤، چ/٤}.

بۆ نموونەی پاداش لەسەر نیازی رووتی باش بڕوانـە: ژمـارە: ١٠٧٨ کـە لـەپێش دوو ژمارەوە رۆیشت.

## ٨٥٨) خودای گەورە رازییە لەشەهیدانو شەهیدانیش رازین لەخودا

(٤٨٩٠ - ٤٨٩٥)

### بَابٌ: رِضَى اللّه عَنِ الشُّهَدَاءِ وَرِضَاهُمْ عَنْهُ

١٠٨١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالُوا: أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقُرَّاءُ، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ، وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَيَحْتَطِبُونَ، فَيَبِيعُونَهُ، وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ، وَلِلْفُقَرَاءِ، فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَعَرَضُوا لَهُمْ. فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ، فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا، قَالَ: وَأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خَالَ أَنَسٍ مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ، فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَصْحَابِهِ: « إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وَإِنَّهُمْ قَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا ». {الحديث: ٤٨٩٤ = ٤٨٧٩ فم. تجريد/١، رقم: ٥١٥ = ١٠٠١، ١٠٠٢، ١٠٠٣، ١٣٠٠، ٢٨٠١، ٢٨١٤، ٣٠٦٤، ٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٠، ٤٠٩١، ٤٠٩٢، ٤٠٩٤، ٤٠٩٥، ٤٠٩٦، ٦٣٩٤، ٧٣٤١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ خەڵك لەچەند هۆزێکی عەرەب، وەك ریعلو زەکوانو عوصەیە، هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیان کرد: پیاو گەلێکمان لەگەڵدا بنێرە بۆ ناو هۆزەکانمان، هەتا ببن بە مامۆستامانو فێری قورئانو سوننەتمان بکەن، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ)

حەفتا پیاوی قورئان زانی، لە یاریدەدەران لەگەڵدا ناردن بۆلای هۆزەکانیان، کە ناوداربوون بە قورئان خوێنەکان، حەرامی کوڕی میلحان کە خاڵۆی من بوو، برای دایکم بوو یەکێ بوو لەوان، ئەم کۆمەڵەیە هەر خەریکی خوێندنو لەبەرکردنو دەورو فێربوونی قورئانی پیرۆز بوون لەمەدینە، بۆیە پێیان دەگوتن قورئان خوێنەکان، بەتایبەتی لەشەودا سەرگەرمی ئەم کارە پیرۆزە بوون، بەرۆژیش ئاویان دەکێشاو دەیانهێنا لە مزگەوت دایان دەناو دەیانکرد بەخێراو بۆ خواردنەوەو دەسنوێژو پێویستی تر، وە لەو دەشتە بەرۆژ داریان دەبڕیو بەکۆڵ دەیانهێنا لەبازاڕ دەیانفرۆشتو خۆراکیان پێ دەکڕی بۆ میوانەکانی میوانخانەی صوففەو بۆ هەژارانی تر. جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەرامی خاڵۆمی بەحەفتا سوارەوە، بۆ ئەم مەبەستە، نارد بۆ ناویان، کەچی نامەردانە، پێش ئەوەی کە بگەنە جێگەی مەبەست پەلاماریان دەدەنو دەیانکوژن، ئەوانیش دەفەرموون: ئەی خودایە! لەباتی ئێمە بە پێغەمبەری ئێمە کە موحەممەدە، رابگەیەنە: کە ئێمە شەهیدبووینو گەیشتووین بەدیداری تۆ، ئێمە لەتۆ رازینو تۆیش لەئێمە رازیت).

فەرمووی: ئاوا دەست دەکەن بەکوشتنیان: حەرامی کوڕی میلحان، دەست دەکا بەفەرمایشت فەرموون بۆیان هەتا پەیامی پێغەمبەریان پێ رابگەیەنێ، ئەوانیش بەدزییەوە ووشت لەپیاوێ لەخۆیان دەکەن، کابراکە لەپشتەوە بۆی دەچێو رمێکی لێ دەداو لەسنگیەوە دەردەچێو دەیکوژێ، حەرام لەخۆشیانا دەفەرموێ: بەخاوەنی کەعبە، کە خودای گەورەیە، واشادبووم بەشەهیدبوونو گەیشتم بەئاواتی خۆم، کە رەزابوونی خودایە بەهۆی شەهیدبوونمەوە!)

جا پاش روودانی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: (برادەرانی ئێوە هەموو کوژراون، وە بەبۆنەی شادبوونیان بە پایەی شەهیدیی فەرموویانە: ئەی خودایە! بە پێغەمبەری ئێمە رابگەیەنە، کە ئێمە شەهید بووینو شادبووین بەدیداری تۆ، وە ئێمە لەتۆ رازینو تۆویش لەئێمە رازیت!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٤٦٤٥، ٤٦٤٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ٣٢/١٣١٦/٣٧٠} .

## ٨٥٩) شەهید جۆری زۆرە. (٤٩١٧ - ٤٩٢٢)

## باب: الشُّهداءُ خمْسَة

١٠٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ»، وَقَالَ: « الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ». {الحديث: ٤٩١٧ = ٤٩٠٢ فم. تجريد/١، رقم: ٣٧١ = ٦٥٢، ٢٤٧٢، ٦٥٣، ٧٢٠، ٢٨٢٩، ٥٧٣٣. ترمذي. صلاة: ٢٢٥. نسائي. مواقيت: ٥٣٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ بەڕێگەیەکا دەڕۆیشت، لقێ درکی بینی لەسەر ڕێگەکە کەوتبوو، هەڵی گرتو دووری خستەوە، لەڕێگەکە، هەتا نەبێ بەئازار بۆ ڕێبوار، خودا لەسەرئەوە سوپاسی کردو چاکەی دایەوەو لێی خۆش بوو).

لەپاشتر خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (ئەم پێنج کەسە، شەهیدن‌و لەکاتی گیان دەرچووندا فریشتەی ڕەحمەت دێنە دیاریان:

یەکەم: کەسێ بە پەتا (تاعوون) بمرێ.

دووەم: کەسێ بەدەردی ناوسك بمرێ.

سێیەم: کەسێ لەئاوا بخنکێ.

چوارەم: کەسێ شت بڕوخێ بەسەریا، یا ببێ بەژێرشتەوە.

پێنجەم: کەسێ لەڕێگەی خودادا شەهید ببێ‌و بکوژرێ.

**ڕوونکردنەوە:**

ژمارەی شەهید، بەپێی کۆمەڵێ بیستراو (ئەثەر)و گێڕانەوەکان دەگاتە چل جۆر، وەك بەندە لەپارچەیێ شیعردا، لەبەرگی سێیەمی ریاضی صالحیندا، لەزنجیرە: ٢٣٥دا، ئەمەم ڕوونکردۆتەوە، تکایە بڕوانە ژمارەکانی زنجیرەی: ٢٣٥ لە ریاض صالحیندا، بەتایبەتی ئەم ژمارانە: ١٣٥٣، ١٣٥٤، ١٣٥٥، ١٣٥٦.

## ٨٦٠) تاعوون شەهادەتە بۆ هەموو موسوڵمانێ. (٤٩١٧ - ٤٩٢٢)
## باب: الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِم

١٠٨٣- عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ قَالَتْ: قَالَ لِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: بِمَا مَاتَ يَحْيَى بْنُ أَبِي عَمْرَةَ؟ قَالَتْ: قُلْتُ: بِالطَّاعُونِ، قَالَتْ: فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ ». {الحديث: ٤٩٢١ = ٤٩٠٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٦٥ = ٢٨٣٠، ٥٧٣٢. تحفة الأشراف: ١٧٢٨}:

حەفصەی کچی سیرین فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی پێم: یەحیای کوڕی سیرینی برات بەچی مرد؟ عەرزیم کرد: بەتاعوون مرد، حەفصە فەرمووی: کەوام گوت، ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (ئەو موسوڵمانەی کەبەهۆی تاعوونەوە بمرێ شەهیدە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٣٢}.

**روونکردنەوە:**

١ - بەچەند جۆرێ واتای تاعوون کراوە، زۆرینە دەفەرموون جۆرە دوومەڵێکی ژەهراوییە، لەشوێنە چڵکگرو لۆچاویو نەرمەکانی لەش دەردەچیٚو پەرە دەسێنیٚو ژەهرەکەی دەگاتە ناو دڵو دەیکوژێ، پەتایەکی مەترسیدارە، زۆر بەخێرایی تەشەنە دەکاو دەتەنێتەوە. هەندێ تر دەفەرموون: هەموو پەتایێ کە کوژەر بیٚو مەردوم پێی بمرێ تاعوونە، وەك کۆلێرەو رشانەوەو پەتای باڵندەو پەتای بەراز.

٢ - حەفصەو یەحیاو موحەممەد، خوشكو بران، هەرسێکیان مناڵی سیرینن، کەسیرین ناسراوە بە ئەبو عەمرە، حەفصە بەصرەییە، تابیعییە، راستگۆو متمانە پێکراو بووە، لەدوازدە ساڵیدا قورئانی خەتم کردووە، لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەسەدویەکی کۆچیدا مردووە، فەرموودەی لەم زاتانەوە گێڕاوەتەوە: لە یەحیای برایو لە ئەنەسی کوڕی مالیكو لەئوم عەطییەو لەدایکی حەسەنی بەصرییەوە کەناوی خیرە بوو. {بڕوانە: ژمارە: ٨٤٩ ژیننامەی موحەممەدی ئیبن سیرینی برای خاتوو حەفسە}.

## ٨٦١) خودا لەهەموو گوناهێکی شەهید خۆش دەبێ بێجگە لەقەرز (٤٨٥٧ - ٤٨٦١)
## بابٌ: يُغفرُ للشّهيد كُلُّ ذنب إلاّ الدّيْن

١٠٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهما) أَنَّ النبي (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « يُغْفَرُ لِلشَّهِيد كُلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ ». {الحديث: ٤٨٦٠ = ٤٨٤٥ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لەهەموو گوناهێکی شەهید خۆش دەبێ بێجگە لە گوناهی قەرزارییی).

١٠٨٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُول اللَّه (صلى الله عليه وسلم): أَنَّهُ قَامَ فِيهِمْ فَذَكَرَ لَهُمْ أَنَّ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالإِيمَان باللَّه أَفْضَلُ الأَعْمَالِ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْت إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّه تُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ، إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللَّه وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « كَيْفَ قُلْتَ »؟ قَالَ: أَرَأَيْت إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّه أَتُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إِلاَّ الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيل عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَالَ لِي ذَلِكَ ». {الحديث: ٤٨٥٧ = ٤٨٤٢ فم}:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو یارانا هەڵسایەوە وتارێکی دا، باسی گەورەیی خەباتی دەکرد بۆیان، فەرمووی: (غەزاو خەبات لەڕێگەی خودادا، لەپاش باوەڕی تەواو بەخوداو بە پێغەمبەری خودا باشترین کرداری موسوڵمانە!).

پیاوێ هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەواڵم پێ بدەو پێم بفەرموو ئەگەر من لەپێناوی ڕەزای خودادا بکوژرێم ئایا بەوە لەگوناه پاك دەبمەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ بەمەرجێ ددان بەخۆتدا بگریتو خۆڕاگر بیتو پاداشی خۆت بەس لەخودا داوا بکەیتو ڕووبەڕووی دوژمن بیت لەکاتی جەنگینداو پشتی تێ نەکەیتو پشت هەڵ نەکەیتو هەڵ نەیەیت لەبەرەی شەڕا).

پاشان پێی فەرموو: (چۆنت گوت؟) پیاوەکە عەرزی کردەوە: عەرزم کردی: ئەگەر من لەپێناوی خودادا بکوژرێم ئایا ئەوە لەگوناه پاکم دەکاتەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ بەمەرجێ ددان بەخۆتدا بگریتو خۆڕاگربیتو پاداشی خۆت بەس لەخودا داوا بکەیتو رووبەڕووی دوژمن بیت لەکاتی جەنگینداو پشتی تێ نەکەیتو پشت هەڵ نەکەیتو هەڵ نەیەیت لەبەرەی شەڕا، تەنیا قەرزاری نەبی، قەرز بەشەهید بوونیش پاك نابێتەوە، چونکە جوبرائیل (سەلامی خودای لەسەر بێ) ئاوای بەمن فەرموو). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٢٢٥، چ/٤} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ١٨٩١، ١٨٩٢، چاپی چوارەم} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١٣} .

## ٨٦٢) کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە. (٣٥٨ - ٣٦٠)

## بابٌ: منْ قُتل دُون ماله فهُو شهيدٌ

١٠٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: « فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: « قَاتِلْهُ »، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: « فَأَنْتَ شَهِيدٌ »، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: « هُوَ فِي النَّارِ ». {الحديث: ٣٥٨ =٣٧فم} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر زەلامێ هات ویستی بەزۆر ماڵی حەڵاڵی خۆم ببات بۆ خۆی من چی بکەم؟ فەرمووی: (ماڵی خۆتی مەدەرێ!) گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر ئەو کابرایە لەسەر ئەوە چوو بەگژما؟ فەرمووی: (تۆیش بچۆ بەگژیدا) گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەم حاڵەدا ئەو منی کوشت، جێگەم کوێیەو پایەم چییە؟ فەرمووی: (تۆ شەهیدیتو جێگەت بەهەشتە). گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەحاڵی وادا من ئەوم کوشت، لەهەلو مەرجی ئاوادا ئەو جێگەی کوێیە؟ فەرمووی: (ناو کلۆرەی دۆزەخە!). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٥، ژمارە: ١٣٥٧} + {تجرید/٣، ژمارە: ١٠٧٣ = ٢٤٨٠} .

## ٨٦٣) فەرمایشتی خودای گەورە: {رجالٌ صدقُوا ما عاهدُوا اللّه عليْه} (٤٨٩٠ - ٤٨٩٥)

## بابٌ: فِى قوْلِهِ تعالى: {رجالٌ صدقُوا ما عاهدُوا اللّه عليْه}

١٠٨٧- عَنْ ثابتٍ قَالَ: قَالَ أَنسٌ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): عَمِّيَ الَّذِى سُمِّيتُ بِهِ لَمْ يَشْهَدْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَدْرًا، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيْهِ، قَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ شَهِدَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غُيِّبْتُ عَنْهُ، وَإِنْ أَرَانِىَ اللَّهُ عز وَجَلَّ مَشْهَدًا فِيمَا بَعْدُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، لَيَرَانِىَ اللَّهُ تعالى مَا أَصْنَعُ، قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، قَالَ: فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ لَهُ أَنسٌ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ؟! فَقَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الْجَنَّةِ أَجِدُهُ دُونَ أُحُدٍ، قَالَ: فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ، قَالَ: فَوُجِدَ فِى جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، قَالَ: فَقَالَتْ أُخْتُهُ: عَمَّتِىَ الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِى إِلاَّ بِبَنَانِهِ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً) قَالَ: فَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ وَفِى أَصْحَابِهِ. {الحديث: ٤٨٩٥ = ٤٨٨٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٥٦ = ٢٨٠٥، ٤٠٤٨، ٤٧٨٣. ترمذي. تفسير: ٣٢٠٠. تحفة الأشراف: ٤٠٦}:

ثابیت (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەنەسی کوری نەضری مامەم، کەمن بەناوی ئەوەوە ناونراوم، ئامادەی غەزای بەدر نەبوو بوو لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) وە ئەوەی زۆر بەلاوە زەحمەت بوو، بۆیە فەرمووی: یەکەم جەنگێ کە پێغەمبەری خودا ئامادەی بوو، لەگەڵ بێباوەڕاندا، بەنسیبی من نەبوو، کە هاوبەشی ئەو جەنگە پیرۆزەیە بکەم، جا ئەگەر خودا فرسەتی دامو ئامادەی جەنگێ تر بووم لە ئایندەدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا، لەدژی بێباوەڕان، ئەوکاتە خودای گەورە دەمبینێ کەچۆن جەنگێ دەکەم!

ئەنەس فەرمووی: مامەم ئاوا بەرەهایی باسی جەنگینی خۆیی کرد، لە ئایندەدا، وە بەڵێنی جۆرە شەڕکردنێکی تایبەتی نەدا، لەترسی ئەوەی ئەگەر بەڵێنی وابدا بۆی نەچێتە سەر!

فەرمووی: جاكاتێ ڕووداوی ئوحود ڕوویدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا ئامادەی ئەم نەبەردە بوو، وارێكەوت زوربەی موسوڵمانەكان شكانو دەوری حەزرەتیان چۆڵ كرد، جا لەكاتی هێرش بردندا، سەعدی كوڕی موعاز، ڕووبەڕووی مامەم دێو بەرەودوا رادەكا، ئەنەسی مامەم پێی دەفەرموێ: ئەی باوكی عەمر! ئەی سەعد! بۆ كوێ، واتە: بۆ هەڵ دێیت؟ ئەوجا مامەم دەفەرموێ: ئۆخەی لەم بۆنو بەرامەی بەهەشتە، كە لەلای ئوحودەوە دەمار دێ بەسەرما!! فەرمووی: ئیتر دەجەنگێ لەگەڵیانا هەتا دەكوژرێو شەهید دەبێ. فەرمووی: لەپاش تەواوبوونی شەڕەكە، كە تەرمەكەیان دۆزییەوە، تەماشایان كرد هەشتا زیاتر برینی پێوە بوو، لەجێگەی دەمی شیرو دەمە تیرو پێكانی ڕمو پەیكان!

ئەنەس فەرمووی: ڕوبەییعی نەضری خوشكی، كە پووری منیشە، فەرمووی: لەشەكەی وا شێوابوو، بەسەرە پەنجەكانیدا لاشەی براكەمم ناسییەوە! جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا – ٢٣/٣٣ - أحزاب}:

واتە: پیاو گەلێ لەبڕواداران، ئەو بەڵێنەی كەداویانە بەخودای گەورە، سەر ڕاستانە جێبەجێی دەكەنو بەڵێنیان ڕاستە، بازێ لەمانە مردوونو بەڕووی سوورەوە چوونەتەوە دیوانی خوداوە هەشیانە بەردەوامە لەسەر بەڵێنی خۆیو چاوەنواڕنو بێ وادەو بێ بەڵێن دەرنەچوون).

فەرمووی: جا بۆیە یاران لەو باوەڕەدا بوونو دەیانگوت: كە ئەم ئایەتە بۆ شەرحی حاڵی ئەوو وێنەی ئەو دابەزیوە. {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٠٣٩} + {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٠٨، ژمارە: ١٣٠٢}.

### ٨٦٤) كەسێ جەنگ بكا هەتا شەریعەتی خودا سەربكەوێ. (٤٨٩٦ - ٤٨٩٩)
### باب: مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا

١٠٨٨- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ،

وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ أَعْلَى فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ». {الحديث: ٤٨٩٦ = ٤٨٨١ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٦٠ = ٢٨١٠، ٤٥٨. أبو داود. جهاد: ٢٥١٧. ترمذي. جهاد: ١٦٤٦. نسائي. جهاد: ٣١٣٦. تحفة الأشراف: ٨٩٩٩}:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە عەرەبە دەشتنشینەکان هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: پیاوی واهەیە بۆ تالانو دەستکەوت شەڕدەکا، پیاوی واهەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕدەکا، پیاوی واهەیە دەجەنگێ تا شوێنی دیاربێو بڵێن ئازایە، ئەمانە کامەیان لەبەر رەزای خودایە؟! فەرمووی: (هەرکەسێ بجەنگێ هەتا یاسانامەی خودای گەورە سەربکەوێ، ئەوە لەبەر رەزای خودایە). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٤٣٥٠، چ/٤}.

### ٨٦٥) کەسێ بۆ رواڵەتیو ناوو شۆرەت بجەنگێ. (٤٩٠٠ - ٤٩٠١)

### باب: مَنْ قَاتَلَ لِلرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ

١٠٨٩- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ لَهُ نَاتِلُ أَهْلِ الشَّامِ أَيُّهَا الشَّيْخُ! حَدِّثْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا فَعَلْتَ فِيهَا؟ قَالَ تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا، إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ، قَالَ: كَذَبْتَ،

وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: هُوَ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ». {الحديث: ٤٩٠٠ = ٤٨٨٥ فم}:

سولەیمانی کوڕی یەسار (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەشاماتەکە لەدەوری ئەبو هورەیرە بوون، بڵاوەیان لێ کرد، لەوکاتەدا، ناتیلی شامی کوڕی قەیسی ئەلحزامی، کە خەڵکی فەلەستین بوو، کە گەورەو ریش سپیی هۆزەکەی بوو، عەرزی ئەبو هورەیرەی کرد: ئەی مامۆستای گەورە! فەرموودەیەکم پێ بفەرموو، کە بۆخۆت لە پێغەمبەر خۆیت بیستبێ؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درووودی خودای لەسەر بێ): (یەکەم کەسێ کە لەرۆژی قیامەتدا مەحکەمەو دادگایی دەکرێو حوکم دەدرێ، پیاوێکە شەهید کراوە، دەیهێنن لەبەردەم خودادا رایدەوەستێنن، خودا چاکەکانی خۆیی، کە لەگەڵ ئەو پیاوەدا کردوویەتی، یەکە یەکە بیردەخاتەوە، ئەویش یەك بەیەك پێیان لێ دەنێ، جاخودا دەفەرموێ: باشە لەباتی ئەو چاکانە تۆ چی کارێکی باشت کردووە بۆ ڕەزای من؟ دەڵێ: منیش لەپێناوی تۆدا جەنگم کردووە لەگەڵ دوژمنی تۆدا، شەڕم کردووە هەتا لە ئەنجاما بەدەستی دوژمن شەهید کراوم! خودای گەورە دەفەرموێ: درۆتکرد، بەڵام تۆ بۆیە غەزات کردووە هەتا بڵێن: ئازایە، وە ئەم قسەشیان لەجیهاندا پێ گوتوویت (واتە: تۆ بەمافی خۆت گەیشتوویت!).

جا ئەوجا خودا فەرمان دەدا لەسەر روو بەکێشی دەکەن تا تووڕی دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وە دووەم کەس کە دادگایی دەکرێ، پیاوێکە لەجیهاندا زاناو مامۆستاو قورئان خوێن بووە، دەیهێنن، خودا هەرچی چاکەیەکی لەگەڵ کردووە دەیانخاتەوە بیری، ئەویش یەك بەیەك پێیان لێ دەنێ! جا خودا دەفەرموێ: باشە تۆ لەباتی ئەوانە چی کارێکی باشت کردووە لەبەر خاتری من؟ دەڵێ: منیش عیلمو زانست فێربوومو خەڵکی ترم فێری زانین کردو لەبەر رەزای تۆیش قورئانم دەخوێند، دەفەرموێ: درۆ دەکەی، بەڵام تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن: زانایە. وەبۆیە قورئانیشت خوێندووە تابڵێن: قورئان خوێنە، وە ئەم قسەیەشیان لەدنیادا

پێ گوتوویت، ئەوجا بەفەرمانی خودا لەسەر سك بەكێشی دەكەن‌و تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە، سێیەم كەس كە دادگایی دەكرێ پیاوێكە كەخودا لەدنیادا داراو دەوڵەمەندی كردووەو لەهەموو چەشن‌و جۆرەماڵێكی پێ داوە، كە دەیهێنن خودا هەموو چاكەكانی خۆیی وەبیر دەخاتەوە، ئەویش پێیان لێ دەنێ، دەفەرموێ: چیت پێ كردن؟ دەڵێ: هەرچی تۆ پێت خۆش بێ، كەماڵی تیا بەخت بكرێ لەوەدا ماڵی خۆمم خەرج كردووە، دەفەرموێ: درۆدەكەی، بەڵام تۆ بۆیە وات كردووە تا بڵێن سەخی‌و جەوامێرە، وە ئەو قسەیەش لەدنیادا كراوە، ئەوجا بەفەرمانی خودا لەسەردەم رای دەكێشن‌و دەیبەن تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٩٤، چ/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٨، ژمارە: ١٦١٧}.

**روونكردنەوە:**

لێرەدا بۆئەوەی كەشتەكە لە خوێنەری بەڕێز نەشێوێ عەرزتان دەكەین: (هەڵسان بەئەنجام دانی كاری باش‌و دووركەوتنەوە لەگوناهو تاوان بەنیازی ئەوە كە هەم پەرستشێكی جوان بێ‌و هەم مایەی ناوی باش‌و وەسپی جوانی مەردووم بێ، بەر هەڕەشەی ئەم فەرموودەیە ناكەوێ، وەك لەم فەرموودەی تری موسلیمدا دەفەرموێ: ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەت كرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو: هەندێ كەس هەندێ كاری باش دەكەن‌و خەڵكی تر لەكارەكەیان رازین‌و لەسەرئەوە وەسپی جوانیان دەكەن، جا ئایا ئەوە زیانی دەبێ بۆیان؟ فەرمووی: (نەء، بەڵكوو ئەو شۆرەتە جوان‌و پەسنە باشە، نۆبەرەی مزگێنی موسوڵمانە، لەجیهاناو ناوو شۆرەتی جوان‌و لەژینەوەدا پاداشی باش، دەی چی لەوە باشتر دەبێ، وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ — یونس/١٠/٦٢ - ٦٤}.

{بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٤٩٢٤ + تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٣٩١٧} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٩، ژمارە: ١٦٢١} + {مسلم: ٢٦٤٢ = ٦٦٦٣ شرح نووی}.

**٨٦٦) زۆریی پاداش لەسەر جەنگین لەرێگەی خوادادا.** (٤٨٩٠ - ٤٨٩٥)

**بابٌ: كثرة الأجْر على القتال**

١٠٩٠- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِى النَّبِيتِ قَبِيلٍ مِنَ الأنْصَارِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّكَ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. ثُمَّ تَقَدَّمَ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « عَمِلَ هَذَا يَسِيرًا، وَأُجِرَ كَثِيرًا ». {الحديث: ٤٨٩١ = ٤٨٧٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٥٨ = ٢٨٠٨}:

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی بەنی نەبیتی هات، بەنی نەبیت تیرەیەکن لە ئەنصار، عەرزی حەزرەتی کرد: شایەتی دەدەم کە لەیەزدانی پاك بەولاوە خودای ترنییە، وە تۆیش ئەی موحەممەد! بەندەو پێغەمبەری ئەویت! ئەوجا چووە پێشەوەو خۆی کرد بەکۆڕی شەڕداو جەنگی کرد هەتا کوژرا، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە کارێ کەمی کردو پاداشێ زۆری برد!).

{تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٣٣١، ج/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١٠}.

**روونکردنەوە:**

ئەم پیاوە بەرابەر بەهێنانی یەك شایەتمان ژیانی نەبڕاوەی ناو بەهەشتی بەرینی بۆ خۆی مسۆگەر کرد، لەسەر فەرمایشتی فەتحولباری ئەم پیاوە ناوی عەمری ثابیتی کوڕی وەقش بووە، ناسراوە بە (ئەحرەمی کوڕی عەبدول ئەشهەل). دەگێڕنەوە بەڕشتەیەکی دروست (صحیح) لەئەبو هورەیرەوە فەرموویەتی بە برادەرانی خۆی، لەسەر شێوەی مەتەڵ: (ئەو پیاوە موسولمانە کێیە کە قەت نوێژی نەکردووەو چووەتە بەهەشتەوە؟!) کە مەبەستی ئەبو هورەیرە ئەم عەمری کوڕی قەیسە بوو.

**٨٦٧) غەزاکارو جەنگاوەر، ئەگەر پێکرا، یا بەسەلامەتیو دەسکەوتی جەنگەوە گەڕایەوە.** (٤٩٠٢ - ٤٠٣)

**بابٌ: مَنْ غزا فأُصيب أوْغنمَ**

١٠٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فَتَغْنَمُ وَتَسْلَمُ إِلاَّ كَانُوا قَدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَىْ

أُجُورِهِمْ، وَمَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تُخْفِقُ وَتُصَابُ إِلاَّ تَمَّ أُجُورُهُمْ ». {الحديث: ٤٩٠٢ = ٤٨٨٨ فم. أبو داود. جهاد: ٢٤٩٧. نسائي. جهاد: ٣١٢٥. ابن كاجة. جهاد: ٢٧٨٥. تحفة الأشراف: ٨٨٤٧} :

عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کۆمەڵە موسوڵمانێ، کەم بن یا زۆر، بچن بۆ غەزایێو لەو غەزایەدا تالانیو دەستکەوتیان دەست بکەوێ، بەلام بەبێ زیان، بە سەلامەتی بگەڕێنەوە، ئەوە پێشەکی دوو سێیەکی پاداشی باشی خۆیان وەرگرتووەو یەك لەسەر سێی پاداشی باشیان ماوە بۆ قیامەتیان!

بەلام ئەگەر سەرنەکەوتنو دەسکەوتو تالانیان دەست نەکەوت، بەڵکوو پێکرانو لێیان زامار بوو، یا لێیان شەهید بوو، ئەوە پاداشی باشی تەواویان بۆ حلێب دەکرێو بەتەواوی لە قیامەتا وەری دەگرن). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٦. چاپی چوارەم} .

## ٨٦٨) پاداشی کەسێ تفاقو چەك بۆ جەنگاوەری دابین بکا (٤٨٧٦ - ٤٨٨٤)
## باب: أجْرِ مَنْ جهّزَ غازيا

١٠٩٢- عَنْ زَيْدِ بْنِ خالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رضي اللهُ عنهُ) عَنْ رسُول اللّه (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « مَنْ جهَّز غازِيًا في سَبِيلِ اللّه فَقَدْ غَزا، ومنْ خلفهُ في أَهْلِه بِخيْرٍ فقَدْ غَزَا ». {الحديث: ٤٨٧٩ = ٤٨٦٤ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٧١ = ٢٨٤٢} :

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کە لەبەر ڕەزای خودا خەباتگێڕێ تەدارەك بکاو چەكو تفاقی بۆ ئامادەبکا، ئەوە وەك ئەوە وایە کەخۆی بچێ بۆ غەزا، وە ئەوەی کە بە باشە سەرپەرشتی خێزانی تێکۆشەرێ بکا، کە بۆ ڕەزای خودا چووبێ بۆ غەزا، وەك ئەوە وایە کەخۆی بچێ بۆ غەزا). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٠٩، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٠٦/٢٢ - ٣٦١} + {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٣٤٦ — ش/ت — ج/٤ = چاپی چوارەم} .

**روونكردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەروونكردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمووێ: {وَفِي هَذَا الحَدِيثِ الحَثُّ عَلَى الإِحْسَانِ إِلَى مَنْ فَعَلَ مَصْلَحَةً لِلْمُسْلِمِينَ أَوْ قَامَ بِأَمْرٍ مِنْ مُهِمَّاتِهِمْ}.

واتە: لەم فەرموودەیەدا هاندان هەیە لەسەر چاكەكردن لەگەڵ كەسێ بەرژەوەندییەك بۆ موسوڵمانان دابین بكا، یاخۆی كارێكی گرنگ بۆ گەلی ئیسلام ئەنجام بدا. بەپێی ئەم روونكردنەوەیەی نەوەوی:

١. كەسێ یارمەتی فەقێو مامۆستای ئایینی بدا، كە خۆیان تەرخان كردووە بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، وەك ئەوە وایە كەخۆی فەقێ بێ، یا مەلابێ.
٢. كەسێ یاریدەی سەرۆكی دادپەروەر بدا، كە ملەت لە سێبەری دادپەروەریی ئەودا حەوابێتەوە، لەقیامەتا ئەویش بەقەد ئەو سەرۆكە خێرو پاداشی باشی بۆهەیە.
٣. كەسێ یاریدەی حافظو قورئان خوێن بدا، ئەوە وەك ئەوە وایە كەخۆی خەریكی خزمەتو لەبەركردنو خوێندنی قورئان بێ.
٤. هەروەها كۆمەكیو یاریدەی خێزانی ئەم زاتانەش وەك یاریدەدەری خێزانی غەزاكار وایە.

**٨٦٩) كەسێ تفاقی جەنگ ئامادە بكاو دوایی نەخۆش بكەوێ، بابیدات بەكەسێكی تر كەخۆی بچێ بۆ غەزا. (٤٨٧٦ - ٤٨٨٤)**

**بابٌ: فِيمَنْ تَجَهَّزَ فَمَرِضَ فَلْيَدْفَعْهُ إلى مَنْ يَغْزُو**

١٠٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ فَتًى مِنْ أَسْلَمَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أُرِيدُ الْغَزْوَ، وَلَيْسَ مَعِي مَا أَتَجَهَّزُ بِهِ قَالَ: « ائْتِ فُلاَنًا، فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ تَجَهَّزَ، فَمَرِضَ»، فَأَتَاهُ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ وَيَقُولُ: أَعْطِنِي الَّذِي تَجَهَّزْتَ بِهِ، قَالَ: يَا فُلاَنَةُ أَعْطِيهِ الَّذِي تَجَهَّزْتُ بِهِ، وَلاَ تَحْبِسِي عَنْهُ شَيْئًا، فَوَاللَّهِ لاَ تَحْبِسِي مِنْهُ شَيْئًا فَيُبَارَكَ لَكِ فِيهِ. {الحديث: ٤٨٧٨ = ٤٨٦٣ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لاوێ لەهۆزی ئەسلەم، عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من دەمەوێ بچم بۆ غەزا، بەلام تفاقی ئەوەم نییە، فەرمووی: (بچۆ بۆلای فیسارە کەس، ئەو تفاقی غەزای ئامادە کردبوو کە بچێ بۆ غەزا، بەلام نەخۆشکەوت). لاوەکەیش چوو بۆلای‌و پێی گوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوی لێ دەکردی‌و دەیفەرموو: (ئەو کەرەستەو تفاقەی ئامادەت کردووە بۆ غەزا بیدە بەمن). پیاوەکەیش بە هاوسەکەیی گوت: کچێ ئەو تفاقەی کە بۆخۆمم ئامادە کردبوو، هەمووی بدەم بەم پیاوە، سوێندم بەخودا هەرشتێکی لێ گل بدەیتەوە پیت‌و فەڕی تێ ناکەوێ بۆت. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٠٨ + ریاض/١، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٧٦، لاپەڕە: ١٦٦، چ/٢}.

## ٨٧٠) قەدرو ڕێزی پیاوانی تێکۆشەرو خەباتگێر. (٤٨٨٥ - ٤٨٨٧)

## باب: حُرْمَة الْمُجَاهِدِين

١٠٩٤- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِى أَهْلِهِ فَيَخُونُهُ فِيهِمْ، إِلاَّ وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ، فَمَا ظَنُّكُمْ ». {الحديث: ٤٨٨٥ = ٤٨٧٠ فم. أبو داود. جهاد: ٢٤٩٦}:

سولەیمانی کوڕی بورەیدە فەرمووی: بورەیدەی باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حورمەت‌و ڕێزو قەدری ژنی پیاوانی تێکۆشەرانی ڕێگەی خودا، لەسەر ئەو پیاوانەی لەماڵەوە دەمێننەوەو ناچن بۆ غەزا، وەکوو حورمەت‌و ڕێزو قەدری دایکی خۆیان وایە، هەر پیاوێکی نیشتەجێی ماڵەوە سەرەوکاریی کەسوکاری پیاوێکی تێکۆشەر بکا، بەلام لەهەمان کاتا گزی‌و ناپاکییان لەگەڵدا بکا، ئەوە لەرۆژی قیامەتدا ئەو گزیکارە رادەگرن بۆ ئەو غەزا کارە، بە ئارەزووی خۆی کێشە لەخێرو خێراتی دەکاو دەیبا بۆ خۆی! جا ئایا بەبیری ئێوە ئەو تێکۆشەرە لەو ڕۆژەدا هیچی بۆ دەهێڵێتەوە، یاهەموو خێرو چاکەکانی دەبا بۆ خۆی!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٣٤٩}.

**٨٧١) سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەر: {لا تَزالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ}. (٤٩٢٧ - ٤٩٣٥)**

**باب: في قوله (صلى الله عليه وسلم): {لا تزالُ طائفةٌ مِنْ أمّتي ظاهرين على الحقِّ حتى تقوم الساعةُ}**

١٠٩٥- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ ». {الحديث: ٤٩٢٧ = ٤٩١٢ فم}:

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کۆمەڵێك، لەم گەلی منە، بە سەربەرزی بەردەوام دەبن لەسەر ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، هەلگری ئالای هەق دەبن، چین لەپاش چین، هەتا نزیکی هاتنی قیامەت، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ!)

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ کەخودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا، شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە کە ئەم فەرمایشتو شەریعەتە دابەش بکەمو بەس، بەلاّم بەشی گەورە یابچووك ئەوە بەدەست خودا خۆیەتیو خودا خۆی ئەو بڕیارە دەدا، وە ئەم گەلی ئیسلامەیش هەر بەردەوام دەبن بەسەر بەرزی لەسەر ئەم ئایینی خودایە، هەتا نزیکی ڕۆژی قیامەت، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ!). {تەجریدی بوخاری بەرگی یەکەم، ژمارە: ٦٣ = ٧١، ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠ + تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٩٨ + تاج/٥، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٥٦٠٢ + تاج/٤، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٤٣٥٩، ج/٤}.

١٠٩٦- عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شُمَاسَةَ الْمَهْرِيُّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مَسْلَمَةَ بْنِ مُخَلَّدٍ، وَعِنْدَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ، هُمْ شَرٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يَدْعُونَ اللَّهَ بِشَيْءٍ إِلاَّ رَدَّهُ عَلَيْهِمْ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ لَهُ مَسْلَمَةُ: يَا عُقْبَةُ اسْمَعْ مَا يَقُولُ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ عُقْبَةُ: هُوَ أَعْلَمُ، وَأَمَّا أَنَا فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ تَزَالُ

عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللَّهِ قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ، وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ ». فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَجَلْ. (ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا كَرِيحِ الْمِسْكِ، مَسُّهَا مَسُّ الْحَرِيرِ، فَلاَ تَتْرُكُ نَفْسًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنَ الإِيمَانِ إِلاَّ قَبَضَتْهُ، ثُمَّ يَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، عَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ). {الحديث: ٤٩٣٤ = ٤٩١٩} :

عەبدوڕەحمانی کوڕی شوماسەی ئەلمەهری فەرمووی: لەخزمەتی مەسلەمەی کوڕی موخەللەددا بووم، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصیش لەوێ بوو، عەبدوڵڵا فەرمووی: قیامەت لەسەر بەدترینی دروستکراوانی خودا هەڵ دەستێ، تەنانەت ئەو چینەی کە قیامەت لەسەر ئەوان هەڵ دەستێ لەخەڵکی سەردەمی نەزانیو نەفامی پێش هاتنی ئیسلامیش خراپترو بەدترن، هەرچی لەخودا داوادەکەن خودا بەپێچەوانەوە پێیان دەدا، ئەوا ئەوان خەریکی ئەم گفتوگۆیانە بوون، عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) هات بەسەردا، مەسلەمە پیی گوت: ئەی عوقبە! گوێت لێیە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر چی دەڵێ، عوقبە فەرمووی: بەڵێ ڕاستە کە ئەو لەمن زاناترە، بەلام من بەش بەحاڵی خۆم، لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (گرۆیی لە نەتەوەی ئیسلامی من، هەرخەبات دەگێڕنو بە ئاشکراو بەبێ پەروا، لەپێناوی سەرکەوتنی یاسانامەی خودادا دەجەنگن، دوژمنی خۆیان دەبەزێنن، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ، ئەمانە چین لەدوای چین هەروا لەسەر هەقو بەرگریی لەهەق بەردەوام دەبنو دەمێنن هەتا نزیکی هاتنی قیامەت).

عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ ئەمەی کە عوقبە لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە، لەبارەی ئەم کۆمەڵەوە. وەك دەفەرموێ وایە، بەلام ئەم فەرموودەیە ئەم تەواوکەرەیشی هەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەیشی فەرموو: (لەپاشا خودا کزە بایێ دەنێرێ، بۆنی وەك بۆنی میسك خۆشە، نەرمە بایەکە بۆ نەرمی دەڵێی ئاوریشمی نەرمە، ئەو کەسەی بەقەد تۆوی خەرتەلەیێ، ئیمانو باوەڕ بەخودا لەدڵیا بێ گیانی دەکێشێ، ئیتر هەر خەڵکە بەدکارەکە دەمێننەوەو قیامەت لەسەر ئەوان هەڵ دەستێ!).

**روونكردنەوە:**

١. بۆ چۆنێتیو كاتو شوێنی ئەم نەرمە بایە بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٨ = مسلم. إيمان: ٣٠٨.

٢. بۆ ناسینی (شِرَارُ الخَلْق) بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٩ = مسلم. فتن: ٧٣٢٨.

٣. بۆ نموونەی كەمترین باوەڕ بە خودای گەورە بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٥٧٠٥ = تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری/١، لاپەڕە: ٤١، رقم: ٢١ = ٢٣، ٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦٠، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٧٤٣٩ فتح الباری + مسلم. إيمان: ٤٥٨ + تاج/٥، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٥٧٠٧، ج/٤ = مسلم. إيمان: ٤٧٧ + بخاری. إيمان: ٤٤ = تجريد/١، لاپەڕە: ٦٣، رقم: ٤١ = ٤٤٧٦، ٦٥٦٥، ٧٤١٠، ٧٥٠٩، ٧٥١٠، ٧٥١٦ فتح الباری شرح صحيح البخاری.

٤. ئەوەی كە عەبدوڵڵای كوڕی عەمر دەفەرموێ: هەرچی لەخودا داوا دەكەن خودا بە پێچەوانەوە دەیان داتێ) ئەوە لەپێش هاتنی ئەم كزە بایەدایە، كە بەرە بەرە زۆرینەی خەڵك خراپ دەبنو تاكو تەرا نەبێ، ناوی خودا نامێنێ مەگەر بۆ سوێنێ درۆ، بەڵام پاش هاتنی ئەم بایە ناوی خودا لەسەر رووی زەوی دەسڕێتەوە. بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٨٠ = مسلم. إيمان: ٣٧٣، ٣٧٤ تەرقیمی شێخ خەلیل مەئموون شیحا.

٥. جا كاتێ ئەم جێگایانەمان هەموو رەچاو كرد، ئەوجا دەزانین كەواتای یاسای (الحديثُ يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضاً) واتای چییە، هەروەك فەرموودە زانە گەورەكان هەمیشە رەچاوكردنی ئەم لایەنانەی فەرموودەیان كردووە ئەوسا شەرحو راڤەی فەرموودەكانیان كردووە. ئەوەتا بەنموونە، ئیمامی عەسقەلانی بۆ شەرحی حەدیثەكانی صەحیحی بوخاری استشهاد واستدلال، بەهەموو حەدیسێ كە پەیوەندی بە بابەتەكەوە ببێ دەكا، وەك موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو... تاد.

١٠٩٧- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَزَالُ أَهْلُ الْغَرْبِ ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ ». {الحديث: ٤٩٣٥ = ٤٩٢٠ فم}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خەڵکی خۆرئاوای وڵاتی حیجاز هەتا هاتنی قیامەت هەر بەردەوام دەبن لەسەر هەقو بە ڕاشکاوی لایەنی هەق دەگرن!).

## ٨٧٢) باسی دوو پیاو یەکێکیان یەکێکیان دەکوژێو هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت. (٤٨٦٩ - ٤٨٧١)

## باب: في رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحدُهُمَا الآخرَ يدْخُلاَنِ الجنَّةَ

١٠٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَضْحَكُ اللَّهُ لِرَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، كِلاَهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ » قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « يُقْتَلُ هَذَا فَيَلِجُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الآخَرِ، فَيَهْدِيهِ إِلَى الإِسْلاَمِ، ثُمَّ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ ». {الحديث: ٤٨٧١ = ٤٨٥٦ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاری ئەم دوو پیاوە ئەوەندە سەیرو عەنتیکەیە، خودای گەورە بۆ خۆی پێکەنینی پێیان دێ، ئەوەندە کەیفی بەکارەکەیان دێ: یەکێکیان ئەویتریان دەکوژێ، کەچی هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت! لەپێشا یەکەمیان لە ڕێگەی خودادا دەجەنگێ هەتا بەدەستی ئەویتریان دەکوژرێ، لەپاشا بکوژەکەش تەوبە دەکاو خودا پەشیمانی لێ گیرادەکاو ڕێنمایی دەکا بۆ ئیسلامەتیو دەچێ بۆ خەباتو غەزا لەڕێگەی خوداداو ئەویش شەهید دەکرێو لەئەنجامدا کوژراوی یەکەمو بکوژەکەی (کە ئەویش شەهید دەکرێ) هەردوولا پێکەوە دەچنە بەهەشت). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٣ — ش = شەیخان = بوخاریو موسلیم} + {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٦٢ = ٢٨٢٦ فتح}.

## ٨٧٣) كەسێ بێباوەڕێ بكوژێ، لەپاشا پابەندبێ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەجوانی. (٤٨٧٢ - ٤٨٧٣)

## باب: مَنْ قَتَلَ كافراً ثُمَّ سَدَّدَ لَمْ يَدْخُلِ النَّار

١٠٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَجْتَمِعَانِ فِي النَّارِ اجْتِمَاعًا يَضُرُّ أَحَدُهُمَا الآخَرَ »، قِيلَ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « مُؤْمِنٌ قَتَلَ كَافِرًا ثُمَّ سَدَّدَ ». {الحديث: ٤٨٧٣ = ٤٨٥٨ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەم دوو جۆرە كەسە لەدۆزەخا كۆنابنەوە، كۆبوونەوەیەكی وا كە یەكێكیان ببێ بە مایەی زیان بۆ ئەوی تریان). عەرزیكرا: ئەوانە كێن؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (موسوڵمانێ بێباوەڕێ بكوژێ، چ بەهەق بیكوژێ، چ بەناهەق بیكوژێ، لەپاشا موسوڵمانەكە تاسەر بەجوانیو بە ڕێكوپێكی پابەندبێ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە هەتا لەسەر ئەو حاڵە دەمرێ).

**ڕوونكردنەوە:**

لە شەرحەكانا كێشەیەكی گەورەیان سەبارەت بەمەبەست لەم فەرموودەیە دروست كردووە، بەڵام وادەزانم مەبەستەكە ئەمەیە: (موسوڵمان لەدوو حاڵەتا ناموسوڵمان دەكوژێ:

أ/ لەسەر هەق، وەك كاتی غەزاو تۆڵە سەندنی یاسایی، لەم كاتەدا بەكۆی ڕا، ناموسوڵمانەكە دۆزەخییە، چونكە بێباوەڕە، بەڵام موسوڵمانەكە لەسەر ئەو كوشتنەی ئەو ناچێتە دۆزەخ، چونكە لەسەر هەق كوشتوویەتی، بەڵكوو پاداشی باشی بۆ هەیە.

ب/ لەسەر ناهەق دەیكوژێ، وەك كوشتنی پەیماندارێكی خاوەن نامە، بەبێ مەهانەی یاسایی، لەكاتی وادا ناموسوڵمانە كوژراوەكە دۆزەخییە، چونكە بێباوەڕە، بەڵام موسوڵمانە بكوژەكەی ئەم دوو حاڵەتەی بۆ هەیە:

١. وەك بەناهەق ناموسوڵمانە پەیماندارەكەی كوشتووە، تەوبەش ناكاو لەسەر ملهوڕیو تاوانباری خۆی بەردەوام دەبێ تادەمرێ، ئەمە دەچێتە دۆزەخو

لەگەڵ ئەو بێباوەڕەدا کەخۆی کوشتوویەتی لەدۆزەخدا کۆدەبێتەوە، وەك لەم فەرموودەی بوخاریدا ئاماژە بۆ ئەمە دەکا، کە دەفەرموێ: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەناهەق یەکێ لە ئەهلی زیممە بکوژێ بۆنی بەهەشت ناکا...). {بخاری. دیات: ٦٩١٤ = تاج/٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٢٢٩٩، چ/٤}
مەبەست لەم فەرموودەیە روونکردنەوەی ئەم حاڵەی بکوژەکەیەو بەس، نەك حاڵەتەکانی تری!!

٢. لەسەر ناهەق کوشتوویەتی، بەڵام تەوبەی کردووەو بەڕوو سووری چووەتەوە دیوانی خودا، لەم کاتەدا موسوڵمانە بکوژەکە ناچێتە دۆزەخ، چونکە لەسەر ئیسلامەتیو تەوبەکاریو ئیستیقامەت مردووە.

کەواتە: وەك گوتمان مەبەست لەم فەرموودەیە، راگەیاندنی ئەو حاڵەتەیە کە بکوژی موسوڵمان لەگەڵ کوژراوی ناموسوڵمان، بەدەستی خۆی کۆدەبێتەوە، نەوەك ئەو خاڵانەی کە موسوڵمانی بکوژ، لەگەڵ ناموسوڵمانی کوژراو کۆنابێتەوە، هەتا ئەو رەخنانە سەر هەڵبدەن کە گوتراون لە شەرحەکاندا. بۆ رەچاوکردنی تەواوی ئەم بابەتە بڕوانە: فیقهی ئاسان بەرگی دووەم، چاپی ئێران، لاپەڕە: ٨٤٢}.

## ٨٧٤) کەسێ وشترێ لەڕێگەی خودادا ببەخشێ. (٤٨٧٤ - ٤٨٧٥)
## بابٌ: فَضْلُ مَنْ حمل على ناقة في سبيل الله

١١٠٠- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ، فَقَالَ: هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ ». {الحديث: ٤٨٧٤ = ٤٨٥٩ فم}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری فەرمووی: پیاوێ وشترە مێنگەیەکی رەشمەکراوی هێنا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەم هێناوە، دەیدەم لەڕێگەی خودادا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا، لەبەهەشتا، لەباتی ئەمە حەوت سەد وشترە مێچکەی هەوسار کراوت پێ دەدرێ).

١١٠١- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ إِنِّى أُبْدِعَ بِى فَاحْمِلْنِى، فَقَالَ: «مَا عِنْدِى»، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَدُلُّهُ عَلَى مَنْ يَحْمِلُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ ». {الحديث: ٤٨٧٦ = ٤٨٦١ فم}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: قوربان! وڵاخەکەم کە سواری دەبووم لەناوچوو، وڵاخێکی سواریم پێ بدە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وڵاخی سواری زیادەم نییە بیدەم پێت) پیاوێ تر لەوێ بوو گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من کەسێکی پێ نیشان دەدەم، کە وڵاخی سواری پێ دەدا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ خێرێ نیشانی کەسێ بدا، ئەویش وەك خێرکەرەکە خێری دەگا). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٧٣/١، چ/٤}.

## ٨٧٥) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ}. (٤٩٢٣ - ٤٩٢٦)

## باب: في قوله تعالى: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ}

١١٠٢- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وهُو على الْمِنْبَرِ يَقُولُ: «وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ» أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْىُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْىُ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْىُ ». (قالها ثلاثاً). {الحديث: ٤٩٢٣ = ٤٩٠٨ فم}:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دوانگە دەیفەرموو: مەبەست لە (قُوَّة) بۆ ئەمڕۆ، لەم سەردەمەی ئێمەدا، لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ} مەبەست لەم (قُوَّة)یە تیر ئەندازیو تیر هاویشتنە، وەسێ جار ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٢٢، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٣٢}.

## ٨٧٦) هاندان لەسەر فێربوونی مەشق لەسەر چەك. (٤٩٢٣ - ٤٩٢٦)
## بابٌ: الحَثُّ علَى الرَّمْى

١١٠٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللّـه (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُـونَ وَيَكْفِيكُمُ اللَّـهُ فَـلاَ يَعْجِزُ أَحَـدُكُمْ أَنْ يَلْهُـوَ بِأَسْهُمِهِ ». {الحديث: ٤٩٢٤ = ٤٩٠٩ فم}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورە بۆخۆی ولاتێکی زۆر بۆ ئێوە ئازاد (فەتح) دەکا، وە بەبێ شەڕو شۆڕ دەیانگرنو خودا خۆی شەڕی ئەو دوژمنانەتان لەکۆڵ دەخا، بەلام ئێوە ئەمە پشتتان سارد نەکاتەوەو نەکەن خاوببنەوەو واز لەتیر بازیو مەشق کردن بەرمو تیر بهێنن). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٤٤٢٩} + {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٢٢، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٣٣}.

١١٠٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شَمَاسَةَ: أَنَّ فُقَيْمًا اللَّخْمِيَّ قَالَ لِعُقْبَةَ بْن عَـامِرٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُ): تَخْتَلِفُ بَيْنَ هَذَيْنِ الْغَرَضَيْنِ وَأَنْتَ كَبِيرٌ يَشُقُّ عَلَيْكَ؟ قَـالَ عُقْبَـةُ: لَـوْلاَ كَـلاَمٌ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ أُعَانِه. قَالَ الْحَارِثُ: فَقُلْتُ لاِبْنِ شُمَاسَـةَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: إِنَّهُ قَالَ: « مَنْ عَلِمَ الرَّمْيَ، ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، أَوْ قَدْ عَصَى ». {الحديث: ٤٩٢٦ = ٤٩١١ فم}:

حاریثی کوڕی یەعقووب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڕەحمانی کوڕی شوماسە فەرمووی: فوقەیمی لەحمی گوتی بە عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ): بۆ ئەوەندە دێیتو دەچیت لەنێوانی ئەم دوو نیشانەدا، کە لەمەیدانی مەشقی تیر ئەندازیدا دانراون، بۆ مەشق لەسەرکردن، تۆ پیاوێکی پیری، شتی وا بۆ تۆ زەحمەتە؟

عوقبەیش فەرمووی: چونکە سەبارەت بەم بابەتە فەرموودەیەکم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، ئەگەر لەبەر ئەو فەرموودەیە نەبوایە ئەم زەحمەتەی خۆمم نەدەدا. حاریث فەرمووی: کە ئیبنو شوماسە ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە

بۆمان، عەرزیم کرد: ئەو فەرموودەیە کامەیە، کە عوقبە لە پێغەمبەری بیستووە لەم بارەیەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (ئەوەی فێری رمبازیو تیر ئەندازی ببێ، بەلام لەپاشان وازی لێ بهێنێ، ئەوە لەئێمە نییە، یا فەرمووی: کە بێگومان ئەوە یاخی بووەو فەرمانی ئێمەی شکاندووە). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٤٤٣٠، ج/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٣٤}.

**روونکردنەوە:**

لەمەیدانی مەشقدا، لەم سەرو لەوسەری مەیدانەکەوە چەند نیشانەیێ دادەنرێ، لەسەری تێگرتنەوە بۆ ئەوەیە کە تیراوێژەکە لەلای ئەو نیشانەوە تیر تێ بگرێ، بەرابەریشی لەوسەری مەیدانەکەوە نیشانەیێ دادەنرێ بۆئەوەی تیری تێ بگیرێو مەشقی لەسەر بکرێ، رێك لەسەر شێوەی مەیدانی مەشقی سەربازی ئەم سەردەمە.

**٨٧٧) خێرو خۆشی لەناوچەوانی ولاخی بەرزە گرێدراوە. (٤٨٢٢ - ٤٨٣٢)**

**باب: الخيلُ في نواصيها الخيرُ إلى يوْمِ القيامَةِ**

١١٠٥- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: « الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ ». {الحديث: ٤٨٢٤ = ٤٨٠٩ فم. تجريد/٣/٢٠٥، رقم: ١١٧٥ = ٢٧٥٠، ٢٨٥٢، ٣١١٩، ٣٦٤٣. نسائی. خيل: ٣٥٧٥، ٣٥٧٤، ٣٥٧٦. ترمذی. جهاد: ١٦٩٤، ٣٥٧٦، ٣٥٧٧، ٣٥٧٨، ٣٥٧٩. تحفة الأشراف: ٣٢٣٨}:

جەریری کوڕی عەبدوللا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەکانی کاکۆڵی ئەسپێکی دەهۆنییەوەو دەیفەرموو: (لە کاکۆڵو یاڵی ماینو ئەسپ خێرو خۆشی گرێدراوە هەتا رۆژی قیامەت: کە ئەو خێرو بێرە برێتییە لەپاداشی باشی قیامەتو، لەماڵی تالانی حەلاڵ لەم جیهانەدا). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٤٣٩٢} + {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٢٠، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٢٨، ١٣٢٩}.

١١٠٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ ». {الحديث: ٤٨٣١ = ٤٨١٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٧٦ = ٣٦٤٥ فتح. نسائي. خيل: ٣٦٧٣. تحفة الأشراف: ١٦٩٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیتو فەڕو پیرۆزی هەردوو جیهان وا بەناو چاوانی ماینەوە!).

## ٨٧٨) ڕاستو چەپ سپی یا بەپێچەوانەوە لە وڵاخی بەرزەدا ناباشە. (٤٨٣٣ - ٤٨٣٥)

## بابٌ: كراهيَة الشكال في الخيْل

١١٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ. وَفي رواية: (وَالشِّكَالُ أَنْ يَكُونَ الْفَرَسُ فِي رِجْلِهِ الْيُمْنَى بَيَاضٌ وَفِي يَدِهِ الْيُسْرَى، أَوْ فِي يَدِهِ الْيُمْنَى وَرِجْلِهِ الْيُسْرَى. {الحديث: ٤٨٣٣، ٤٨٣٤ = ٤٨١٨، ٤٨١٩ فم. أبو داود. جهاد: ٢٥٤٧. ترمذي. جهاد: ١٦٩٨. نسائي. خيل: ٣٥٦٩. ابن ماجة. جهاد: ٢٧٩٠. تحفة الأشراف: ١٤٨٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لە وڵاخی بەرزەی ڕاستو چەپ سپی نەبوو، یا چەپو ڕاست سپی، کە لەعەرەبیدا بەم جۆرە وڵاخە دەگوترێ: مەشکوولو زووشیکال. وەك لەگێڕانەوەی ژمارە: ٤٨٣٤دا دەفەرموێ: (شیکال ئەوەیە کەماینو ئەسپ، ڕاستو چەپ سپی بن، یا بەپێچەوانەوە).

**ڕوونکردنەوە:**

١. هۆی ئەم ناباشییە ئەوەیە کە لەجۆرە پێوەندکردنێ دەچێ، شتی وایش بۆنی جۆرە نوقلانەیەکی خراپی لێ دێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لە نوقلانەی باش بوو، بەناوو شتی وا نوقلانەی باش، یا خراپی لێ دەدا. {بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٣٧٨، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٣٠٤٩ هەتا ٣٠٥٤ هەروا زنجیرە: ٧٦ و ٧٧ لەژمارە: ٣٠٤١وە هەتا ژمارە: ٣٠٤٨} + {تەجرید/٣، ژمارە: ١١٨١}.

٢. رەنگو شێوەو دەنگو ناوو نیشانو شتی وا، زۆرجار کاریگەرییان هەیە لە بڕیارەکانی شەرعا، گەلێ شت بە ئەزموون دەرکەوتووە کەباش نییە، گەلێ شت دڵ پێی تەنگ دەبێ، لەبەرئەوە لەم لایەنانەوە مرۆڤ وریابێ باشە.

## ٨٧٩) پێشبڕکێ لەنێوانی چەند وڵاخێکی بەرزەداو پەروەردەکردنو قاڵکردنیان.

(٤٨٢٠ - ٤٨٢١)

## بابٌ: المُسابَقَةُ بَيْنَ الخَيلِ وَتَضْميرِها

١١٠٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمـا): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) سَابَقَ بِالْخَيْلِ الَّتِى قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِى لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِى زُرَيْقٍ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا. {الحديث: ٤٨٢٠ = ٤٨٠٥ فم. تجريد/١، رقم: ٢٦٠ = ٤٢٠، ٢٨٦٨، ٢٨٦٩، ٣٨٧٠، ٧٣٣٦. أبو داود. جهاد: ٢٥٧٥. نسائى. خيل: ٣٥٨٦. تحفة الأشراف: ٨٣٤٠}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێیەکی بە وڵاخی بەرزە سازدا، ئەسپو ماینەکانی کرد بەدوو تاقم، ئەو ئەسپو ماینانەی کەقاڵ بوونو ئامادە کرابوون بۆ قۆشمە پێکردن، ئەمسەری مەیدانی تەراتێنەکەیان حەیفاء بوو، ئەوسەری ثەنییەتول وەداع بوو، ئەو ماینو ئەسپانەیشی کە ئامادە نەکرابوون بۆ قۆشمە، گۆڕەپانی پێشبڕکێکەیان کورتتر بوو، لە ثەنییەتول وەداعەوە بوو، هەتا مزگەوتی بەنی زورەیق، وەمن خۆم یەکێك بووم لەو سوارانەی کە بەشدارییان کرد، لەم پێشبڕکێیەدا وە یەکەمیان بووم). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٤٤٢٣، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. حەیفاء جێگەیەکە، لە کلکەی مەدینەی جارانەوەیە، پێنج یا شەش میل لەمەدینەوە دوورە.

٢. ئـەنييـەتول وەداع (واتـە: ملـەى خواحـافيزىو بـەڕێكردن) شـوێنێكى ناسـراوە، لەنزيك مەدينەوە، كەسێكى ئازيز كە لەمەدينە دەردەچوو هـەتا ئـەوێ لەگـەڵى دەچوون بۆ خواحافيزى لێكردن.

٣. مزگەوتى بەنى زورەيقيش دەورى ميلێ لە ئەنييەتول وەداعەوە دوورە.

٤. ئيبنو عومەر لەم پێشبڕكێيەدا براوەى يەكەم بووە.

**٨٨٠) سەبارەت بەئايەتى: {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ}. (٤٨٨٨ - ٤٨٨٩)**

**بابٌ: في أهْلِ التَخَلُّف بِالعُذْرِ وَقَوْلِه تَعالى: {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ} الآية**

١١٠٩- عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ: أَنَّهُ سَمِعَ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) يَقُولُ فِى هَـذِهِ الآيَـةِ (لاَ يَسْتَوِى الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِـنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِى سَبِيلِ اللَّهِ) فَأمَرَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) زَيْدًا فَجَاءَ بِكَتِفٍ يَكْتُبُهَا فَشَـكَا إِلَيْـهِ ابْـنُ أُمِّ مَكْتُـومٍ ضَـرَارَتَهُ، فَنَزَلَـتْ: (لاَ يَسْتَوِى الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِـنِينَ غَيْرُ أُولِى الضَّرَرِ). {الحديث: ٤٨٨٨ = ٤٨٧٣ فم. تجريـد البخارى/٣، رقم: ١١٦٦ = ٢٨٣٢، ٤٥٩٢. تحفة الأشراف: ١٨٧٧}:

ئـەبو ئيسـحاق دەفـەرموێ: لەبـەرائى كـوڕى عـازيبم بيسـت (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) دەيفەرموو لەبارەى ئايەتى: {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِـنَ الْمُـؤْمِنِينَ .... وَالْمُجَاهِـدُونَ فِـي سَبِيلِ اللّهِ – النساء – ٤/٩٥} كاتێ ئەم ئايەتە هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (درووودى خوداى لەسەر بێ) فـەرمانى كـرد بەزەيـدى كـوڕى ثابيـت (ڕەزاى خوداى لێ بێ) ئێسـكى دەفـەى شـانى ئاژەڵێكى هێنا، ئەم ئايەتەى لێ نووسى، لەم كاتەدا ئيبنو ئوممى مەكتووم (ڕەزاى خوداى لێ بێ) هاتـە خزمـەتى عـەرزيكرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! سـوێندم بەيـەزدانى پـاك، ئەگەر تواناى غەزاو تێكۆشانو خـەباتگێڕانم دەبـوو، منـيش لـەم لايەنـەوە درێغـيم نەدەكرد، بەڵام من پياوێكى كوێرمو ئەمانـەيش بـە كـوێر نـاكرێ، ئـيتر بۆچـى مـن لەپيتو فەڕو بەهرەى غەزا لەڕێگەى خودادا بێ بەشم؟ ئيتر ئايەتەكە گۆڕاو بـەم شـێوەى تـر دابـەزى: {لاَّ يَسْـتَوِي الْقَاعِـدُونَ مِـنَ الْمُـؤْمِنِينَ - غَيْـرُ أُوْلِـي الضَّـرَرِ - وَالْمُجَاهِـدُونَ فِـي سَبِيلِ اللّـهِ – النسـاء – ٤/٩٥} واتـە: وەك يـەك نـين لـەپاداشو

تۆڵەی باشدا، ئەو موسوڵمانانەی کە دانیشتوونو بەبێ مەهانەی ڕەوا، وەك کوێریو شەلیو نەخۆشی، تەرکی غەزاو خەباتیان کردووە، لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەدا کە خەبات دەگێڕنو تێ دەکۆشن لەڕێگەی خودادا). {تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٨١٣، چ/٤}.

## ٨٨١) کەسێ بەهۆی نەخۆشییەوە نەچێ بۆ غەزا. (٤٩٠٩ - ٤٩١٠)

## باب: مَنْ حَبَسَهُ العُذْرُ عَنِ الغَزْوِ

١١١٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَزَاةٍ، فَقَالَ: « إِنَّ بِالْمَدِينَةِ رِجَالاً مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلاَّ كَانُوا مَعَكُمْ، حَبَسَهُمُ الْمَرَضُ ». {الحديث: ٤٩٠٩ = ٤٨٩٤ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایەکا، لەخزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەشاری مەدینە، پیاوانێ لەخۆمان، لەئێمە بەجێماونو نەهاتوون بۆ ئەم غەزایە، بەڵام بەدڵو بەگیان لەگەڵ ئێمەنو مەهانەی ڕەوا لەوێ گلی داونەتەوە، ئێمە لەهەر ڕێگەو شیوو دۆڵێکەوە بڕۆین ئەوانیش بەدلو گیان لەگەڵمانن‌و حەزدەکەن کە لەگەڵمان بن، بەڵام نەخۆشی پەکی خستوونو لەماڵەوە گلی داونەتەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٤٢٦٢، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- زاناکان دەفەرموون: وشەی (فی سبیل اللّە: لەڕێگەی خوادا) بێجگە لە غەزاو خەباتگێڕان بۆ ڕەزای خودا، زۆر شتی تری باش دەگرێتەوە، وەك ڕۆژوو، خێرکردن، چوون بۆ نوێژی هەینی، وێڵبوونو گەڕان بەشوێن فێربوونی زانستا، هەروا دەڵێن: وشەی (إغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ) یا (فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ)و ئەمانەو مانەندی ئەمانە، لە فەرموودەو دەقە ئاینییەکانا، بۆ نموونەو میثالە، بۆ قەیدو مەرج نییە.

٢- بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژ ڕۆژی خەباتی وشەیە، ئەم سەردەمە کاتی جیهادی کەلیمەو کۆشش بەخامەو قەڵەمە، نووکی قەڵەم بە بڕشتترو تیژترە لەنووکی شیرو تیر.

٣ - زۆرکەس لە ناحەزانی ئیسلامو پێهەڵخەڵەتاوەکانیان دەڵێن: گوایە ئیسلام شەڕ پەرستەو حەزی لەجەنگو هەرایەو ئیسلام بەزەبری تیرو شیر بڵاوبۆتەوە، نەوەك بەهێزی فیکرو بیرو بانگەشەی پڕ ئامۆژی جوانو رەوان!

ئەمە قسەیەکی زەهراوییەو درۆیەکی پەتییە. ئەگەر بەویژدانەوە بەراوردێ لەنێوان ئایینە ئاسمانییەکاندا بکەین، دەبینین ئیسلام لەهەموویان زیاتر، حەزی لەخێرو خۆشیو ئاشتیو کامەرانییە، بۆ کۆمەڵانی مەردوم.

کەسێ بەوردی تەماشای تەورات بکا، کە بەلای جوولەکەو گاورەکانەوە، نامەیەکی پیرۆزەو فەرمایشتو سرووشی خودایە، دڵی دەوەستێ، مووی لەشی قەف رادەوەستێ، کە دەبینێ چۆن چۆنی ئایەتەکانی تەورات، بەوپەڕی دڵ رەقیو بێ رەحمیو بێ باکییەوە فەرمان دەدا بەجەنگاوەرەکان کە ئەودێو شارو وڵاتەی دەیگرن، دارو بەردیو خانوو ومالّو گیاندارو بێ گیانو مرۆڤو ئاژەڵو وەڵسو زیندەوەرانی هەموو بەسەر یەکا بسووتێننو رەحمیان پێ نەکەن، فەرمانە جەنگییەکانی تەورات دەق لەفەرمانە جەنگییەکانی هۆلاکۆو جەنگیزخانو نێرۆنو هیتلەرو فیرعەونو نەمردوود دەکەن!

دەی با لەزەمینەی واقیعدا، نەك لە زەمینەی خەیاڵ پلاودا، با سەرەنجو تەماشای شەڕ فرۆشیو بێ رەحمیو بێ ویژدانی فەلەو گاورەکان بکەین، دەبێ پەیڕەوانی چی ئایینێکی تر بەقەد پەیڕەوانی عیسا شەڕ فرۆشو شەڕ پەرستو خوێن رێژبن؟ خوێنی ناهەقیان لەسەر رووی زەوی رژاندبێ، ماڵی خەڵکی بێ تاوانیان لە خۆیانو لەخەڵکی تریش وێران کردبێ، بە بەرچاوی ئەم چینەی ئێمەوە دوو جەنگی هەرە گەورەیان بەرپاکرد، بەسەدان جەنگی بچکۆلەو گەورەی تریان، لەهەموو لایێ هەڵگیرساندووە، لە جەزائیر، لە میصر، لە ئەریتریا، لە ئەفغانستان، لە صۆماڵ، لە یەمەن، لە کۆریا، لە فێتنام، لە فەلەستین، لە عێراق، لەهەموو لایێ، گۆی زەوی بەهۆی ئەوانەوە بووە بەکونە مشکی قانگدراو، لەهەموو لایێ خۆیانو نۆکەرە ئەڵقە بەگوێکانیان شەڕو هەرا دروست دەکەن، بەهەزاران

گوندو شارو وڵاتی تیا سووتاو تیا دەسووتێ، بە ملیۆنەها مرۆڤی بێ تاوانو ژنو منداڵو پیرو زیندەوەریان کوشتو سووتاندو برژاند، بەهەزاران مزگەوتو خانەی خودایان رمانو سووتاند، ئایا ئەمەی کە ئەم گاورانە دەیکەن جێبەجێ کردنی ئایەتەکەی ئینجیلە کە دەڵێ: {مَنْ ضَرَبَكَ عَلَى خَدِّكَ الأَيْمَنِ فَأَدِرْ لَهُ خَدَّكَ الأَيْسَرَ} یا خۆیان مەشموول نین بە بڕیارو بە حوکمی ئەم ئایەتەو ئەم ئایەتەیان کردووە بەدەرزی زەهرو دەیدەن لە مێشكو دڵی ئەو گەلو کەسانەی کە دەیانەوێ مەردانە دیفاعو بەرگری لەسەرو ماڵو نامووسو نیشتمانی خۆیان بکەنو سەر بۆ زوڵمو زۆری ئەوان شۆڕ نەکەن.

وەك راستییەکی بەڵگە نەویست، ژمارەی سەرجەمی ئەوانەی کە لەفەتوحاتی ئیسلامیدا شەهید بوون، یا کوژراون لە موسوڵمانو ناموسوڵمان، بەهەموویان دەیەکی ئەوانە نابن کە لەجەنگی دووەمی جیهانیدا بەدەستی گاورەکان کوژراون! ئیتر بۆ ئێمە شەڕ پەرست بینو ئەوان ئاشتی خواز!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٣٢- نامەی کارنامە - (كتَابُ السّيَرِ)

## ٨٨٢) باسی فەرماندەکانی سوپاو ئامۆژگاری خێریان. (٤٤٩٦ - ٤٥٠٣)

## باب: فى الأمراءِ علَى الجُيُوش والسّرايا والوصيّة لهُمْ بما ينْبغى

١١١١- عَنْ بُرَيْدَةَ قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إذا أمَّـرَ أمـيرًا علَـى جَيْشٍ أوْ سَرِيَّةٍ، أوْصَاهُ فِى خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ عز وجلومَنْ معَـهُ مـنَ الْمُسْلمينَ خيْـرًا. ثُـمَّ قَالَ: « اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فِى سَـبِيلِ اللَّـهِ، قَـاتِلُوا مَـنْ كَفـرَ باللَّـه، اغْـزُوا وَ لاَ تَغُلُّـوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَـى ثَـلاَثِ خِصَالٍ (أَوْ خِلاَلٍ) فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُـمَّ ادْعُهُـمْ إِلَـى الإِسْـلاَمِ، فَـإِنْ أَجَـابُوكَ فَاقْبَـلْ مِـنْهُمْ، وَكُـفَّ عَـنْهُمْ، ثُـمَّ ادْعُهُـمْ إِلَـى التَّحَـوُّلِ مِـنْ دَارِهِـمْ إِلَـى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِى عَلَيْهِمْ حُكْـمُ اللَّهِ الَّذِى يَجْرِى عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِى الْغَنِيمَةِ وَالْفَىْءِ شَـىْءٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِـدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَقَاتِلْهُمْ، وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّـهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فَإِنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ)، وَإِذَا حَاصَـرْتَ أَهْـلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، فَلاَ تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، وَلَكِنْ أَنْـزِلْهُمْ عَلَـى حُكْمِكَ. فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِى أَتُصِيبُ حُكْمَ اللَّهِ فِـيهِمْ أَمْ لاَ »؟ قَـالَ عَبْـدُ الـرَّحْمَنِ (يعـني ابـن مهدي): هَذَا أَوْ نَحْوَهُ. {الحديث: ٤٤٩٧ = ٤٤٨٥ فم}:

**بورەیدە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **وابوو، کاتێ پیاوێکی دەکرد بە فەرماندەی سوپایێ، یا دەیکرد بەسەر پەلو سەر لق، یا**

دەیکرد بەسەرکردەی لەشکرێ، لەپێشا بەتایبەتی، ئامۆژگاری خێری دەکردو رایدەسپارد: کە تەقوای خودای گەورەو باڵا دەست بکاتو هەمیشە ترسی خودای هەبێ، هەروا ئامۆژگاری دەکرد کەباش بێ بۆ ئەو موسوڵمانانەی کەوان لەگەڵیا، ئەوجا دەیفەرموو: (بەناوی خودا دەست بکەن بەغەزاو بجەنگێن لەرێگەی خودادا، شەڕبکەن لەگەڵ بێباوەڕان بەخودا، غەزا بکەن گزیو دزی لەتالانیو دەسکەوتی جەنگ مەکەن، بێ وادەو بێ پەیمان مەبنو نامەردی مەکەن، لاشەی کوژراوەکان ئەتك مەکەنو بە کوژراوی مەیان شێوێنن، منالْ مەکوژن، ئەی فەرماندەی سوپای ئیسلام! کاتێ خۆتو سوپاکەت رووبەڕووی دوژمنی خۆتان بوونەوە، لەفرە خواکان لەهاوبەش پەیداکەرەکان، داوایان لێ بکە کە یەکێ لەم سێ رەوشە قەبووڵ بکەن: هەرکامێ لەم سێ شتەیان قەبووڵکرد، تۆیش قەبووڵی بکەو شەڕیان لەگەڵ مەکە:

یەکەم: لەپێشا داوایان لێ بکە کە ئیسلام ببنو ئایینی پیرۆزی ئیسلام قەبووڵ بکەن، جا ئەگەر ئەمەیان قەبووڵکرد، تۆیش لێیان قەبووڵ بکەو واز لەشەڕکردن لەگەڵیان بهێنە، کاتێ ئیسلامیان قەبووڵکرد، داوایان لێ بکە کە لەوڵاتی خۆیانەوە باربکەنو بگوێزنەوە بۆ مەدینە، کە رەوگەی موسوڵمانانەو ناسراوە بەدارولهیجرە، وەپێیان بڵێ ئەگەر ئەوەیانکردو کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەوا حاڵیان وەك حاڵی کۆچکاران (موهاجیرین) وایە بەبێ زیادو کەم، ئەو مافەی بۆ موسوڵمانە کۆچکارەکان هەیە هەمان ماف بۆ ئەوانیش هەیە، وە ئەو ئەركو مافەی لەسەر موسوڵمانە کۆچکارەکان هەیە، هەمان ئەركو ماف لەسەر ئەوانیش هەیە، بەڵام ئەگەر حەزیان لەکۆچکردن نەبوو، وەمانەوە لەشوێنی خۆیان، ئەوا حاڵیان وەك حاڵی موسوڵمانە سارا نشینەکان وایەو بە موسوڵمان دادەنرێنو ئەو بڕیارو شەرعی خودایەی کە ئیمانداران دەگرێتەوە ئەوانیش دەگرێتەوە، دەبێ پابەندبن بە فەرمانەکانی ئیسلام، بەڵام لە دەسکەوتی جەنگو لە مفتە ماڵ (فیأ) بەشیان ناکەوێو پشکیان بۆ دادەنرێ، مەگەر ئەوانیش لەگەڵ موسوڵمانانی ترا بچن بۆ غەزاو خەباتگێڕان.

دووەم: جا ئەگەر رازی نەبوون کە موسوڵمان ببن، داوای سەرانە (جزیە)یان لێ بکە، ئەگەر رازی بوون کە سەرانە بدەن ئەوا سەرانەیان لێ وەربگرەو شەڕیان لەگەڵ مەکە.

سێیەم: بەڵام ئەگەر نە موسوڵمان بوونو نە سەرانەیاندا، یارمەتی لەخودا داوا بکەو بەپشتی یاریدەی خودا بجەنگە لەگەڵیانا.

لەکاتی قەومانی شەڕدا، کاتێ دەوری قەڵایێ دەگریت ئەگەر خەڵکی ناو قەڵاکە داوایان لێ کردی کە بەرابەر بەوە کەخۆیان بدەن بەدەستەوە پەیمانی خوداو پێغەمبەری خودایان بدەیتێ، شتی وامەکە، مەگەر خۆت بەباشی بزانی، بەڵام بەناوی خۆتو هاوڕێکانتەوە پەیمانیان پێ بدە، چونکە ئێوە ئەگەر پەیمانی خۆتانو هاوڕێکانتان بشکێنن، ئاسانترە لەوە کەپەیمانی خوداو پێغەمبەری خودا بشکێنن، وە هەروەها ئەگەر گەمارۆی خەڵکی قەڵایەکت داو، داوایان لێ کردیت کە لەسەر فەرمان (حوکم)ی خودا خۆیان بدەن بەدەستەوە، شتی وایان لێ قەبووڵ مەکە، بەڵام بالەسەر فەرمانی خۆت خۆ بدەن بەدەستەوە، چونکە تۆ نازانیت ئایا فەرمانی خودا لەبارەی ئەوانەوە دەپێکیت یانا؟).

ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیە لەدوو مامۆستای خۆیەوە دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی هاشیمەوە، کە لەفظی ئەم فەرموودەیە دەقە عەرەبییەکەی هی ئەوە، وەك خۆی لەسەرەتاوە دەفەرموێ: {حَدَّثَنِى عَبْدُاللَّهِ بْنُ هَاشِمٍ — وَاللَّفْظُ لَهُ -}.

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدیشەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، بەڵام لەفظی فەرموودەکە بەدەق هی ئەو نییە، بۆیە ئیمامی موسلیم لە ئاخرەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: (عەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدیش ئەم فەرموودەیەی بەهەمان دەقو لەفظ بۆم گێڕایەوە، یا بەدەقو لەفظی لەم شێوەیە). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٤، لاپەڕە: ٧١٣، ژمارە: ٤٤٥٧}.

**روونكردنەوە:**

یەكەم: ئەم فەرموودەیە لەتاجدا، لە شەرحەكەیدا، سێ خاڵە كە بەم سێ شتە دادەنێ:

١- قەبووڵی ئیسلام.

٢- هیجرەت بۆ وڵاتی ئیسلام.

٣- سەرانە، ئەمەیش گونجاوترە لەگەڵ ئەو رستەیەدا كە دەفەرموێ: {فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ ، فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ...}.

بەڵام لە (عَوْنُ المَعبود)دا كە حاشیەیە لەسەر (سُنَنُ أَبِي داود) دەفەرموێ لە (جهاد/باب: فِي دُعَاءِ المشركين). (رقم: ٢٦١٢، ٢٦١٣):

١- قەبووڵی ئیسلام. ٢- سەرانەدان. ٣- شەڕلەگەڵكردن.

دووەم: لەزۆر شوێن رەچاو دەكرێ كە دەقی فەرموودەكە، بەعەرەبی یەك شتە، كەچی بەچەند جۆرێ كراوە بەكوردی لەریاضی صالحیندا بەشێوەیێ، لەتاجدا بەشێوەیێ تر، لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا بەشێوەیێ تر، لەپوختەی صەحیحی موسلیمدا بەجۆرێكی تر، بگرە فەرمووده هەیە لەیەك پەڕاودا بەدوو شێوەی جیاجیا تەرجەمە كراوە، ئەمە هەمووی بۆ یەكێ لەم چەند مەبەستەیە:

١. دەوڵەمەندكردنی شەرحو لێكدانەوەی فەرموودەكە، هەتا سوودی زیاتری لێ وەربگیرێ.
٢. هەڵبژاردنی بۆچوونی شەرحی كتێبەكە خۆی.
٣. خزمەتكردنو دەوڵەمەندكردنی زمانی كوردیو ئاماژە بۆ بەپێزیو بەهێزو بەروالایی فەرهەنگی كوردی.
٤. بەڵام بەهیچ شێوەیێ، جیاوازیی ئەو وەرگێڕانە جیا جیایانە، ئەوە ناگەیەنێ كەهەندێ لەو شێوانە لاوازو بێ هێزبن، یا هەڵەبن، بەڵكوو مەبەست ئەم جۆرە مەبەستانەیە.

## ٨٨٣) فەرمانكردن بەنێردە سەربازییەكان بەئاسانكاریی. (٤٤٩٦ - ٤٥٠٣)
## باب: فِي أَمْرِ البعوث بالتيْسِير

١١١٢- عَنْ أَبِي موسى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَهُ وَمُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: « يَسِّرَا، وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا، وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا وَلاَ تَخْتَلِفَا ». {الحديث: ٤٥٠١ = ٤٤٨٩ فـم. بخاري. جهاد: ٣٠٣٨، ٤٣٤١، ٤٣٤٢، ٤٣٤٥، ٦١٢٤، ٧١٧٢. أبو داود: ٤٣٥٦. نسائي: ٥٦١١. ابن ماجة: ٣٣٩١}:

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منو موعازی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەنو پێی فەرمووین: (كار ئاسان بكەنو كار گران مەكەن، مژدەی خۆش بەخەڵك بدەنو، بەهەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەدین مەتەكێننەوە، بەگوێی یەكتری بكەنو دژایەتی یەكتری مەكەنو لەبەینی خۆتانا ناكۆكو ناتەبا مەبن!). {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٦٣٧} + {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧}.

**ڕوونكردنەوە:**

١- بۆ ژیاننامەی ئەبو موسای ئەشعەری بڕوانە ژمارە (٢١) لەم پەڕاوە پیرۆزە كە لەپێشەوە ڕابورد.

٢- موعازی كوڕی جەبەل، خەزرەجییە، ئەنصارییە، یەكێكە لەو حەفتا ئەنصارییەی كە ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون، زانایەكی مەزن بوو، پێشەوایەكی گەورەیە لەزانستی حەڵاڵو حەرامدا، كۆمەڵێ فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، گەورە پیاوانی هاوەڵانو پەیڕەوان (سەحابەو تابیعین) فەرموودەكانی ئەویان لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومەرو جابیرو ئەنەسو كەسانی تریش فەرموودەكانی پێغەمبەریان لەدەمی ئەوەوە گێڕاوەتەوە.

ئامادەی بەدرو هەموو شەڕگەو نەبەردگاو شەهیدگاكانی تری پێغەمبەر بووە، مناڵی قەت نەبووە، ئەنەسی كوڕی مالیك دەیفەرموو: (موعاز یەكێكە لەوچەند كەسە كەمانەی كە بەسەرینیی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانیان

لەبەربوو). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (قورئان لەم چوار کەسەوە فێربن) کە یەکێکیان موعازی کوڕی جەبەل بوو، کە ئامادەی غەزای بەدربوو تەمەنی لەوکاتەدا بیستو یەك ساڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەفەرمانڕەوا لەیەمەن.

لەباشترینو جوانترین لاوانی یاریدەدەران (ئەنصار) بوو، لاوێکی جوانی خوێن گەرمی قۆزی سپیو سووری چاوقەوی چاو ڕێژراوی چاوڕەشی سورمەیی باڵا بەرزبوو، دوعاو نزای زۆر گیرا دەبوو، هەرچی لەخودا داوا دەکرد پێی دەبەخشی، کاتی بەستنی پەیمانی برایەتی لەناو هاوەڵاندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەبرای ئیبنو مەسعوود، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەرۆژی قیامەتدا پێشەنگی زاناکانە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موعازی کرد بەقازی (الجند) لەیەمەن، خەڵکەکەی فێری قورئانو سوننەتو شەریعەتی ئیسلام دەکرد، وە دادگاییشی لەنیوانا دەکردن، موعاز لەدەوری تەمەنی (٣٣) سییو سێ ساڵیدا، لەشام، بە تاعوونەکەی عامووس، لەساڵی هەژدەی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، عامووس گوندێك بوو لەنێوانی ڕەملەو بەیتولەقدیسدا بوو. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٣٤٧٣ هەتا ٣٤٧٦}.

## ٨٨٤) ناردنی نێردە سەربازیەکانو کەسێ لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ غەزا. (٤٨٧٦ - ٤٨٨٤)

١١١٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَ حسان إِلَى بَنِي لَحْيَانَ لِيَخْرُجْ مِنْ كُلِّ رَجُلَيْنِ رَجُلٌ، ثُمَّ قَالَ لِلْقَاعِدِ: « أَيُّكُمْ خَلَفَ الْخَارِجَ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ بِخَيْرٍ، كَانَ لَهُ مِثْلُ نِصْفِ أَجْرِ الْخَارِجِ ». {الحديث: ٤٨٨٤ = ٤٨٦٩ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەسانی کوڕی ثابیتی نارد بۆناو هۆزی بەنی لەحیانو پێی فەرموو کەپێیان بڵێ: (با لەهەموو دوو پیاوێ پیاوێکیان بڕوا بۆ غەزا) وە سەبارەت بەوەیان لەو دوو

کەســە، کــە لەماڵــەوە دەمێنێتــەوە فــەرمووی: (هــەرکامێکتان کــە لەماڵــەوە دەمێنێتـەوەو ناچـێ بـۆ غـەزا، لـەجیاتی ئـەوەتان کەدەرچـووە بـۆ غـەزا، بەچـاکە سـەرەوکاریی مـاڵو منداڵەکـەی بکـا، بەقـەد نیـوەی ئـەو خێـرو پاداشـی بـۆ هەیـە). {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٣٤٨، چ/٤}.

**٨٨٥) سنووری نێوانی بچووك کە ڕێگەی پێ نەدرێ بچێ بۆ جەنگو نێوانی گەورە کە ڕێگەی پێ بدرێ بچێ بۆ جەنگ.** (٤٨١٤ - ٤٨١٥)

**بابٌ: الحدُ بيْنَ الصَّغيرِ والكَبيرِ فيمنْ يُجازُ للْقتالِ ومنْ لايُجاز**

١١١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّه (صـلى الله عليـه وسلم) يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعَرَضَـنِي يَـوْمَ الْخَنْـدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي، قَالَ نَافِعٌ: فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْـدِ الْعَزِيـزِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُ) وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فَحَدَّثْتُـهُ هَـذَا الْحَدِيثَ فَقَـالَ: إِنَّ هَـذَا لَحَـدٌّ بَـيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، فَكَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ كَانَ ابْنَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجْعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ. {الحديث: ٤٨١٤ = ٤٧٩٩ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١١٢٣ = ٢٦٦٤ = ٤٠٩٧}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود چواردە ساڵ بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای کردم تا بزانێ بەکەڵکی جەنگ دێم یانا، بەڵام لەبەر بچووکی تەمەنم بەگەنـدی نـەکردم، وەڵێ ڕۆژی غـەزای خەنـدەق پـازدە ساڵ بـووم، پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بۆهــەمان مەبەســت تەماشــای کــردمو هــەڵی سەنگاندمو ڕێگەی غەزاکردنی دام.

نافیع فەرمووی: عومەری کوڕی عەبدولعـەزیز کاتـێ جێنشـین (خەلیفـە) بـوو، چووم بۆ سەردانیو ئەم فەرموودەیەم بۆیگێڕایەوە، جا عومەر فەرمووی: ئەم سەر گوزوشتەیە ڕادەو سـنووری جیاکردنـەوەی بچـووكو گەورەیـە لەیـەکتری، جا بۆیـە نامەی نووسی بۆ سەرکارەکانی: (کە ئەوەی تەمـەنی پازدە ساڵی تـەواوە بەشـی بـۆ دابنێنو لەخێرو لەشەڕدا حسێبی پیاوی بۆبکەن، ئەوەیشی تەمەنی لەوە کـەمتربێ

دای بنێن بەورده خێزانو لەچاكو لەخراپا حاڵی حاڵی مناڵه!). {تاج/١، زنجیره: ٥١، ژماره: ٣٧٩ — ش/د/ت/ن}.

**ڕوونكردنەوە:**

لەشەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمدا، ئەم فەرموودەیە دانراوە، بە بەڵگە لەسەر تەمەنی ڕەسیدەیی‌و باڵقی‌و تەمەنی نابالقی.

## ٨٨٦) ڕێگە نەدراوە كە قورئان ببرێ بۆ وڵاتی دوژمن. (٤٨١٦ - ٤٨١٩)
## بابٌ: النَّهْيُ أَنْ يُسافَرَ بالقُرآن إلى أرْضِ العَدُوِّ

١١١٥- عَنْ ابْنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): أَنَّهُ كَانَ يَنْهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ. {الحديث: ٤٨١٧ = ٤٨٠٢ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەكرد كە قورئان ببرێ بۆ خاكی دوژمن، مەبادا دەست دوژمن بكەوێو بێ ڕێزی پێ بكەن). {ریاض/٤، زنجیره: ٣٦٣، ژماره: ١٧٩٤ - ش} + {تەجرید/٣، ژماره: ١٢٢٤ = ٢٩٩٠} + {تاج/٤، زنجیره: ٢٤، ژماره: ٤٣٨٥}.

**ڕوونكردنەوە:**

١- مەبەست لەم جۆره بابەتو بڕیاره، بۆ ئەو ڕۆژگاره بووه، كەهێشتا مەترسی ئەوه دەكرا، كە بەهۆی دەستكاری قورئانەوه، قورئان گۆڕانكاری تیابكرێ، بەڵام ئێستا ئەم مەترسییە نەماوه، چونكە بەسەدان مەلیۆن دانە (نوسخە) لە قورئان، لە دەسخەتو لەچاپكراو، بە جیهانا بڵاوبۆتەوه، بگرە ئێستا باشترین چاپی قورئان ئەوەیە كە لە وڵاتە ناموسوڵمانەكان چاپ دەكرێ لەبەرئەوە واباشە بۆ ئەو بەڕێزانەی كە لەوڵاتی ئیسلامەوه، كۆچ یا سەفەر، دەكەن بۆ وڵاتە ناموسوڵمانەكان، قورئانو پەراوی فەرموودەو تەفسیرو شەریعەت لەگەڵ خۆیان بەرن، یا هەوڵ بدەن

که پەیدایان بکەن، چونکە یەکێ لەهۆی بەردەوامبوونی بیرو باوەڕ ئەوەیە کە هۆکاری روونکردنەوەو پەخشەوە بوونی لەبەر دەستدابێ.

جا لەکاتی نەقڵو گواستنەوەی لەم جۆرە شتانەدا، بەم مەبەستە رەوایە موسومەحەو چاوپۆشی لەهەندێ گیروگرفتیو پێشهات دەکرێ، وەك ئەوە دوور نییە کە کتێبە پیرۆزەکان، لەناو پاپۆڕو خۆشڕۆو شتیوادا، لەجێگەی شایانی خۆیان دانەنرێن، یا لەلایەن کرێکارو حەماڵو دەستەی کارمەندانی بەرپرسیاری ئەم جۆرە کارو فرمانانەوە رێزی شایانی خۆیان پێ نەدرێ، بەلام لەهەمان کاتدا وەك پێویست ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن‌و، ئەوەی مەبەستی هەموو لایەکە دێتەجێ. لەبەرئەوە موسامەحەو چاوپۆشی لەم جۆرە گرفتانە دەکرێ، وەبەر ئەو جۆرە یاسایە دەکەوێ کە دەفەرموێ: (لِلضَّرُورَاتِ أَحْكَامُهَا). واتە: ناچاریەکان بڕیاری تایبەتی خۆیان هەیە). یا ئوصولییەکان دەفەرمون: (بڕیار دەگۆڕێ بەپێی گۆڕانی رۆژ).

٢- بەلام لەکاتی شەڕو شۆڕو ئاژاوە گەل‌و ئاشووبدا، کە هەڵ دەگرێ ناموسوڵمانە نەیارەکان بێڕێزی بەم جۆرە پەڕاوە پیرۆزە ئیسلامییانە بکەن، ئەوکاتە کار بەبڕیاری ئەم فەرموودەیە دەکرێ.

## ٨٨٧) سەفەر لە تەڕە ساڵو لەوشکە ساڵو وچانگرتنی شەو لەدووری چەقی رێگەوبان. (٤٩٣٦ - ٤٩٣٧)

## بابٌ: السَّفَرُ فِي الخِصْبِ وَالجَدْبِ وَالتَّعْرِيسِ عَلَى الطَّرِيقِ

١١١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ، فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الأَرْضِ، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ، وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ، فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ ». {الحديث: ٤٩٣٦ = ٤٩٢١ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر لەکاتی لەوەڕو تەڕە ساڵدا سەفەرتان کرد، مەودای وشترو وڵاخ بدەن کە

بەشی خۆی لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، خۆ ئەگەر وشکە ساڵیش بوو، لەوەڕ نەبوو، خێرا لێخۆڕن هەتا زوو بگەنەماڵەوەو وڵاخەکان لەڕێ ئەوەندەی تر لەڕو لاواز نەبن، ئەگەر دنیابوو بەشەویش لاتاندا بۆ وچان، یا بۆ سەرخەو شکاندن، لەڕێگەکە تۆزێ دوور بکەونەوەو لەسەر چەقی ڕێگەکە وچان مەگرن، چونکە بەشەو ڕێگە دەبێ بەجێگەو ڕێگەی جڕوجانەوەرو مارو مێروو). {تاج/٤، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٤٤١٢} .

## ٨٨٨) سەفەر پارچەیەکە لەئێش و ئازار. (٤٩٣٨)

## بابٌ: السّفَرُ قطْعَةٌ مِنَ العَذابِ

١١١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ ». قَالَ نَعَمْ. {الحديث: ٤٩٣٨ = ٤٩٢٣ فم. تجريد البخاري/٢/٢٣٤، رقم: ٨٣٣ = ١٨٠٤، ٢٠٠١، ٥٤٢٩ فتح الباري + رياض الصالحين/٢/٣٦، رقم: ١/٩٨٤} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سەفەر پارچەیەکە لەئێش و ئازارو سزاو مەینەت، خەوو خۆراک و خواردنەوەتان لێ هەراسان دەکا، جا لەبەرئەوە هەرکە فرمانی خۆتان بەئەنجام گەیاندو مەبەستی سەفەرەکەتان هاتەدی، ئیتر خێرابێ درەنگ بڕۆنەوە بۆلای کەسوکارتان). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٤٣٨٧} .

## ٨٨٩) ناباشە کە ڕێبواری گەڕاوە لەسەفەر، بەشەو لەناکاودا بکا بەماڵدا. (٤٩٣٩ - ٤٩٤٨)

## بابٌ: كَرَاهِيَةُ الطُّرُوقِ لِمَنْ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ لَيْلاً

١١١٨- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً، يَتَخَوَّنُهُمْ أَوْ يَلْتَمِسُ عَثَرَاتِهِمْ. {الحديث: ٤٩٤٧ = ٤٩٣٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٣١ = ١٨٠١. رياض الصَّالحين/٣، تسلسل/١٧٥، رقم: ٩٨٥} :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی نەدەدا کەپیاو، لەشەوا، لەناکاوا خۆی بکا بەماڵا، مەبەستی ئەوەبێ کە ژنەکەی تاقی بکاتەوە ئایا ناپاکی دەکا یانا، یا لەهەڵەو سەرسمی خێزانی خۆی بگەڕێ!!).

١١١٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ لا يَطْرُقُ أَهْلَهُ لَيْلاً، وَكَانَ يَأْتِيهِمْ غُدْوَةً أَوْ عَشِيَّةً. {الحديث: ٤٩٣٩ = ٤٩٢٤ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٣٠ = ١٨٠٠ فتح الباري}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە لەسەفەرو ڕێبواریی دەگەڕایەوە، بەشەو لەناکاودا نەیدەدا بەسەر ماڵو منداڵی دا، بەڵکوو یان سەر لەبەیانی، یان سەر لەئیوارێ دەگەیشتەوە ناو کەسوکاری).
{ریاض/٣، زنجیره: ١٧٦، ژماره: ٩٨٦}.

## ٨٩٠) بانگەشەی پێش دەستپێکردنی جەنگو لەناکاو پەلاماردانی دوژمن (٤٤٩٤ - ٤٤٩٥)

## بَابٌ: فِي الدُّعَاءِ قَبْلَ القِتَالِ وَالإِغَارَةِ عَلَى العَدُوِّ

١١٢٠- عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الدُّعَاءِ قَبْلَ الْقِتَالِ؟ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، قَدْ أَغَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ، وَهُمْ غَارُّونَ وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ وَسَبَى سَبْيَهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ، قَالَ يَحْيَى: أَحْسِبُهُ قَالَ: جُوَيْرِيَةَ أَوْ الْبَتَّةَ ابْنَةَ الْحَارِثِ، وَحَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) وَكَانَ فِي ذَلِكَ الْجَيْشِ. {الحديث: ٤٩٣٩ = ٤٤٨٣ فم. تجريد/٣، لاپەڕە: ١٨٠، رقم: ١٠٨٩ = ٢٥٤١. أبو داود. جهاد: ٢٦٣٣}:

ئیبنو عەون (کە فەرمووده زانێکی گەوره بوو، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نامەیەکم نووسی بۆ نافیعی شاگردی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەبارەی بانگەوازی پێش دەستپێکردنی جەنگەوە، پرسیارم لێی کرد، ئەویش نامەی بۆمن

نووسییەوەو لەوەڵاما فەرمووی: کە ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە وابوو، هەتا بانگیان نەکردنایە بۆسەر ئیسلامو لەپاش مل نەدانو رەتکردنەوەی قەبوولّی پەیامی ئیسلام، ئاگاداریان نەکردنایەتەوە: کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی بەرابەر، پەلاماریان نەدەدانو هەڵمەتیان نەدەبردە سەریان! بەڵام لەوەدوا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلەشکرەوە، لەناکاو دای بەسەر تیرەی بەنی موصطەلەقداو پەلاماری دانو شاڵاوی بۆ بردن، بەبێ ئەوە کە ئاگایان لەخۆیان بێ، لەوکاتەدا ئاژەڵەکانیان لەسەر ئاو بوون، خەریکبوون ئاویان دەدان! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو جەنگەدا پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتنو خێزانی بەتاڵانی بردن، وەهەر لەو رۆژەدا بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جووەیرییەی کچی حاریثی سەرکۆماری ئەو خێڵەی دەست کەوتو مارەی کرد بۆخۆی).

مامۆستاکەی شێخی موسلیم، کە یەحیای کوڕی یەحیای تەمیمیە، فەرمووی: سولەیمی کوڕی ئەخضەری مامۆستام، بەبێ گومان کە فەرمووی: (کچی حاریث) بەڵام وادەزانم ناویشی هێناو بەدەق فەرمووی: (جووەیرییەی کچی حاریثی.... تاد).

نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودایان لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆم، وە عەبدوڵڵا خۆی یەکێك بووە لە بەشداربوانی ئەو سوپایە لەم غەزایەدا. {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤٤٦٢، چ/٤}.

**٨٩١) نامەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پادشاکانی سەردەمی خۆی، داوای لێ دەکردن کە رووبکەنە خودای گەورە. (٤٥٨٥ - ٤٥٨٧)**

**بابُ: كُتُبُ النَبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَم) إلَى المُلُوكِ يَدْعُوهُمْ إلَى اللّه تَعالى**

١١٢١- عَنْ أَنسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَتَبَ إِلَى كِسْرَى وَإِلَى قَيْصَرَ وَإِلَى النَّجَاشِيِّ، وَإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ، وَلَيْسَ بِالنَّجَاشِيِّ الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ رسول الله (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٥٨٥ = ٤٥٧٣ فم}:

کوشـتنه، خـۆ ئەگـەر داوای مـاڵیش دەکـەی، چـەنده داوا دەکـەی دەدرێ پێـت. پێغەمبەریش ئەو رۆژەیش وازی لێ هێنایەوەو بۆ سبەینێ پێی فەرموویەوە: (ئـەی سومامە! لات وایە چیت لێ دەکەم؟). گوتی: هەر ئەوەیە کە ئـەو رۆژە پـێم گوتیـت، ئومێدی خێرت لێ دەکەم! چونکە ئەوەی کەتۆ دەیکوژی شایانی کوشتنە، وە ئـەوەی کەتۆ پیاوەتی لەگەڵ بکەی مایەی سوپاسکردنە، کەواتە بـۆ منـیش چ بمکوژیـتو چ پیاوەتیم لەگەڵدا بکەی جێگەی خۆیەتی، خۆ ئەگەر دەتەوێ بە پارەو ماڵیش بەرم بدەیت، چەندەت دەوێ داوای بکە دەیدەم پێت!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سومامە بەردەن).

سومامە رۆیشت لەناو باخە خورمایەکا، کە لەنزیکی مزگەوتەکەوە بـوو، خـۆی شۆردو غوسلی قەبووڵی ئایینی ئیسلامی کردو هاتەوە بۆ مزگەوتو گـوتی: {أشْـهَدُ أنْ لاَ إلهَ إلاَّ اللّهُ وأشهد أنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُ اللّـهِ} . ئـەی موحەممـەد! بـەزاتی خـودا لەمەو پێش کەس نەبوو لەسەر رووی زەوی، کە بەقەد تۆ رقم لێی بێ، بەڵام ئێستا کـە کـەس نییـە کـە بەقـەد تـۆ خۆشـم بـوێ، هـەروەها ئایینەکـەتو وڵاتەکەیشـت، بەزاتێ کەزاتی خودایە، دیـن نـەبووە کـە بەقـەد دینەکـەی تـۆ رقـم لێـی بـێ بـەڵام ئێستا دینەکەی تۆم لەهـەموو دینێکـی تـر خۆشـتر دەوێ، بـەزاتێ کـەزاتی خودایـە، وڵات نـەبووە کـە بەقـەد وڵاتەکـەی تـۆ رقـم لێـی بـێ، بـەڵام ئێسـتا وڵاتەکـەی تـۆ خۆشەویستترین وڵاتە بەلامەوە، من لەوکاتەدا کە سوارەکانی تۆ گرتمیان دەمویست عەمرە بکەم، بۆ ئەمە چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەریش مزگێنی دایەو فـەرمانی پـێ کرد کەبچێ عەمرەکەی تەواوبکا.

جا کەسومامە دەچێ بـۆ مەککە، بـۆ کردنـی عەمرەکـەی، گوتیـارێ پێـی دەڵێ: ئەوە لـەئایینی خـۆت وەرگـەڕاویتو بوویـت بـە صـابیئی، سـومامە فـەرمووی پێـی: نـەخێر نـەبووم بـە صـابیئی، بـەڵام موسـوڵمان بـوومو ئـایینی پێغەمبـەری راسـتو دروستی خودام وەرگرتووە، کە موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەسا بەزاتی خـودا، تـا ئێوە لەسەر ئەم بارودۆخە ناحەزانەبن لەگەڵ ئیسلامدا، یـەك دەنـك گـەنم چییـە،

له ولآتى يەمامەوە نايەت بۆتان، مەگەر كاتێ بێ بۆتان كە رەزامەنـدى پێغەمبـەرى لەسەربێ!). {تاج/٤، زنجيره: ٧٠، ژماره: ٤٥٣٨، چ/٤}.

## ٩١٩) چۆڵكردنى مەدينە لە جوولەكە. (٤٥٦٦ - ٤٥٧٠)

## بابٌ: إجْلاءُ اليَهُودِ مِنَ المَدِينَةِ

١١٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذْ خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: « انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ »، فَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى جِئْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَنَادَاهُمْ، فَقَالَ: « يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا »، فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « ذَلِكَ أُرِيدُ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا »، فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « ذَلِكَ أُرِيدُ »، فَقَالَ لَهُمُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: « اعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَأَنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَرْضِ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ ». {الحديث: ٤٥٦٦ = ٤٥٥٤ فم. بخاري. جزية: ٣١٦٨. أبو داود. خراج: ٣٠٠٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمزگەوت بووین، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ناومانو فەرمووی: (ئادەی بابڕۆین بۆناو جوولەکەکان). جا لەخزمەتیدا رۆیشتینو چووینە مالّی مالوومەکەیان. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ راوەستاو بانگی کردنو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی جوولەکە! موسوڵمان ببن، سەر ئاسوودەو سەلامەت دەبن).

ئەوانیش بۆ تەفرەدانو چەواشەکاری گوتیان: ئەی باوکی قاسم! تۆ بەئەرکی سەرشانی خۆت هەڵسایتو کارەکەت بەئێمە راگەیاند، ئیتر بەرپرسیاریی دەکەوێتە سەرشانی ئێمە!! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (دەی منیش مەبەستم ئەوەیە، کەئێوە دیان بەو راستیەدا بنێنو پێ لەوە بنێن کەمن پێم راگەیاندوون، دەی موسوڵمان ببن سەر ئاسوودەو سەلامەت دەبن). دووبارە گوتیانەوە: ئەی باوکی قاسم تۆ بەئەرکی سەرشانی خۆت هەڵسایتو کارەکەت

بەئێمە ڕاگەیاند، ئیتر بەرپرسیاری دەکەوێتە سەرشانی ئێمە، نەوەك سەرشانی تۆ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (دەی منیش ئەوەم دەوێ). لەسەری جاری سێیەما فەرمووی پێیان: (بزانن کە ئەم خاکە هی خوداو پێغەمبەری خودایەو مافی ئێوەی پێوە نییە، لەڕاستیدا من دەمەوێ ئەم ولاتەتان پێ چۆڵ بکەم، لەبەرئەوە ئەگەر ماڵێ، شتێکتان هەیە ساخی بکەنەوەو بیفرۆشنو بەخۆشی بڕۆنو ئێرە چۆڵ کەنو سەری خۆتان بەلایەکا دەرکەن! ئەگینا باش باش لێتان روونو ئاشکرابێ کە ئەم ولاتە خاکی خوداو پێغەمبەری خودایەو فڕی ئێوەی بەسەرەوە نییەو ئەگەر بەخۆشی خۆتان نەڕۆن بە زەبری شیرو تیر پێتان چۆڵ دەکەینو ئەوسا تەواو حاڵتان شڕ دەبێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٤٥٦٦. چاپی چوارەم}.

### ٩٢٠) دەرکردنی جوولەکەو گاورەکان لەدوورگەی عەرەب. (٤٥٦٦ - ٤٥٧٠)

### باب: إخراج اليهود والنصارى من جزيرة العرب

١١٥٣ب- عَنِ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سمعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: « لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ حَتَّى لاَ أَدَعَ إِلاَّ مُسْلِمًا». {الحديث: ٤٥٦٩ = ٤٥٥٧ فم}:

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەدەمی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (جوولەکەو گاور لەدورگەی عەرەب دەردەکەمو، موسوڵمان نەبێ کەسی تری تیا ناهێڵم). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٣٥٦٥}.

### ٩٢١) بڕیاری شەرع سەبارەت بەوانە کە جەنگ بەرپا دەکەنو پەیمان دەشکێنن. (٤٥٧١ - ٤٥٧٦)

### باب:الحكم فيمن حارب ونقض العهد

١١٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُقَالُ لَهُ ابْنُ الْعَرِقَةِ، رَمَاهُ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَم) خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ يَعُودُهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمَّا رجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الْخَنْدَقِ وَضَعَ السِّلاَحَ فَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ (عليه السلام) وَهُوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الْغُبَارِ، فَقَالَ: وَضَعْتَ السِّلاَحَ؟ وَاللَّهِ مَا وَضَعْنَاهُ، اخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم): « فَأَيْنَ »؟ فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، فَقَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْحُكْمَ فِيهِمْ إِلَى سَعْدٍ قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ الْمُقَاتِلَةُ وَأَنْ تُسْبَى الذُّرِّيَّةُ وَالنِّسَاءُ وَتُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ، (قال هِشَامٌ: قَالَ أَبِي: فَأُخْبِرْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لَقَدْ حَكَمْتَ فِيهِمْ بِحُكْمِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ». وفي روايـة: «حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ »، وَقَالَ مَرَّةً: « لَقَدْ حَكَمْتَ بِحُكْمِ الْمَلِكِ ». {الحديث: ٤٥٧٣ = ٤٥٥٩ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٢٩٣، رقم: ١٥٥٣ = ٤١٢١، ٣٠٤٣، ٣٨٠٤، ٦٢٦٢ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٢١٦}:

عائیشەی دایکی باوەڕداران (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا، سەعدی کوڕی موعاز پێکرا، پیاوێ لە قورەیش ناوی ئیبنولعەریقە بوو، تیرێکی دا لەرەگی ژیانی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاتۆلێکی لەناو مزگەوتدا بۆ هەڵدا تا لەنزیکەوە خۆی زوو زوو سەردانی بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ غەزای خەندەق تەواو بوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، چەکی داناو خۆی شۆرد، حەزرەتی جوبرائیل (سلاوی لێ بێ) تەشریفی هات بۆلای، تەپوتۆزی بەشداریی کردنی لەشەڕی غەزای خەندەقا لەسەرو گوێلاکی خۆی دەتەکاند، بە پێغەمبەری فەرموو: (ئەوە تۆ چەکت داناوە، گوایە غەزا تەواو بووە؟ سوێندم بەخودا ئێمەی فریشتە هێشتا چەکمان دانەناوەو ئەو چەکەی هەڵمان گرتووە بۆ بەشداری لەجەنگی خەندەقا، هێشتا هەروا پێمان، ئادەی خۆتو سوپاکەت دەرچن بۆیان!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆکێ دەرچینو بۆ کوێ؟؟). جوبرائیل ئاماژەی کرد بۆ جوولەکەکانی بەنی قورەیظە، کەبچێ بۆ سەریان.

هۆزی بەنی قورەیظە لەکاتی غەزای خەندەقا، ئەو پەیمانەی کە هەیانبوو لەگەڵ موسوڵمانانا، پەیمانەکەیان شکان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودا، کە جوبرائیل بۆیهێنابوو، لەشکری بردە سەریانو بیستو پێنج رۆژ لەشکری

ئیسلام دەورەیان دان و گەمارۆی قەڵاکانیان دان، پاش شەڕێکی قورس، چاریان نەماو رازی بوون بەوە کە سەعدی کوڕی موعاز هەر بڕیارو حوکمێ دەربارەی ئەوان دەربکا، ئەوان پێی قاییل بن، چونکە ئەوسی هۆزی سەعدی کوڕی موعاز هاوپەیمانی جوولەکەکانی بەنی قورەیزە بوون، جا جوولەکەکان لەسەنگەرو قەڵاکانیان هاتنە دەرەوەو بەهەر بڕیارو حوکمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەوان دەری بکا پێی رازی بن، پێغەمبەریش بڕیارو حوکمەکەی هەواڵەی سەعدی کوڕی موعاز کردو ئەوی کرد بەسەرپشك، کەهەرچی بڕیارێ، لەبارەی ئەوانەوە دەربکا، موسوڵمانان جێبەجێی بکەن و پابەندی ئەو بڕیارەی سەعدبن. بەڵام لەو دەمەدا سەعد لەوێ نەبوو، ناردیان بەدوایا هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی سەعد! ئەمانە تۆیان کردووە بە حەکەم و سەرپشك و بە فەرمان و بڕیاری تۆ سەبارەت بە چارەنووسی ئەوان لەم شەڕەدا قاییل و رازین و ئێمەیش هەروا).

سەعدیش فەرمووی: دەوا من ئەم بڕیارەیان بۆ دەدەم: کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و خاوو خێزانیان بکرێن بەدیل و کۆیلەو سامانەکانیشیان بکرێن بەتاڵانی جەنگ و دابەش بکرێن بەسەر لەشکری ئیسلاما!).

هیشامی کوڕی عوروەی خوشکەزای عائیشە فەرمووی: باوکم فەرمووی: هەواڵم پێدرا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەعد دەفەرموێ: (بەپێی فەرمانی خودای گەورەو سەروەر ئەم فەمانەت دەرکرد سەبارەت بەوان!) لەگێڕانەوەیەکا: (بەپێی فەرمانی خودا، فەرمانت دا) لەگێڕانەوەیەکی تردا: (بەپێی فەرمانی پادشای گەورە کە خودایە فەرمانت دەرکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٦٨، ٣٤٦٩}.



# ٢٣- نامەی كۆچكردنو غەزەوات
## كتابُ الهجرة والمغازي

### ٩٢٢) كۆچەكەی پێغەمبەرو نیشانەكانی پێغەمبەر. (٧٤٣٨)
### باب: في هجْرة النّبيّ (صلّى اللّهُ عليْه وسلم) وآياته

{بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٤٤٩، زنجیرە: ١٠١ لەژمارە: ٣١٥٨ هەتا كۆتایی باسەكە}.

١١٥٥- عنْ أبى إسْحاق قال: سمعْتُ الْبراء بْن عازبٍ (رضي اللّهُ عنْهما) يقُولُ: جاء أبُو بكْرٍ الصّدّيقُ إلى أبى فى منْزله، فاشْترى منْهُ رحْلاً، فقال لعازبٍ: ابْعثْ معى ابْنك يحْملْهُ معى إلى منْزلى، فقال لى أبى: احْملْهُ، فحملْتُهُ وخرج أبى معهُ ينْتقدُ ثمنهُ، فقال لهُ أبى: يا أبا بكْرٍ حدّثْنى كيْف صنعْتُما ليْلة سريْت مع رسُول اللّه (صلّى اللّهُ عليْه وسلّم)؟ قال: نعمْ، أسْريْنا ليْلتنا كُلّها حتّى قام قائمُ الظّهيرة، وخلا الطّريقُ، فلا يمُرُّ فيه أحدٌ حتّى رُفعتْ لنا صخْرةٌ طويلةٌ لها ظلٌّ لمْ تأْت عليْه الشّمْسُ بعْدُ، فنزلْنا عنْدها، فأتيْتُ الصّخْرة فسوّيْتُ بيدى مكانًا ينامُ فيه النّبىُّ (صلّى اللّهُ عليْه وسلّم) فى ظلّها، ثُمّ بسطْتُ عليْه فرْوةً، ثُمّ قُلْتُ: نمْ يا رسُول اللّه، وأنا أنْفُضُ لك ما حوْلك، فنام، وخرجْتُ أنْفُضُ ما حوْلهُ، فإذا أنا براعى غنمٍ مُقْبلٍ بغنمه إلى الصّخْرة، يُريدُ منْها الّذى أردْنا، فلقيتُهُ، فقُلْتُ: لمنْ أنْت يا غُلامُ؟ فقال: لرجُلٍ منْ أهْل الْمدينة، قُلْتُ: أفى غنمك لبنٌ؟ قال: نعمْ، قُلْتُ: أفتحْلُبُ لى؟ قال: نعمْ، فأخذ شاةً، فقُلْتُ لهُ: انْفُض الضّرْع من الشّعر والتُّراب والْقذى، قال: فرأيْتُ الْبراء يضْربُ بيده على الأُخْرى ينْفُضُ، فحلب لى فى قعْبٍ معهُ كُثْبةً منْ لبنٍ، قال: ومعى إداوةٌ أرْتوى فيها للنّبىّ (صلّى اللّهُ عليْه وسلّم) ليشْرب منْها ويتوضّأ، قال: فأتيْتُ النّبىّ (صلّى اللّهُ عليْه وسلّم) وكرهْتُ أنْ أُوقظهُ منْ نوْمه، فوافقْتُهُ اسْتيْقظ، فصببْتُ على اللّبن من الْماء حتّى برد أسْفلُهُ، فقُلْتُ: يا رسُول اللّه اشْربْ منْ هذا اللّبن، قال: فشرب حتّى رضيتُ ثُمّ قال: « ألمْ يأْن للرّحيل »؟ قُلْتُ: بلى، قال: فارْتحلْنا بعْد ما زالت الشّمْسُ، واتّبعنا سُراقةُ بْنُ مالكٍ، قال: ونحْنُ فى جلدٍ من

الأَرْضِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُتِينَا ، فَقَالَ: « لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ». فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَارْتَطَمَتْ فَرَسُهُ إِلَى بَطْنِهَا أُرَى، فَقَالَ: إِنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا قَدْ دَعَوْتُمَا عَلَيَّ، فَادْعُوَا لِي، فَاللَّهُ لَكُمَا أَنْ أَرُدَّ عَنْكُمَا الطَّلَبَ. فَدَعَا اللَّهَ، فَنَجَا، فَرَجَعَ لاَ يَلْقَى أَحَدًا إِلاَّ قَالَ: قَدْ كَفَيْتُكُمْ مَا هَا هُنَا، فَلاَ يَلْقَى أَحَدًا إِلاَّ رَدَّهُ، قَالَ: وَوَفَى لَنَا.

{الحديث: ٧٤٣٨ = ٧٤٧٣ فم. بخاري. مناقب: ٣٦١٥، ٣٦٥٢، ٣٩٠٨، ٣٩١٧}:

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: بیستم لە بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: ئەبوبەکری صەدیق هات بۆلای باوکم بۆ ماڵەوەی کۆپانە وشترێکی لێ کڕی بە سیازدە درەم، بە عازیبی باوکمی فەرموو: ئەم کوڕەتم لەگەڵ بنێرە، کە هەتا ماڵەوەم ئەم کۆپانەم بۆ هەلگرێ، باوکیشم فەرمووی بەمن: ئادەی بۆی هەلگرە، منیش هەڵم گرتو لەگەڵیدا رۆیشتین بەرەو ماڵی ئەبوبەکر، باوکیشم لەگەڵی هات هەتا بەهای کورتانەکەی لێ وەربگرێ، باوکم عەرزی کرد: ئەی ئەبوبەکر! باسی ئەو شەوەم بۆ بکە کە لەشەوی کۆچا، لەگەڵ پێغەمبەردا شەو رەویتان کرد؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، ئەو شەوە سەراسەر هەمووی بەرێوە بووین، هەتا سبەینێ نیوەڕۆ، رێگەکە چۆڵ بوو، کەسی پیادا نەدەڕۆیشت، لەدوورەوە تاوێرێکی گەورەی درێژمان لێوە دەرکەوت، سێبەرێکی باشی هەبوو، هێشتا هەتاوی تاقی بەیانی لێ نەدابوو، لەلای ئەو تاوێرە لاماندا، چووم لەژێر تاشە بەردەکەدا، لە سێبەرەکەیدا، بەدەستم نووستنگایەکم تەخت کرد بۆ خەوتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڵپۆسێك (فەروەیەك)م تیا راخست، ئەوجا عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموو تۆ لێرەدا بخەوە، من چاودێری ئەم دەوروبەرەت بۆ دەکەم، نەبادا ناحەزی لێ بێ، ئەویش نووست، منیش دەرچووم چاودێری دەوروبەرەکەم دەکرد، تووشی شوانی رانە مەڕێك بووم، رانەکەی دەهێنا بۆ بن تاوێرەکە، ئەویش وەك ئێمە منەی سێبەری دەکرد، چووم بۆلای پێیم گوت: کوڕە! تۆ شوانی کێیت؟ گوتی: شوانی پیاوێکی خەڵکی مەدینەم، پێم گوت: ئەرێ لەڕانەکەتا مەڕی شیردەری واتیادا؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: دەتوانی بڕێ شیرم بۆ

بدۆشی؟ گوتی: بەڵێ باشە، جا مەڕێکی گرت کە بیدۆشێ، منیش پێیم گوت: گوانەکانی بتەکێنە، باشیرەکە موو وخۆڵو پیسی تێ نەکەوێ، ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: بەرائم بینی لاسکایی تەکاندنی گوانی مەڕەکەی دەکردەوە، ئەم دەستی خۆی دەدا بەو دەستیداو دەیتەکاند، لە کاسەیەکی دارینا، بەقەد ژەمی شیری ئاژەڵێکی شیرداری دۆشی. ئەبوبەکر فەرمووی: خۆشم جەوەندەیەکم پێ بوو، ئاوم لێ دادەکرد بۆ خواردنەوەی پێغەمبەرو بۆ دەستنوێژی، فەرمووی: جا گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر، بۆ بن تاوێرەکە، حەزیشم نەدەکرد کە خەبەری بکەمەوە، بەڵام کە گەیشتمە لای روانیم خەبەری بۆتەوە، جا لەجەوەندەکە ئاوم کردە ناو شیرەکە، هەتا بنەکەی سارد بوو، ئەوجا عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو لەم شیراوە نۆش بکە، ئەویش بەدڵی من لێی خواردەوە. ئەوجا فەرمووی: (ئایا کاتی رۆیشتن نەهاتووە؟) گوتم: با کاتیەتی. فەرمووی: پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ کەوتینە رێ.

سوراقەی کوڕی مالیك دەبیستێ کە بێباوەڕەکانی قوڕەیش خەڵاتێکی گەورە دەدەن بەو کەسە، کە موحەممەدو ئەبوبەکر بە زیندوویی، یا بەمردوویی تەسلیم بەوان بکا، لەبەرئەوە خۆی پڕچەك دەکاو بەسواری شوێنیان دەکەوێ بەو نیازە، ئەبوبەکر فەرمووی: کاتێ گەیشتینە زەوییەکی رەقەنی سەخت، روانیمان وا سوراقە وا بەشوێنمانەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! وا دوژمن گەیشتە سەرمان؟ فەرمووی: (خەمت نەبێ خوامان لەگەڵە).

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای شەڕی لە سوراقە کرد، ئیتر هەر چوارپەلی ئەسپەکەی هەتا ژێر سکی رۆچوون بەو زەوییە رەقەنو سەختەدا، وا دەزانم کە شتێکی ئاوا رووی دا، جا سوراقە گوتی: من دەزانم کە ئێوە دووعاتان لێ کردووم، ئێستا دووعام بۆ بکەن، سوێندتان بەخودا بۆ دەخۆم کە پەیمانتان دەدەمێ، ئەگەر لەم کارەساتە رزگارم ببێ، نە شوێنتان بەکەس دەڵێمو نەدەهێڵم کەستان شوێن بکەوێ، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نزای بۆ کرد لەلای خوداو

رزگاری بوو، سوراقەیش بەرەو پاش گەڕایەوەو بەهەر کەسێ دەگەیشت، کەبۆ پێغەمبەرو ئەبوبەکر دەگەڕان، دەیگوت: من ئەم ناوچەیەم پشکنیوە، پێویست بەئێوە ناکا، ئیتر بە هەرکەسێ دەگەیشت بەرەودوا دەیگەڕانەوە. فەرمووی: لەڕاستیدا سوراقە بەڵێنەکەی خۆی کە پێمانی دا بردیە سەر. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٦١ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٦٣}.

## ٩٢٣) باسی غەزای بەدر. (٤٥٩٧)
## باب: فِي غزْوَة بدْر.

{تاج/٤، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٤٥٨٢}

١١٥٦- عَنْ أَنسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِى سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بِرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا، قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّاسَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْرًا، وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلاَمٌ أَسْوَدُ لِبَنِى الْحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِى سُفْيَانَ وَأَصْحَابِهِ؟ فَيَقُولُ: مَا لِى عِلْمٌ بِأَبِى سُفْيَانَ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُخْبِرُكُمْ، هَذَا أَبُو سُفْيَانَ، فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ: مَا لِى بِأَبِى سُفْيَانَ عِلْمٌ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِى النَّاسِ، فَإِذَا قَالَ هَذَا أَيْضًا ضَرَبُوهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَائِمٌ يُصَلِّى، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ انْصَرَفَ وَقَالَ: « وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ »، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « هَذَا مَصْرَعُ فُلاَنٍ ». قَالَ: وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ هَا هُنَا وَهَا هُنَا، قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٥٩٧ = ٤٥٨٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتی کەوا ئەبو سوفیان بە زەوارێکی گەورەی بازرگانییەوە،

لەشامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، راوێژو پرس‌و رای بەیارانی خۆی کرد: ئایا بڕۆین بۆیان یانا، لەپێشدا ئەبوبەکر قسەی کرد، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە قسەکەی ئەو قنیاتی نەکرد، دوا ئەو عومەر قسەی فەرموو، دیسان بەقسەی ئەویش فەرامۆشی بۆ نەهات، جا سەعدی کوڕی عوبادە هەڵسایەوە، فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە کەرووی دەمت لەئێمەیەو لەم راوێژە مەبەستت ئەوەیە کە دەمو دووی ئێمە تاقی بکەیتەوە، دەی بەو کەسە کە گیانی منی وا لەدەسا ئەگەر تۆ بفەرمووی کە بە وڵاخەکانمانەوە تاو بدەینە ناو نێرینەی ئاوی دەریا، بەبێ پەروا، بەبێ چەندو چوون تاو دەدەینە ناوی‌و مادام فەرمانی تۆی لەسەربێ، کۆ لەهیچ ناکەینەوە، یا ئەگەر تۆ بفەرمووی کە هەتا بنعێز، یا هەتا بنی دنیا ماین‌و ئەسپ‌و وڵاخەکانمان بەدوای دوژمندا غاربدەین، ئەوا بەبێ سێی‌و دووکردن بەچوار ناڵە تا ئەوێ غاریان دەدەین‌و بەبێ پەروا دوژمن لە هەرکوێ بێ دەچینە وێزەی، بزانە ئێمە سەرمان لەڕێتایە! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی خۆشەویست! دڵ لەدڵ نەدەی، لەتۆ فەرمان‌و لەئێمە بەجێهێنان!

فەرمووی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تیژی کردینەوەو تێزی کردین، هەتا کەوتینە رێ‌و رۆیشتین هەتا لەشکرەکەمان گەیشتە بەدرو لەوێ لایاندا، لەوێ ئاوکێشەکانی قوڕەیش هاتن بۆ ئاو بردن، خولامێکی رەشیان تیابوو هی خێڵی بەنی حەجاج بوو، هاوڕێکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گرتیان‌و پرسیاری ئەبو سوفیان‌و کاروانەکەیان لێ کرد، گوتی: ئاگام لە ئەبو سوفیان نییە، بەڵام ئا ئەوە ئەبو جەهل‌و عوتبەو شەیبەو ئومەییەی کوڕی خەلەفە لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا هاتوون بۆ جەنگ لەگەڵ ئێوەدا، کەوای دەگوت، لەوان وابوو کە دەیەوێ چەواشەیان بکا، لەبەرئەوە دەستیان کرد بەلێدانی، ئەویش لەتاواندا دەیگوت: باشە راستتان پێ دەڵێم ئەوە ئەبو سوفیانە، بەڵام کەوازیان لێ دەهێناو لێیان دەپرسییەوە، هەمان قسەی پێشووی خۆی دووبارە دەکردەوە، ئیتر هەروەها، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راوەستابوو نوێژی دەکرد، کەچاوی بەم حاڵە

کەوت سڵاوی نوێژەکەی دایەوەو فەرمووی: (بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کە یەزدانی مەزنە، ئەم خولامە کە قسەی راستتان بۆ دەکا، ئێوە لێی دەدەن و کە درۆیشتان بۆ دەکا وازی لێ دەهێنن) لەپاشا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە شوێنی کوشتنی فیسارە کەسیانەو ئەوەیش شوێنی ئەوەو ئەوەی تریانە) حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی لەسەر رووی عەردەکە لێرەو لەوێ جێگەی تۆپینی یەك بەیەکی ئەو تۆپیوانەی دیاری دەکرد.

ئەنەس فەرمووی: هیچ کامێکیان لەو شوێنەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەسەردانا و دیاری کرد، بۆ جێی کوژرانیان هەڵیان نەبواردو هەر کەسەیان لەجێگەی دیاری کراوی خۆیدا کوژرا!!).

١١٥٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بُسَيْسَةَ عَيْنًا يَنْظُرُ مَا صَنَعَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَ، وَمَا فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: لاَ أَدْرِي مَا اسْتَثْنَى بَعْضَ نِسَائِهِ، قَالَ: فَحَدَّثَهُ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَتَكَلَّمَ فَقَالَ: « إِنَّ لَنَا طَلِبَةً، فَمَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا فَلْيَرْكَبْ مَعَنَا »، فَجَعَلَ رِجَالٌ يَسْتَأْذِنُونَهُ فِي ظُهْرَانِهِمْ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: « لاَ إِلاَّ مَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا »، فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ حَتَّى سَبَقُوا الْمُشْرِكِينَ إِلَى بَدْرٍ، وَجَاءَ الْمُشْرِكُونَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى أَكُونَ أَنَا دُونَهُ »، فَدَنَا الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ »، قَالَ: يَقُولُ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ الأَنْصَارِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): يَا رَسُولَ اللَّهِ جَنَّةٌ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ؟ قَالَ: « نَعَمْ »، قَالَ: بَخٍ بَخٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ »؟ قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ رَجَاءَةَ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا، قَالَ: « فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا »، فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرَنِهِ فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ، ثُمَّ قَالَ: لَئِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ، قَالَ: فَرَمَى بِمَا كَانَ مَعَهُ مِنَ التَّمْرِ، ثُمَّ قَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ. {الحديث: ٤٨٩٢ = ٤٨٧٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٤٢ = ٤٠٤٦ فتح}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوا کاروانێکی قورەیش بەسامانێکی زۆرەوە لەشام دەگەڕێتەوە، دوورنییە کە قورەیش ئەو سامانە لەدژی موسوڵمانان بەکاربهێنێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوسەیسەی کوڕی عەمری ئەنصاری نارد، کە بچێ ببێ بە خەفێو هەواڵەکانی ئەو کاروانە کە بەسەرۆکایەتی ئەبو سوفیان بوو بدزێو بیانهێنێ بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا بوسەیسەیش بەم ئەرکە هەڵساو هاتەوە بۆلای پێغەمبەر، لەو کاتەدا بەس من لەماڵەوە بووم‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەسی ترمان لەگەڵدا نەبوو، ثابیت فەرمووی: نازانم ئەنەس فەرمووی: کە هەر من‌و پێغەمبەر لەماڵەوە بووین، یان فەرمووی: بەس من‌و پێغەمبەرو هەندێ لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر لەماڵەوە بووین، جا بوسەیسە ئەوەی کە دەیزانی لەبارەی کاروانەکەوە عەرزی پێغەمبەری کرد: فەرمووی: ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ دەرچوو بۆناو هاوڕێکانی‌و قسەی بۆ کردن‌و فەرمووی: (دەرچوونێکمان هەیە، دەڕۆین بۆ مەبەستێ، هەرکەسێ ولاخی سواری ئامادەی هەیە، با سواربێ‌و لەگەڵ ئێمەدا بەرەو ئەو مەبەستە دەرچێ). هەندێ پیاو داوای مۆڵەتیان لێی کرد، تا بچن ولاخەکانیان لەسەرووی مەدینەوە بهێننەوەو لەخزمەت پێغەمبەردا دەرچن بۆ ئەوکارە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەودای ئەوەمان نییە، کێ ولاخەکەی ئامادەیە، با ئەوە خۆی ئامادە بکا، هەتا زوو دەرچین).

ئەوجا پێغەمبەرو هاوەڵانی دەرچوون‌و لەپێش بتپەرستەکاندا گەیشتنە سەر ئاوەکەی بەدر، لەولاشەوە لەشکری بتپەرستەکان هاتن‌و بەرابەر لەشکری ئیسلام وەستان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان پەلە لەهیچ مەکەن‌و لەخۆتانەوە شتێ مەکەن تاخۆم پێتان نەڵێم) جا هاوبەش پەیداکەرەکان بەرە بەرە نزیکەوە بوون، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی هەستن بۆ شادبوون بەو بەهەشتە بەرینەی کەهەر پانییەکەی بەقەد رووبەری ئاسمانەکان‌و

زەوی دەبێ!) فەرمووی: جا عومەیری کوڕی حەمامی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووت بەهەشتێ پانییەکەی بەقەد رووبەری ئاسمانەکانو زەوییە؟ فەرمووی: (بەڵێ). عومەیر فەرمووی: (بەه بەه) حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەبەستت چییە لەگوتنی ئەم بەه بەهە؟ بەنیازی پاك دەیڵێیت یا بەنیازێ تر؟) عومەیر فەرمووی: (نا بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! تەنها بەمەبەستی ئەوە دەیڵێم کەمن لەخەڵکی ئەو بەهەشتە بمو بەس بەئومێدی ئەوە گوتم!). پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی تۆ بەهەشتیتو یەکێکیت لەدانیشتوانی ناو ئەو بەهەشتە).

جا عوومەیر چەند دەنکێ خورمای لەتیردانەکەی دەرهێناو دەستی کرد بەخواردن لێیان، ئەوجا فەرمووی: (ئەوەندە بژیم کە هەتا ئەم خورمایانەم بەتەواوی بخۆم، ئەوە ژیانێکی دوورو درێژەو تەواو نابێ) جا هەرچی خورمای پێ مابوو، فرێی داو دەستی کرد بەجەنگینو لەگەڵ دوژمندا جەنگا هەتا کوژراو شەهید بوو. {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٣٣٠} + {تاج/٤، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٤٥٦٢}.

**٩٢٤) فریشتەی فریا، یاریدەی لەشکری ئیسلام دەدەن. گۆڕینەوەی دیل بەدیل. یا بەردانیان بەرابەر بەسەرانە. حەلاڵکردنی تالانی بۆ لەشکری ئیسلام**
**بابٌ: في الإمْداد بالملائكة وفداءُ الأساری وتحليل الغنيمة**

١١٥٨- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَنِی عُمَرُ بْنُ الْخَطَّاب (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ، نَظَرَ رَسُولُ اللَّـه (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) إلَـى الْمُشْرِكين وَهُمْ أَلْفٌ، وَأَصْحَابُهُ ثلاَثُمائَةِ وَتِسْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً، فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) الْقِبْلَةَ ثُمَّ مَدَّ يَدَيْـه فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّه: « اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ آتني ما وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ إنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدْ فِی الأَرْضِ »، فَمَازَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّه مَادًّا يَدَيْه مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَة حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْه فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِه، وَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّه كَذَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (إذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ، فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّی مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ

الْمَلائِكَة مُرْدِفِينَ)، فَأَمَدَّهُ اللَّهُ بِالْمَلائِكَة، قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: فَحَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ، إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ: أَقْدِمْ حَيْزُومُ، فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ، فَخَرَّ مُسْتَلْقِيًا، فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ فَاخْضَرَّ ذَلِكَ أَجْمَعُ، فَجَاءَ الأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: « صَدَقْتَ ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ، وَأَسَرُوا سَبْعِينَ (قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ): فَلَمَّا أَسَرُوا الأُسَارَى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: « مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلاءِ الأُسَارَى »؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ، أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً فَتَكُونُ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ، فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلإِسْلامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عليه وسَلَم): « مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ »؟ قَالَ: قُلْتُ: لا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ، وَلَكِنِّي أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، فَتُمَكِّنَ عَلِيًّا مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ، وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلانٍ (نَسِيبًا لِعُمَرَ) فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَإِنَّ هَؤُلاءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا، فَهَوِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ، وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ، جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ وَهُمَا يَبْكِيَانِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِي أَنْتَ وَصَاحِبُكَ، فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ، وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ، لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ »، - شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) -، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ)، إِلَى قَوْلِهِ: (فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلالاً طَيِّبًا) فَأَحَلَّ اللَّهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ. {الحديث: ٤٥٦٣ = ٤٥٥١ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە بۆم فەرمووی: لەڕۆژی غەزای بەدردا، پێغەمبەر (درودو سڵاوو رەحمەتو میهرەبانیو سۆزی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێو سەرو گیانوماڵو مناڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی

گۆڕی پیرۆزی بێ) کاتێ تەماشای لەشکری ناموسوڵمانەکانی کرد زۆر بوون، هەزار کەس بوون، هاوڕێکانی خۆشی لەچاو ئەوانا زۆر کەم بوون، دەوری سێ سەدو نۆزدە پیاو بوون، رووی کردە رووگەو هەردوو دەستی درێژکرد بەرەو رووگەو هەردوو دەستی بەرزەوە کرد، بەدەنگی بەرز دەستی کرد بەهاوارکردن لەخوداو دەیفەرموو: (خودایە! ئەی پەروەردگاری گەورەم! ئەو بەڵێنو گفتەی کەداوتە پێم، جێبەجێی بکە بۆم، خودایە! خۆت ئاگات لەبارو دۆخەکەیە، ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسوڵمانە بفەوتێ، ئیتر لەسەر پشتی گۆی زەوی کەسێ نامێنێ کەتۆ بپەرستێو بەندەیی ساغت بۆبکا).

ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە سەرگەرمی دووعاو نزاو پاڕانەوە بوو لەخوداو دەستەکانی بەرز دەکردنەوەو هاواری لەخودای خۆی دەکرد، هەتا بەرماڵەکەی لەشانی کەوتە خوارێ، ئەبوبەکر چوو بەرماڵەکەی هەلگرتو دایەوە بەسەر شانیاو لەپشتەوە باوەشی پیادا کردو پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر لالایتەوە لەخودای خۆت، ئیتر بەستە، بێ گومان کەخودا ئەو بەڵێنەی داوێتی پێت بۆتی بەجێ دەهێنێ، جا خودای گەورەو سەروەر ئەمەی نارده خواردەوە:
{إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ - سورة الأنفال — ٨/٩}. واتە:

ئاڵای حەق سەرکەوتو سەری ناحەق شۆڕ بوو، ئەمەش لەوکاتەدا بوو، کەئێوە بەکوڵی دڵو بەسۆزی سینە لە خودای خۆتان دەلالانەوەو داوای هاناو پەناتان لێی دەکرد، ئەوەبوو خودای گەورەش هات بەدەنگتانەوەو مزگێنی سەرکەوتنی پێ دانو فەرمووی: ئەوا بۆ دڵنیایی ئێوە، فریشتەی فریا لەپێشتانو لەپاشتانەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ، بەرودوا هاتنو دێن بۆ یارمەتیتان، وا هەزاریان گەیشتنە جێو دابەزین! وەدوو هەزاری تریش لەدوا ئەمانەوە وەهان بەرێوە).

ئیتر خودای گەورە وەك لەم ئایەتەدا رووونی کردەوە، بەهۆی فریشتەوە کۆمەکی پێغەمبەری کرد.

ئەبو زەمیل (كەناوی سیماكی ئەل‌حەنەفییە) كە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: لەڕۆژی بەدردا، پیاوێكی موسوڵمان دەنیشێتە سەر پیاوێكی فرە خوا (هاوبەش پەیداكەر - موشریك) لەوكاتەدا كەوا خەریكە راوی دەنێ، لەپڕ لەژوور سەریەوە لەلای ئاسمانەوە شەقەی قەمچیو دەنگی تێخوڕینی سوارێ دەبیستێ، كە لەئەسپەكەی ژێری دەخوڕێ، كەناوی ئەسپەكەی حەیزووم دەبێو یای لێ دەكاو تێی دەخوڕێ: ئەی حەیزووم! پێشكەوە.

موسوڵمانەكە تەماشا دەكا وا كابرای بتپەرست بەبێ ئەوەی كە ئەم هیچی لێ بكا، لەخۆیەوە بەپشتا دەكەوێو لەسەر گازەرەی پشت دەتلیسێتەوەو دەمرێو سارد دەبێتەوە، كە سەرنجی دەدا دەڕوانێ وا لووتی كابرا دابڕاوەو روومەتی بەقەد جێگەی قەمچی فریشتەكە شەق بووەو جێگەی قەمچییەكە بە لووتو روومەتیەوە، وەك خەتێ خوێنی تێزاوەو شین هەڵگەڕاوە، پیاوە موسوڵمانەكە ئەنصاری بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەم داستانەی عەرزی كرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (راست دەكەی! ئەو فریشتەیە لەو هێزەیە كە لەئاسمانی سێیەمەوە هاتوون، بۆ یارمەتیی ئێوە!) ئەو رۆژە موسوڵمانەكان حەفتا كەسیان لە ناموسوڵمانەكان كوشتو حەفتا كەسیشیان لێ دیلكردنو سەركەوتنو پیرۆزییەكی گەورەیان لەسایەی خودای گەورەوە تۆمار كرد.

ئەبو زەمیل فەرمووی: ئیبنو عەبباس فەرمووی: جا كاتێ موسوڵمانان دیلەكانیان یەخسیر كرد لەڕۆژی بەدردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبوبەكرو عومەری فەرموو: (بۆ ئەم دیلانە ئێوە راتان چۆنە؟). ئەبوبەكر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمانە خزمو كەس‌وكاری خۆمانن، هەموو ئامۆزاو هۆزی خۆمانن، من وا بەباش دەزانم كە سەرانەیان لێ وەربگری، ئەو فیدیەو سەرانەیە دەبێ بەهێزو هەناو بۆمان بەرابەر بەكافران، سا بەڵكوو خودایش بیانهێنێتە سەر رێی ئیسلامەتی، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی عومەر! ئەی تۆ رات

چۆنە، تۆ دەڵێی چی؟ فەرمووی: نەبەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! مـن رام وانییـە، من ئەم رایەی ئەبوبەکر بەباش نازانم، بەڵام من رام وایـە کـەتۆ رێگـەمان بـدەیتو فەرمان بکەیت کە یەکە یەکە بدەین لەگەردنیان، عەقیل بدەرە دەست عـەلی بـرای کە لەگەردنی بدات، وە فیسارە کەس کەخزمی منە، بیدەرە دەست من تـا بەدەسـتی خۆم بدەم لەگەردنی، چونکە ئەمانـە سـەرۆكو پێشـەوای میللـەتی کـوفرنو گـەورە گەورەکانی جیهانی بێ ئایینین، ئەگەر ئەمانە سەرەو نگوون بکرێن، قـەڵای کـوفرو بتپەرستی دەتلیسێتەوە!

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆشـی حـەزی لەقسـەکەی ئەبوبـەکر زیـاتر بـوو، وەزۆر هەوەسـی لەقسـەکەی عومـەر نـەبوو، وە لەئەنجامدا رایان هاتە سەر وەرگرتنی سەرانە (فیدیە) کەچی بۆ سـبەینێ کەچـووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) روانیم کـەوا پێغەمبـەرو ئەبوبـەکر پێکـەوە دانیشتوون دەگرین، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو خـۆتو هاورێکـەت لەبەرچی دەگرین، ئەگەر بزانم گریان هەڵ دەگرێ ئەوا منیش لەگەڵتاندا دەگـریم، ئەگەرنا هەر هیـچ نـەبێ منیش لەبەر دڵی ئێوە خۆم دەکەمە گریان؟! ئەویش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ ئەوە دەگـریم کـە هاورێکـانی تـۆ راوێـژیان بـۆ کـردم، کـە سـەرانە وەربگـرین لـە دیلـەکانی بـەدرو نـەیانکوژین، ئـەوەبوو وامـان کـرد، بـەڵام ئەوەتانێ لەپەنای ئەم درەختەدا کەوا لەپەنامدا، ئەو سزایەی کـەخودا ناردوویـەتی بۆیان، لەسەر ئەو راوێژە پێم نیشاندرا، جا خودای گەورەو سەروەر ئـەم ئایەتانـەی نارده خوارەوە:

{مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ -الأنفال- ٨/٦٨ - ٦٩}:

واتـە: لەسـەرەتای دامەزرانـدنی ئایینـەوە، نابـێ پێغەمبـەرانو پـەیڕەوانیان چاویان لەماڵی دنیاو پڕوپیتی ئەم کۆنە جیهانە بێ، یا خەریکی دیـل راگـرتن بـنو

خۆیان بەشتی واوە خەریك بكەن، هەڵویست زۆر ناسكە، كە هەل لەكیس چوو لەكیس دەچیو ناگەڕێتەوە، دەشێ زەبرو زەنگ بنوێننو خوێنی دوژمنی دینتان بەلافاو بڕێژن، وا مەزانن كەخودا خوێن رشتنی زۆری پێ خۆشە نەء، بەڵام خودا بەرژەوەندی ئێوەی دەوێ، خۆی تەواناو دانایە، لەهەموو كەسێ لەشت باشتر دەزانێ، چاوتان لەفەرمایشتی ئەوبێ، گوێ بەلاژگە لاژگی گێرە شێوێن مەدەن، كە دەڵێن: ئاشتی سەرچاوەی بەهەشتی هەردوو جیهانە، لەسەر ئەمەی كە كردتان خەریك بوو خودا تۆڵەیەكی گەورەتان لێ بستێنێ، بەڵام نامەی ئەزەلی لەوحولـەحفووز فریاتان كەوت، دەی بخۆن لەدەستكەوتی ئەم جەنگەتان بە حەڵاڵیو بەپاكی، ئەم رازو گلەییە بۆئەوە نییە كە ئەوەتان لێ حەرام بێ، بەڵام سەر رشتەی كار ئەوەیە كە هەمیشە لەخودا بترسنو لەفەرمانی دەرمەچن، بەڕاستی خودای ئێوە گەلێ لێبوردەو میهرەبانە).

ئیتر ئاوا بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەستكەوتی جەنگی بێباوەڕانی بۆ موسوڵمانان رەواو حەڵاڵ كرد. {تاج/٤، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٤٥٧٨، ٤٥٧٩ + تاج/٤، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٨٧٨، ٣٨٨٩}.

## ٩٢٥) قسەكردنی پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەر بێ) لەگەڵ كوژراوانی بێباوەڕەكانی غەزای بەدر لەپاش مردنیان. (٧١٤٠ - ٧١٥٣)
## باب: كَلامُ النبيِّ (صلَّى اللهُ عليْهِ وسلم) لِقتْلى بَدْرٍ بَعْدَ مَوْتِهِمْ

١١٥٩- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رضِيَ اللهُ عنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَركَ قَتْلَى بَدْرٍ ثَلاَثًا ثُمَّ أَتاهُمْ، فَقَامَ عَلَيْهِمْ فَنَادَاهُمْ فَقَالَ: « يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، يَا أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، يَا عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، يَا شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، أَلَيْسَ قَدْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا، فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقًّا »؟ فَسَمِعَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَوْلَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَسْمَعُوا وَأَنَّى يُجِيبُوا وَقَدْ جَيَّفُوا؟ قَالَ: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ وَلَكِنَّهُمْ لاَ يَقْدِرُونَ أَنْ يُجِيبُوا »، ثُمَّ أَمَرَ بِهِمْ فَسُحِبُوا فَأُلْقُوا فِي قَلِيبِ بَدْرٍ. {الحديث: ٧١٥٢ = ٧١٧٩ فم. تجريد/١/١٩٠، رقم: ١٧٢

= ٢٤٠، ٢٩٣٤، ٥٢٠، ٣١٨٥، ٣٦٦٠، ٣٨٥٤، ٣٩٦٠. نســـــائی. جهـــــاد: ٣٠٦ + تجريد/٤، رقم: ١٥٢٧ = ٣٩٧٦}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **تاسێ** ڕۆژ وازی لە کوژراوەکانی جەنگی بەدر هێناو سەری لێ نەدان، ئەوجا چوو بۆلای لاشەکانیان، لەدیاریان ڕاوەستا، کە لاشەی بیستو چوار کەسیان بوو، لەگەورە پیاوانی بێباوەڕانی قوڕەیش، ئەوجا یەکە یەکە بەناوی خۆیانەوەو بەناوی باوکیانەوە، بانگی دەکردنو دەیفەرموو: ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام!، ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف!، ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە!، ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە!، ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاصڵ کردو ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایەو لەدنیادا موسوڵمان ببونایەو لەفەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو ئەم ڕۆژە ڕەشەتان بەسەر خۆتان نەهێنایە، دەی بزانن کەئەوا ئێمە لەسایەی خوداوە بە ئاواتی خۆمان گەیشتینو ئەو موژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وادەی پێدابووین دەستمان کەوتو بەچاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەیش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوونو ئەو هەڕەشەو ئێشو ئازارو سزایەی کەخودا وادەو بەڵێنی ئەوەی پێتان دابوو بەچاوی خۆتان دیتان!). کاتێ ئیمامی عومەر گوێی لەم قسانەی پێغەمبەر بوو (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! قسەی چی لەگەڵ ئەم لاشە بێ گیانانەدا دەکەی، ئەمانە چۆن گوێیان لەقسەیەو چۆن دەتوانن کە وەڵام بدەنەوە، پاش ئەوە کە مردوونو لاشەکەیان گەنیوەو بۆگەنی کردووە؟ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کە دیارە خودای گەورەو سەروەرە، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، بەڵام ئەوەندە هەیە کەئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە!). ئەوجا لاشەکانیان بەکێش کردو فڕەیان دانە ناو بیرێ لە بیرە کۆنەکانی بەدرەوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٤٥٨٠}.

## ٩٢٦) باسی غەزای ئوحود. (٤٦١٧ - ٤٦٢٣)

## باب: فِی غَزْوَةِ أُحُدٍ

١١٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أُفْرِدَ يَوْمَ أُحُدٍ فِي سَبْعَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ، فَلَمَّا رَهِقُوهُ قَالَ: « مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا وَلَهُ الْجَنَّةُ؟ أَوْ هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ؟». فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ رَهِقُوهُ أَيْضًا فَقَالَ: « مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا وَلَهُ الْجَنَّةُ أَوْ هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ »؟ فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قُتِلَ السَّبْعَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِصَاحِبَيْهِ: « مَا أَنْصَفْنَا أَصْحَابَنَا ». {الحديث: ٤٦١٧ = ٤٦٠٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای ئوحوددا، ناموسوڵمانەکان، پێغەمبەرو حەوت کەس لەیاریدەدەران (ئەنصار)و دووکەس لەکۆچکاران (موهاجیرین) لە کۆمەڵەی لەشکری موسوڵمانان دابڕ دەکەن‌و ئابلۆقەیان دەدەن، کە تەنگیان پێ هەڵدەچنن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی بەریان بگرێ بەهەشت بۆ ئەو) یا دەفەرموێ: (هەرکەس پێشیان لێ بگرێ‌و تەسیان پێ بداتەوە، هاوڕێی خۆم دەبێ لەبەهەشتا).

پیاوێ لە یاریدەدەرەکان بۆیان دەچێتە پێشەوەو شەڕیان لەگەڵدا دەکاو ماوەیێ پێشیان پێ دەگرێ هەتا دەکوژرێ، دیسان لەشکری بێباوەڕەکان زۆریان بۆ دێننەوەو تەنگیان پێ هەڵدەچیننەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان فەرمایشتی پێشین دەفەرموێتەوە، هەمدیسان پیاوێ تر لە یاریدەرەکان دەچێتە پێشەوەو پێشیان پێ دەگرێ‌و دەجەنگێ لەگەڵیانا هەتا ئەویش دەکوژرێ، ئیتر ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە، یاریدەدەرەکان هەر حەوتیان سەرجەم دەکوژرێن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدوو هاوڕێ کۆچکارەکانی خۆی دەفەرموێ: (بێ ویژدانیمان کرد لەگەڵ ئەم هاوڕێ یاریدەرانەماندا کە ئەوان یەکە یەکە کوژران‌و ئێمەش سەلامەت دەرچووین!).

## ٩٢٧) زامداربوونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕۆژەکەی غەزای ئوحوددا. (٤٦١٧ - ٤٦٢٣)

## باب: جرح النبي (صَلَّى اللّٰهُ عليْه وسلّم) يوم أحد

١١٦١- عَنْ أَبِي حَازِمٍ: أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ الساعدي يُسْأَلُ عَنْ جُرْحِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمَ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) تَغْسِلُ الدَّمَ، وَكَانَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَسْكُبُ عَلَيْهَا بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الْمَاءَ لاَ يَزِيدُ الدَّمَ إِلاَّ كَثْرَةً، أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَادًا، ثُمَّ أَلْصَقَتْهُ بِالْجُرْحِ فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ). {الحديث: ٤٦١٨ — ٤٦٠٦ فم. بخاري. جهاد: ٢٩١١، ٤٠٧٥، ٥٧٢٢}:

ئەبو حازم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەهلی کوڕی سەعدی ئەل-ساعیدیم بیست، کاتێ پرسیاری بریندداربوونی پێغەمبەریان لەرۆژی ئوحوددا لێ کرد، فەرمووی: لەرۆژی هەراکەی ئوحوددا، دەموچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زامدار بوو، خوێن بەدەموچاویا هاتە خوارەوەو ددانە چوارینە (روباعییە)کەی لەریزی لای راستی، لە خوارەوە شکا، خوودەکەی لەسەریدا شکا، کاتێ شەڕ تەواو بوو، لەشکری بێباوەڕەکان بەسەرکەوتوویی گەڕانەوە بۆ مەککە، ژنان لەمەدینە دەرچوون، چوون بۆ کۆمەکی هاوەڵان، فاتیمەی کچی پێغەمبەریش لەگەڵیانا بۆ ئەم مەبەستە دەرچوو، جا عەلی لە قەڵغانێکا ئاوی دەهێناو دەیکرد بەدەستی فاتیمەداو فاتیمەیش خوێنەکەی دەشۆری، کاتێ فاتیمە (رەزای خودای لێ بێ) کەڕوانی وا خوێنەکە بە ئاوەکە زیاتر دەبێ، چوو پڕ زۆڵێ حەسیری هێناو سووتاندیو کردی بەسووتوو، ئەوجا سووتووەکەی دانا لەسەر زامەکە، ئیتر خوێنەکە وەستایەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٣٠١٣ چاپی چوارەم} + {تاج/٤، زنجیرە:٤، ژمارە: ٣٧٧٧}.

١١٦٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَمَ) كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ، وَشُجَّ فِي رَأْسِهِ فَجَعَلَ يَسْلُتُ الدَّمَ عَنْهُ، وَيَقُولُ: « كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ، وَكَسَرُوا رَبَاعِيَتَهُ، وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ»؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ). {الحديث: ٤٦٢١ = ٤٦٠٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٤٥ = ٤٠٦٨، ٤٠٦٩}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی هەرای ئوحوددا، ددانی چوارینەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای راستی ریزی خوارەوەی شکا، وە سەری شکاو ناوچەوانی شکاو خوێن بەروویدا هاتە خوارەوە، خۆش خۆش خوێنەکەی لەخۆی دەسڕی‌و دەیفەرموو: (هۆزێ کە نارەوایی ئاوا لە پێغەمبەری خۆیان بکەن، سەری بشکێنن‌و رووی زامار بکەن‌و ددانە چوارینەکەی بشکێنن، چۆن چۆنی سەر دەکەون‌و رزگاری دابین دەکەن، ئەمەیش لەکاتێکدا بێ کەئەو بانگیان بکا بەدڵسۆزانە بۆلای رەحمەت‌و بەهرەو نیعمەتی باوەڕ بەخوداو رێگەی راستیان پێ نیشان بدا، کەچی ئەوان بە پێچەوانەوە ئەو بانگ بکەن بۆناو ئاگری دۆزەخ).

جا بەم بۆنەیەوە خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ — ئالی عیمران — ١٢٨/٣}. {تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٧٧، ٣٧٧٦}. بڕوانە نەخشەی ددان لەژمارە: ١٥٤٥ تەجرید، لاپەڕە: ٢٨٣، بەرگی: ٤}.

### ٩٢٨) لەڕۆژی غەزای ئوحوددا جوبرائیل‌و میکاییل لەباتی پێغەمبەر دەجەنگان. (٥٩٦١ - ٥٩٦٣)

### باب: قتالُ جبريل و ميكائيل عَنْ النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) يوْم أحُد

١١٦٣- عَنْ سَعْدِ بن أبي وقّاص (رضيَ اللهُ عَنْهُ): رَأَيْتُ عَنْ يَمينِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَعَنْ شِمَالِهِ يوْمَ أُحُدٍ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا ثِيَابُ بَيَاضٍ، مَا رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. يَعْنِي جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ). وفي روايةً: يقاتلان عنه كأشد القتال.
{الحديث: ٥٩٥٩ = ٥٥٦٠ فم. تجريد/٤/٢٨١، رقم: ١٥٤٣ = ٤٠٥٤ فتح الباری}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی شەڕی ئوحوددا لەلای راستی پێغەمبەرو لەلای چەپیەوە، دوو پیاوی جل سپیم دی، شەڕێکی زۆر گەرمیان بەدەوری حەزرەتدا دەکردو ئاگادارییان دەکرد، نە لەوەپێش ئەوانەم دیبوو، نە لەوەپاش دیمنەوە، ئەو دوو پیاوە حەزرەتی جوبرائیل‌و میکائیل بوون).
{تاج/٤، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٤٥٩١}.

**٩٢٩) خودا زۆر تووڕەیە لەکەسێ پێغەمبەری خودا بیکوژێ. (٤٦٢٤)**
**باب: إشْتَدَّ غضبُ اللّهِ علَى مَنْ قتلَهُ رَسُولُ اللّه (صلَى اللّهُ عليْه وسلم)**

١١٦٤- عَنْ أبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا هَذَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) »، وَهُوَ حِينَئِذٍ يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى سَبِيلِ اللَّهِ ».
{الحديث: ٤٦٢٤ = ٤٦١٢ فم. تجريد/٤/٢٨٨، رقم: ١٥٤٨ = ٤٠٧٣ فتح البارى} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رقو تووڕەیی خودا تەواو تاوی سەندووە دژی ئەو کۆمەڵەی کە ئاوایان لە پێغەمبەری خودا کردووە) پێغەمبەر ئاماژەی کرد بۆ ددانە چوارینەکەی خۆی کە لەغەزای ئوحوددا هاوبەش پەیداکەرەکان شکاندبوویان. هەروا فەرمووشی: (کوورەی رقو قینو قاری خودا، جۆش دەسەنێت لەئاستی ئەو کەسە کە پێغەمبەری خودا بەدەستی خۆی بیکوژێ، لەپێناوی سەرکەوتنی ئایینی خودادا).

**روونکردنەوە:**

١- لەغەزای ئوحوددا کۆمەڵێ پێکان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا، چەند زامێکی گەورە گەورە، لەچەند جێگەیەکی لەشی کرا، دەموچاوی زامار بوو، ددانە چوارینەی لەلای راستی ریزی خوارەوەی شکا، سەری شکا، لێوی خوارەوەی زامار بوو، تەوێڵی زامار بوو، دوو ئەڵقەی کڵاو زریەکەی هەڵچەقێنە کوڵمی، کڵاو زریەکەی لەسەریا شکا، توێخی کڵاوەی ئەژنۆی لێبۆوە، دەوری حەفتا شمشێر بەر رووی کەوت خودا لەهەموویان پاراستی، ئوبەییەی کوڕی خەلەف هەڵی کوتایە سەریو هێرشی بۆیبردو سوێندی خوارد، کە ناگەڕێتەوە هەتا موحەممەد نەکوژێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو ناتوانێ من بکوژێ بەڵکوو من ئەو دەکوژم).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدرزی زریەکەیەوە رمێکی تێ سرەواند، بەرشوێنی کاریگەری کەوتو وەك گا کەوتە سەر زەویو دەستی کرد بە بۆڕە بۆڕ، کۆمەڵەکەی هەڵیان گرتو بردیان، رۆژێکی نەبرد کەتۆپیو گیانی بە دۆزەخ شادبوو. {بڕوانە: تەجرید/٤، لاپەڕە: ١٨٨. روونکردنەوە. فتح الباری رقم: ٤٠٧٣}.

**٩٣٠) ئازاردانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەنی هۆزەکەیەوە.**

**(٤٦٢٥ - ٤٦٣٧)**

**بابٌ: مَا لَقِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ أَذَى قَوْمِهِ**

١١٦٥- عَنِ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: « لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ، وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ بِ(قَرْنِ الثَّعَالِبِ) فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ، لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ، وَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ، وَقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ فَمَا شِئْتَ؟ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ »؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلَابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا ». {الحديث: ٤٦٢٩ = ٤٦١٧ فم. تجريد/٣/٤٢٤، رقم: ١٣٠٣ = ٣٢٣١، ٧٣٨٩ فتح الباري}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی) دەفەرموێ: عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هیچ رۆژێکت بەسەرهاتووە کە لەرۆژی ئوحود سەختتر بێت؟ فەرمووی: (لەم هۆزەی تۆوە، کە هۆزی قورەیشە، تووشی دەردی سەریو ئێشو ئازارێکی ئێجگار زۆر بووم، بەتایبەتی لە رۆژەکەی عەقەبەدا، تەواو

سەخڵەتیان کردم، مەبەستم ئەو رۆژەیە کە لەعەقەبەی مینادا خۆم پێشکەشی عەبدو یالیلی برای عەبدو کولال کرد، لەپاشا چووم بۆلایان بۆ طائیفو دە رۆژ لەناویانا لە طائیف مامەوە، لەوێش دیسان داوام لەخۆیو لەهۆزەکەی کەهۆزی ثەقیف بوو کرد، کە ئیسلام ببنو ببن بەپشتو پەنای ئیسلام، بەڵام مرازمیان نەداو بەگوێیان نەکردمو وەڵامێکی زۆر ناشیرینو نالەباریان دامەوە، ئیتر منیش بەخەمباریو بە پەرێشانی، کەوتمەڕێو بەبێ ئاگا رێگەم گرتە بەرو رۆیشتم، کاتێ هۆشم هاتەوەو بەئاگا هاتمەوە، تەماشام کرد وام لە قەرنولثەعالیب، کەسەرم هەڵبڕی تەماشام کرد وا پەڵەیێ هەور بەڕا سەرمەوە راوەستاوەو بووە بە سێبەر بۆم، کە سەرنجمدا جوبرائیلم لەناویدا بینی، جوبرائیل بانگی لێ کردمو فەرمووی: ئەی موحەممەد! یەزدانی هێژاو سەروەر ئاگای لێ بوو، کە هۆزەکەت چییان پێ گوتیتو چۆنیان وەڵام دایتەوە، ئەوا فریشتەی کێوانی بۆ ناردوویت، چی فەرمانێکت هەیە پێی بفەرموو، چۆن تۆ حەزدەکەیت ئاوایان لێ دەکا، جا فریشتەی کێوانیش بانگی لێ کردمو سڵاوی لێ کردمو فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودا گوێی لێ بوو کە هۆزەکەت چۆن بەناشیرینی وەڵامیان دایتەوەو دڵدەیان نەدایت، ئەوە من فریشتەی سەرکاری سەرچیاکانمو هەموو کێوو چیاکان بەدەستی منەو من بەرپرسم لێیانو بەفەرمانی خودا لە فەرمانی من دەرناچن، پەروەردگاری تۆ منی ناردووە بۆلای تۆ، کە فەرمانت بەچییە من جێبەجێی دەکەم، ئەگەر ئارەزوو دەکەی هەردوو کێوەکە تەبخ دەکەم بەسەریاندا، کێوی ئەبو قوبەیسو کێوی قەیقوعان، کەشاری مەککە دەکەوێتە نێوانیانەوە دەدەم بەیەکا، هەتا تاقیان لێ دەرنەچێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خەیر! من شتی وا داوا ناکەم، بەڵکوو من ئومێد دەکەم کەخودا لەپشتی ئەمانە، کە دانیشتووی شاری مەککەن، نەوەیێ بخاتەوە، وەچەیێ پەیدا ببێ کە ئەوان خودا بپەرستنو، بەتاكو تەنیای بزاننو هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٤٥٧٠}.

١١٦٦- عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَمِيَتْ إِصْبَعُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الْمَشَاهِدِ، فَقَالَ:

**هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ**
**وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ**

{الحديث: ٤٦٣٠ = ٤٦١٨ فم. تجريد/٣/٢٨٥، رقم: ١١٥٤ = ٢٨٠٢ فتح الباري. ترمذي. تفسير: ٣٣٤٥. تحفة الأشراف: ٣٢٥٠}:

جوندوبی کوڕی سوفیان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، لە غەزایەکا، لەناو ئەشکەوتێکا، پەنجەیەکی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) زامار بوو، خوێنی لێ هات، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ دڵدانەوەی پەنجەی، هەتا ئۆقرە بگرێ، لەسەر ئێش‌و ئازارەکەی فەرمووی:

**هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ**
**وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ**

واتە بەشیعر لەدەریاکەی خۆی کەرە جەزە:

**ئــــەی پەنجـــــە وایـــــە پایـــــەوو شــــوێنت**
**لــــــەڕێی خــــــودادا وا ڕژا خوێنــــــــــت**

مەبەستی خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەیە: کە لەسەر شێوەی موعجیزە، دڵی پەنجەی خۆی بداتەوەو، تێی بگەیەنێ کە ئەو ئێش‌و ئازارەی کە پێی گەیشتووە، لەچاو هی تردا هەر زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەخۆڕایی نارِوا، خوا بۆی حسیب دەکا بە تێکۆشان لەڕێگەی خۆیدا). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٤٢١٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

گەرچی لەسەرچاوەکاندا بۆم ڕوون نەبوویەوە، کە پەنجەی دەستی زامار بووە، یا هی قاچی، بەڵام لەهەندێ گێڕانەوەدا ئاماژەی واتیادا، کە پەنجەی پێی بووبێ، وەك لەژمارە (٦١٤٦)ی صەحیحی بوخاریدا، بەدەق دەفەرموێ:

خولەفای راشیدینو هاوسەرەکانی پێغەمبەر!! دیارە کە بەپێی ئەم خاڵە، زۆرینەی موسوڵمانان، بەتایبەتی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، لەسەرەتای ئیسلامەوە هەتا ئێستا، لە ئێستاشەوە هەتا رۆژی قیامەت، هەموو زەندیقو بێباوەڕنو نەواصیبی ئەهلی بەیتن، لەبەرئەوە شایانی ئاگری دۆزەخی ئێجگارینو لەحوکمی مورتەددان، تەنانەت لە ئەهلی ذیممەیش خراپترنو ئەو مافەی بۆ ئەهلی ذیممە هەیە بۆ ئەوان نییە!!

بەم قسەیەبێ لەسەددا نەوەدو پێنجی موسوڵمانان موسوڵمان نین، بەتایبەتی زانا گەورەکانیان، وەك ئەبو حەنیفەو بوخاریو موحەددیثو موفەسسیرە گەورەکانو ئیبنو تەیمییەو لایەنگیرانی، چونکە ئەمانە کەتمی حەقی عەلییان کردووە، بەتایبەتی ئەبو حەنیفەو ئیبنو تەیمییە بە گەورەترین ناصیبی دادەنێن!! هەروا صەلاحەددینی ئەییوبی بەدوژمنی ژمارەیەکی خۆیان دائەنێن!!

مەبەستی دووەم لەم فەرموودەیە ئەمەیە: دووپاتکردنەوەی مەبەستی یەکەمە: کە دانانی سەرۆکی دەولەتی ئیسلام، لەپاش مەرگی موحەممەد بەوەحیو تەوصییە نییە، بەڵکوو بەڕاوێژو شووراو پەیمانو بەیعەت دادەنرێ، چونکە ئەو سەردەمە بەسەردەچێ، کە پێغەمبەر لەدوا پێغەمبەربێت، وەك کاتی جوولەکەکان!!

لەڕاستیدا من بەش بەحاڵی خۆم، کاتێ شارەزاییەکی باشم پەیداکرد، لەرێگەی سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەو جەماعەتەوە، بەگیانو بەدڵ ئەشقی دینی موحەممەدو ئەهلو بەیتی موحەممەدو هاوەڵەکانی موحەممەد بووم، جاری وادەبوو، گیانو هەستم دەفڕی بۆ ناو کۆڕو کۆمەڵو گوزەرانیان، بەچاوی رووح سەرەنجی خەباتو تێکۆشانی ئەوانم دەداو لەمزگەوتا لەگەڵیان بووم کەچۆن ریزەکانیان لەریزی پۆلە فریشتەیان دەکرد، لەپشت پێغەمبەرەوە، لەهەموو مەڵبەندە کانیانا لەگەڵیان بووم کە چۆن خۆشەویستیو فیداکارییو رێزیان بۆ پێغەمبەرو کەسوکاری پێغەمبەرو دینی پێغەمبەر هەبوو، کەچۆن هاوسەرەکانی

پێغەمبەر بەرۆحو بەسەرو بەماڵو بەکەسوکار، ڕەزابوونی پێغەمبەریان مسۆگەر دەکرد، بەڵام کاتێ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵم بۆ بۆچوونو مەزهەبی شیعەکان کرد تووشی خورپە بووم، چۆن نا؟ ئەوەی کەمن بە کۆمەڵگای بەختەوەریم دەزانی، بەقسەی ئەم سەرلێشێواوانەبێ، کۆمەڵگایەکی خۆ خۆری پیلانگێڕ بوون، تەنانەت پێغەمبەر خۆشی زۆر فاشیل بووەو هیچی بۆ نەکراوە، چونکە خەڵکەکەی کە لەسەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتوون، لەپاش خۆی یەکسەر دینەکەی ئەویان تەحریف کردووە، چونکە لەدڵەوە باوەڕیان پێی نەبووە، لەپاش مەرگی خۆی یەکسەر پاشگەزبوونەتەوەو دوژمنایەتی وەصیو کەسوکارەکەی ئەویان کردووە، لە ئەبوبەکرەوە بیگرە، هەتا ئێستایشو دواتریش!!

دەڵێن: زانایەکی گەورەی سوننی، لەنەجەف دەچێ بۆلای ئاخونێکی مەرجەعی شیعە، دەبینێ کۆمەڵێ فەقێو شاگردی زۆری لەدەورە. مەلا سوننیەکە پێی دەڵێ: ئەمانە لەپاش جەنابیشت هەر پەیڕەوی تۆ دەکەنو تۆ بەمەرجەعی خۆیان دەزانن؟ مەلا شیعەکە دەڵێ: بەڵێ، مەلا سوننییەکە پێدەکەنێ، دەڵێ: بۆچی پێدەکەنی؟ دەڵێ: چ عەجەب سەحابەکانی پێغەمبەر هەمووی لێی هەڵگەڕاونەتەوە، کەچی فەقێکانی تۆ پەیڕەویت دەکەن، دیارە یا تۆ باشتری لەپێغەمبەر، یا فەقێکانت باشترن لەسەحابەکان!!.

تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی لەسەردەمی خۆیدا، لەنەتەوەکەی ترساوەو زۆرشتی روون نەکردۆتەوەو مەرایی بۆ ئەبوبەکرو عومەرو عائیشەو کەسانی تر کردووەو بەدزییەوە باسی ئیمامەتو ویصایەتی بۆ بازێ کەس کردووە، هەتا لەپاش خۆی ئەوان بەوئەرکە هەڵسن!

بگرە هەر لەسەرە مەرگی پێغەمبەردا، ئۆمەتەکەی بەسەرۆکایەتی ئەبوبەکرو عومەر، پیلانیان لە ئایینی ئیسلام کردووە، لەو پیلانەیشدا سەرکەوتوو بوونو دینیان گۆڕیوەو فەشەلیان بەوەصیە مەنصووبەکەی پێغەمبەر هێناوە، کە پێغەمبەر بەفەرمانی خودا دایناوە، کە عەلییە، واتە: ئەبوبەکرو عومەر گۆڵیان

لەخودایش کردووە، پەنا بەخوا لەهەڵەی وا، لەتەفسیری شوببەرو سەرچاوەکانی تری شیعەدا دەڵێ: (لە حەجی ماڵاوایدا، خودا فەرمانی بە پێغەمبەر کرد، کە ویلایەتو ئیمامەتو ویصایەتی عەلی رابگەیەنێ، بەڵام پێغەمبەر لەترسی ئەبوبەکرو عومەرو سەحابەکان نەیوێرا، رایبگەیەنێ، هەتا خودا بەم ئایەتە هەڕەشەی لێکردو دڵنیای کرد کە نەترسێ لەکوشتن.

{يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ - المائدة — ٥/٦٧}. ئەوجا ئەویش لەغەدیرخوم ئیعلانی ویصایەتی عەلی کردو ئایەتی: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ} هات بەم بۆنەیەوە!!

سوبحانەڵڵا لەم بێ رێزییە بە پێغەمبەرو هاوەڵانو هاوسەرانی، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش مەرگیشی، لە گۆڕە پیرۆزەکەشیدا، لەدەست مورتەددانو زەندیقەکانی هاوەڵانی رزگاری نەبووە، ئەوەتا لەگۆڕیشدا هاودەمو هاوڕێی ئەبوبەکرو عومەرە، کە شیعەکان پێیان دەڵێن: صەنەمەی قوڕەیشو شەیخەی نار!!

من بۆ خودا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم:

(با وادابنێین کەئێمە موسوڵمان نینو بەڵام ویژدانی خۆمان دەکەین بە فەرمانڕەواو حەکەم، سەبارەت بە عەقیدەی سوننییەکانو شیعەکان، لەبارەی پێغەمبەرو هاوەڵانو هاوسەرانو ئەهلی بەیتییەوە: جا توخودا پێغەمبەرێ کە ئەوەندە رێزو قەدری نەبێ لەلای خودا، کە لەگۆڕەکەیدا، هاودەمی دوو فیرعەونی ئوممەتەکەی بێ، وە دوازدە وەصیو ئیمامەکانیش لەژیانی خۆیاندا بەمەیان زانیبێو تەحەممولی ئەوەیان کردبێو چاوەڕوانی ئەوە بووبن کە ئیمامی موسەردەب لەسەردابە بۆر دەرچێو بچێ لاشەی ئەبوبەکرو عومەر لە گۆڕەکانیان دەربهێنێو بێ رێزییان پێ بکاو لەسەر دارو درەخت بیان سووتێنێ! پێغەمبەرێ کە خێزانو ئوممەتەکەیو خەزوورو زاواکانیو هاوسەرەکانیو زۆرینەی هاوەڵو فەرماندە سەربازییەکانیو هۆزەکەی خۆی بەتایبەتی کە قوڕەیشن، پێغەمبەرێ کە

ئەمانە هەموو لەگەڵیا ناپاکبن‌و بەردەوام خەریکی پیلان بوون لێی‌و خۆی‌و ئەهلوبەیت‌و خزمەکانی، لەژیان‌و مردنیانا، بەدەست ئوممەت‌و ژنەکانیەوە، داماوو کەساس بن، ئایا شتی‌وا هۆشی ساغ قەبووڵی دەکا، یا دوژمن بەدوژمنی دەکا؟).

وەکی تریش: (ئەم هەمکە جمێن‌و نەفرەت‌و لەعنەتە لەو خەڵکە مردووە چی سوودێکی هەیە، گریمان ئەو خەڵکەی شیعەکان شەوو رۆژ لەباتی زیکرو صەڵاوات، نەفرەت‌و لەعنەت لەو مردووانە دەکەن، گریمان ئەو خەڵکە گوناهباریش بن، تازە ئەوانە چوونەتەوە دیوانی خودا، خودا خۆی دەزانێ شایانی چین، ئیتر ئێمە ئەگەر یەك تۆسقاڵ دڵسۆزیمان بۆ خواو پێغەمبەری خواو ئایینی خۆمان هەبێ، ئیتر لەپای چی ڕیزی موسوڵمانان دوولەت بکەین؟! یان تانە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر بدەین‌و ئابڕووی پێغەمبەری پێ ببەین؟!

سوێندم بەخودای تاك‌و تەنیا، کە ئەو هەمکە جنێوەی شیعەکان دەبینم، کەدەیدەن بە پێشینانی ئەم گەلی ئیسلامە، لەموهاجیرین‌و ئەنصارو عەشەرەی موبەششەرەو خولەفای راشیدین‌و ئەصحابی شەجەرەتولڕیضوان‌و هاوسەرەکانی پێغەمبەرو ئەهلی مەککەو مەدینەو هۆزی قوڕەیش‌و هەموو هاوەڵ‌و سەحابەکانی پێغەمبەرو لەسەددا نەوەدو پێنجی تابیعین‌و خەڵکی شام بەگشتی‌و سەرجەمی زانایان‌و پیاوچاکانی نەتەوەی ئیسلام، لەسەرەتاوە هەتا ئەمڕۆ، سوێندم بەخودا کەئەم حاڵە دەبینم، واهەست دەکەم کە کوڵە وەیبابێ دەدا بە خۆشەویسترین کەسمەوەو لەبەرچاوم جەستەی پارچە پارچە دەبێ!! جا ئایا ئەم جۆرە قسەو تانەو تەشەرانە، هەمووی دەغەزو کینەو کۆنە قینی پەنگەوە خواردوو نییە، لە پێغەمبەرەکەو پەیامەکەی‌و نەتەوەکەی‌و دینەکەی؟ ئایا دین بەجنێوو لەعنەت دادەمەزرێ، یا سەردەکەوێ، یا بەحیکمەت‌و مەوعیظەی حەسەنە؟ یا مەبەستێ تری شاراوە هەیە لەم شەڕە جنێوەدا؟!

ئەوەی کە لەبەرچاوە شیعە بەناوی دۆستییەوە، حەیای موحەممەدو دینەکەی‌و ئوممەتەکەی‌و هاوسەرەکانیان بردووە، لەم ڕووەوە گاورو جولەکەیش

شتی وایان نەکردووە! خودا پەنامان بدا لەکفری وا، سوێندم بەخودا، ئایەتەکانی قورئان، فەرموودەکانی پێغەمبەر، شیعە هەموویان کردووە بە گاڵتەجاڕو شەڕە گەڕەك، یا شانامەی عەلین، یا لەعنەتنامەی ئەبوبەکرو عومەرن، دەرزی زەهریان لێداونو لەکاریان خستوون، ئەو ئایەتو فەرموودانەی کە بەڕاشکاوی باسی فەزڵی سەحابە دەکەن، یا بەرائەتی عائیشە دەکەن، یا پایەی دایکی بڕواداران، بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەر دەچەسپێنن، هەموویان بەقسەی بێ سەروبەری ئاخونو ماخون، تەحریف دەکەنو لە مەدحەوە دەیکەن بەزەمو لەزەمەوە دەیکەن بە مەدح، بۆ نموونە: بەکۆی دەنگ، لەسەفەری کۆچا، ئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەردا بووە، شیعە ئاوا ئەم ئایەتە تەحریف دەکەن، کە دەچەسپێنێ ئەبوبەکر صاحیبی پێغەمبەرەو مەعییەتی خودا لەگەڵ پێغەمبەرو ئەبوبەکردا بووەو ئەوە بووە بەهۆی پاراستنیان لەکافرەکان، شیعە دەڵێن:

(إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ) وَلاَ مَدْحَ فِيهِ. أي لِأَبِي بكرٍ. إِذْ قَدْ يَصْحَبُ الْمُؤْمِنَ الكَافِرُ!! (لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا) أي عالم بنا، يعنى إِنَّ المعيَّةَ مَعِيَّةُ العِلْمِ لاَ مَعِيَّةُ الفَضْلِ والرَّحْمَةِ (تفسير شبر — سورة التوبة — ٩/٤٠).

سەرنج بدەن: فەزڵو رەحمەتی خودا لە پێغەمبەریش نەفیی دەکەن هەتا ئەبوبەکر بەر نەکەوێ!!

ئەو ئایەتانەی کە لەسوورەتی نووردا، بە ئیتتیفاق بۆ تەبریئەی حەزرەتی عائیشە هاتوون، شیعە دەڵێن: (بۆ تەبریئەی ماریەی قیبطییە هاتوون، کە عائیشە بوختیانی ئەوەی بۆکردووە، کە ئیبراهیم لە پێغەمبەر نییەو لەجریجی قیبطییە!!). (تەفسیری شوبەر — سوورەتی نوور ئایەتی یازدە).

لەهەمووی سەیرتر، بەراز، سەگ، جوولەکە، گاور، مەل، لە ئاسمانیشەوە بەلای، یا بەسەر قەبری حوسەیندا بڕوا، پاك دەبێتەوەو دەچێتە بەهەشت، بەڵام ئەبوبەکرو عومەر هەزار ساڵ زیاترە هاوسێی پێغەمبەرن لەگۆڕدا، کەچی رۆژ بەڕۆژ پیستر دەبن!!

شیعه بەئاشکرا دەڵێن: (قوڕەیش بەسەرۆکایەتی ئەبو سوفیانو چەن کەسێ تر، لەسەرەتاوە هەتا کۆتا هەر خەریکی پیلان کردنبوون، لە موحەممەدو دینەکەی، تەنانەت ژنەکانیشی لەژیانی خۆیداو لەپاش ژیانی خۆشی هەر خەریکی پیلانکردن بوون لێیو لەدڵەوە باوەڕیان پێی نەبووەو (الطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ) نەبوونو بەڵکوو (الخَبِيثَاتُ لِلطَّيِّبِين) بوون!

خوانەخواست، ئەگەر دیدو بیرو باوەڕی گەندەڵی شیعە راست بێو درۆی پەتی نەبێو، دووربا ئیسلام ئەوەبێ کە شیعە دەیلێنو واتای زۆر لە ئایەتو فەرموودەکان ئەوەبێ کە شیعە دەیلێن ئەوا:

١- قورئان شانامەی عەلییەو سوننەت لەعنەت نامەیە لە دوژمنانی حوسەین کە بریتین لەزۆرینەی سەحابەکانو سوننییەکان بەگشتی!

٢- پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) پێغەمبەری بنەماڵەیەو (رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) نەبووەو ئەویش وەك هەموو سەرۆك خێڵو ئاغاو دەستەڵاتدارێو پادشایەکی تر، هەر خەریکی ئەوە بووە، کە دەستەڵاتو فەرمانداریی، ویراثی بێو تەرخان بێ بۆ کەسوکارەکەی خۆیو بۆ بنەماڵەکەی، هەمووکات بنەماڵەکەی ئاغاو دەرەبەگ بنو ئەو خەڵکەی تر، هەموو مسکێنو نۆکەرو خزمەتکارو کارەکەری ئەوان بنو پێنج یەکی سەرجەمی ماڵی خۆیان بدەن بە کەسوکارەکەی بەناوی خومسەوە!!

بەقسەی ئەم سەر لێشێواوانەبێ، کەسوکارەکەیشی بوون بە (رَحْمَةً لِلْعَالَمِين). چونکە ئەوەتانێ، بەهۆی باوەڕنەبوون بە ویلایەتو ویصایەتو ئیمامەتی ئەوانەوە، لەسەددا نەوەدو پێنجی گەلی ئیسلام، دادەنرێن بەنەواصیبو هەلگەڕاوە لەئایین، کە ئەم نەواصیبو موناویئانە، زیاتر لە ملیارو چارەکێ موسوڵمان دەبنو زیاتر لەپەنجاو پێنج دەوڵەت دەبن، بەقسەی مەراجیعو کتێبە گەورەکانی شیعە بێ، ئەمانە هەموو دادەنرێن بە نەواصیبو بە مونکری ویلایەتی عەلیو نەوەی عەلیو ناحەزانی ئالوبەیتو لایەنگیرانی جێنشینە زەوتکەرو مورتەددو لەدین

هەڵگەڕاوەکانن، کە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو موعاوییەو ئەوانی ترن، هەروا لایەنگیرانی عائیشەو حەفصەو ئوممو حەبیبەن کە هاوسەری پێغەمبەر بوونو دوژمنی عەلیو فاتیمەو خەدیجە بوون، سەرەڕای هەموو شتێ، ئەم زۆرینەیە، بەهۆی ئەوەوە، کە بەبێ جیاوازی هاوەڵانی پێغەمبەریان هەموو وەك یەك خۆش دەوێو باوەڕیان بە ئیمامەتی دوازدە ئیمامەکە نییە، بەڵکوو مادەم باوەڕیان بە ئیمامەتی ئەوان نییە، واتای وایە کە دوژمنانی ئەوانیان خۆش دەوێ، لەبەرئەوە هەموویان لەحوکمی بێباوەڕدانو شایانی ئاگری دۆزەخی هەتا هەتایینو خۆزگەیان بەگاورو جوولەکەیە!!

٣- بەقسەی ئەم دەغەز لەدڵانە بێ، جەماوەری صەحابەکانی پێغەمبەر، وەك ئەو وەصفەنین، کە قورئان بۆیان دەکاو شایانی ئەو موژدانە نین، کە قورئان پێیانی داوە، بەڵکوو لەرێکخراوەکانی مافیاو فاشیست دەکەن!!

٤- لەهەمووی سەیرتر، ئەم هەموو غەزەواتو فوتوحاتی ئیسلامییە، کە لەسەر دەستی سەحابەو تابیعینو ئەهلی سوننەو جەماعەتدا، ئەنجام دروان کە بەهەزاران شەهیدو قوربانی لەپێناویدا دراوە، هیچی شایانی باسو یادکردنەوەو رێزو ڕەحمەت نینو بەڵکوو هەندێکیان لەجۆری فەتح نەبوونو بەڵکوو داگیرکردنو بەکۆیلە کردنی گەلان بوون!! سبحانە الله! یەك بست لەخاکی ئیسلام هەتا ئێستا بەدەستی شیعە فەتح نەکراوە، وە لەلای شیعە، شتێ نییە، بەناوی (فضائل الصحابة) جگە لە حوسەینو ژمارەیەکی کەمی تر، ئەو هەموو شەهیدانە، ئەو گشتە قوربانیو فیداکاریە، ئەو هەموو فتوحاتە پیرۆزە هیچی نرخی بزووتنەوەکەی حوسەینی نییە، کە بزووتنەوەیەکی ژێر کەوتوو بوو!!

{وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ – النور – ٢٤/١٦}.

**دوا وته لهم بابهته:**

١- ئێمهی ئههلی سوننهتو جهماعهت، كهس لهئههلی قیبله، بهكافر دانانێین، ئهوهی بهزمان بڵێ: {لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ و محمداً رَسُولُ اللّـهِ} و بهدڵ باوهڕی پێی ههبێ، موسوڵمانهو برای ئایینی ئێمهیهو له ئههلی نهجاتهو ئێمه لهلایهنی خۆمانهوه هیچ كێشهیهكمان لهگهڵیدا نییهو، ئهگهر خۆی كێشهیهكی ناههقی لهگهڵ سهحابهو خولهفای راشیدینو هاوسهرهكانی پێغهمبهرو تێكڕای موسوڵمانان ههبێ، ئهوه حیسابو كیتابو لێپرسینهوهی لهسهر خودای گهورهیه، ههروهها ئهگهر زیادهڕهویو خوارو خێچی له عهقیدهو بیرو باوهڕیدا ههبێ، ئهوه خۆیو خوای خۆی، كورتو پوخت: (سهرو سامانو ناموسی ئهوهی خۆی به ئههلی قیبله بزانێ، لهلای ئێمهی ئههلی سوننهتو جهماعهت، پارێزراوهو لهم لایهنهوه جیاوازی نییه لهبهینی سوننیو شیعهو موعتهزیلهو كاكهییو لایهنه ئیسلامییهكانی تردا!!).

خۆزگهم ههموو لایهكانی تریش لهم رووهوه بیرو باوهڕیان وهك ئێمه وابووایهو رێگهیان بۆ پێكهوه سازانو پێكهوه ژیانێكی موسوڵمانانه خۆش بكردایهو، بهدرۆ بهناوی خۆشهویستی ئههلی بهیتهوه، بۆ بهرژهوهندی تهسكی خۆیان، ئاگری دوو بهرهكیان خۆش نهكردایه وهك مهلاكانی شیعه وادهكهن.

٢- لهڕاستیدا زۆرینهی عهوامو رهشه خهڵك، لهههموو تاقمو لایهنهكانی موسوڵمانان، وهك سوننیو شیعیو زهیدیو ... تاد، ئهم جۆره شیكردنهوهی كوڵكو مووه نازاننو زۆرینهی ئهم بیرو باوهڕانه قسهی كتێبه سهرچاوهكانو مهراجیعه ئایینییهكانو مهزاهیبهكانه، بهڵام ئهمڕۆ بهتایبهتی بازرگانییهكی گهوره، لهمهیدانی سیاسهتدا به مهزههبهكانهوه دهكرێ، بهتایبهتی تر، كهمتهرخهمی سوننییهكان، رێگهو مهودای بۆ ههڵمهتو هێرشو بزووتنهوهی بهشیعهكردن خۆش كردووه!! لهبارترین چهك بهدهستی شیعهوه، بۆ بڵاوكردنهوهی شیعایهتی لهناو لاوان دا إباحیهتی جینسییه بهناوی موتعهوه!!.

٣- پـەيڕەوى مەزهـەبى جەعفـەرى صـاديق، لەفيقـەدا، بەمـەرجێ لـە سـنوورى ئيجمامى زانايانى ئيسلام دەرنەچێ، كارێ رەوايەو ئەوەيش هيچ كێشـەيێ بـۆ گـەلى ئيسـلام دروسـت ناكـا، هـەروەك چـۆن پـەيڕەوى حەنـەفىو ئيمامـەكانى تـر هـيچ كێشەيەك بۆ كەسێ دروست ناكەن، چونكە شتى وا هەنگاوێكى گەورەيە بۆ يـەكترى قەبوولكردن!

١١٩٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ رَبِّ الْكَعْبَةِ، قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَـإِذَا عَبْـدُ اللَّـهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) جَالِسٌ فِى ظِلِّ الْكَعْبَةِ، وَالنَّاسُ مُجْتَمِعُونَ عَلَيْـهِ، فَأَتَيْتُهُمْ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى سَفَرٍ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَمِنَّا مَنْ يُصْلِحُ خِبَاءَهُ، وَمِنَّا مَنْ يَنْتَضِلُ، وَمِنَّا مَنْ هُوَ فِى جَشَرِهِ، إِذْ نَادَى مُنَـادِى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): الصَّلاَةَ جَامِعَةً، فَاجْتَمَعْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: « إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِى إِلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى خَيْـرِ مَـا يَعْلَمُهُ لَهُـمْ وَيُنْـذِرَهُمْ شَـرَّ مَـا يَعْلَمُـهُ لَهُـمْ، وَإِنَّ أُمَّـتَكُمْ هَـذِهِ جُعِـلَ عَافِيَتُهَـا فِـى أَوَّلِهَـا، وَسَيُصِيبُ آخِرَهَـا بَـلاَءٌ، وَأُمُـورٌ تُنْكِرُونَهَـا، وَتَجِـىءُ فِتْنَـةٌ فَيُرَقِّـقُ بَعْضُـهَا بَعْضًـا، وَتَجِـىءُ الْفِتْنَةُ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِى. ثُمَّ تَنْكَشِفُ، وَتَجِـىءُ الْفِتْنَـةُ فَيَقُـولُ الْمُـؤْمِنُ: هَـذِهِ هَذِهِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ وَيَدْخُلَ الْجَنَّةَ، فَلْتَأْتِهِ مَنِيَّتُهُ، وَهُوَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الآخِرِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ الَّذِى يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ، وَمَنْ بَايَعَ إِمَامًا فَأَعْطَـاهُ صَـفْقَةَ يَـدِهِ، وَثَمَرَةَ قَلْبِهِ، فَلْيُطِعْهُ إِنِ اسْتَطَاعَ، فَإِنْ جَاءَ آخَرُ يُنَازِعُهُ، فَاضْرِبُوا عُنُقَ الآخَرِ»، فَدَنَوْتُ مِنْـهُ فَقُلْتُ لَهُ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ آنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم)، فَأَهْوَى إِلَى أُذُنَيْهِ وَقَلْبِهِ بِيَدَيْهِ، وَقَالَ: سَمِعَتْهُ أُذُنَاىَ، وَوَعَاهُ قَلْبِى. فَقُلْـتُ لَـهُ: هَـذَا ابْـنُ عَمِّـكَ مُعَاوِيَـةُ يَأْمُرُنَا أَنْ نَأْكُلَ أَمْوَالَنَا بَيْنَنَا بِالْبَاطِلِ وَنَقْتُلَ أَنْفُسَنَا، وَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِـنْكُمْ وَلاَ تَقْتُلُـوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا)، قَالَ: فَسَكَتَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: أَطِعْهُ فِى طَاعَةِ اللَّهِ وَاعْصِهِ فِى مَعْصِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. {الحديث: ٤٧٥٣ = ٤٧٣٩ فم}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدی ڕەببیلکەعبە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆیشتم بۆ مەسجیدولحەرام، ڕوانیم وا عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەسێبەری کابەدا، دانیشتبوو، خەڵکەکەیش لەدەوری کۆبوونەتەوە، منیش چووم بۆلایان، لەخزمەتیدا دانیشتم، فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، لەهەوارێ لاماندا، هەمان بوو خەریکی چاتۆڵ هەڵدان بوو، هەمان بوو خەریکی تیر ئەندازی بوو، هەمان بوو وڵاخەکەی بردبوو بۆ شەواژۆو بۆ شەولەوەڕ، لەم کاتەدا، جاڕچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵدا: (الصَّلاَةَ جَامِعَةً) واتە: کۆببنەوە بۆ نوێژ).

جا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆبووینەوە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەڕاستیدا، هەر پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران، کە لەپێش منەوەبوون، ماف بووە لەسەریان: کە هەرچی بەخێری بزانن نیشانی گەلی خۆیانی بدەن، وە هەرچی بەشەڕو بەخراپەی بزانن پێشانی گەلی خۆیانی بدەنو هەڕەشەی ئەوەیان لێ بکەن: کە بەهیچ جۆرێ توخنی نەکەون، لەڕاستیدا بێوەییو ئاسوودەیی ئەم گەلی ئیسلامی ئێوەیە، وا لەسەرەتایەوە، بەڵام پاشینانی ئەم نەتەوەی ئیسلامە تووشی ئەزموونو تاقی کردنەوەی ناخۆشی ڕۆژگار دەبن، وە بەرەنگاری کۆمەڵێ کاروباری نالەباری ناهەمواری وادەبنەوە کە ئێوە پەسەندیان ناکەنو خۆشتان نایێ لێیان، وە فەرتەنەو ئاژاوە گەلێ سەرهەڵ دەدەن، پێشینەکانیان ڕێگە بۆ پاشینەکانیان خۆش دەکەن، هەر ئاژاوەیێ بگری لەچاو ئاژاوەی پاشی خۆی سووكو ئاسانە، ئاژاوەو فەرتەنەی وا دەقەومێ، باوەڕدار دەڵێ: ئەمە سەرم دەخوا، بەڵام ئەو دەڕەوێتەوەو یەکێ لەوەی پێشوو خراپتر پەیدا دەبێو موسوڵمانەکە دەڵێ: ئەمەیان خۆیەتی، لەمەیان ڕزگارم نابێ، ئیتر هەروەها، جا هەرکەسێ کە حەزدەکاو پێی خۆشە کە لەئاگری دۆزەخ دووربێو بخرێتە ناو بەهەشت، لەسەر باوەڕو ئیمان بەڕۆژی دوایی بمرێو چی بۆ خۆی پێ خۆشە کە خەڵك لەگەڵیدا بکا، با ئەویش ئەوە لەگەڵ خەڵکدا بکات، وە هەر موسوڵمانێ پەیمانی دا بە پێشەوایێ، دەستی نایە ناو

دەستیو بەکوڵی دڵ خۆشی ویست، ئیتر با لەفەرمانی دەرنەچێو بەپێی توانا بەگوێی بکا، جا ئەگەر دنیابوو کەسێکی تر هاتو گەڕی تێ ئاڵاندو ویستی خۆی لەجێی ئەو ببێ بە پێشەوا، ئەوا رێگەی پێ مەدەنو ئەگەر هەروازی نەهێناو شەڕی فرۆشت لەگەردنی بدەن).

عەبدوڕەحمان فەرمووی: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمر نزیك بوومەوەو عەرزیم کرد: سوێندت دەدەم بەخودا، ئایا بەخودی خۆت، بەگوێی خۆت ئەمەت لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، ئەویش هەردوو دەستی برد بۆ هەردوو گوێچکەیو دوایی داینان لەسەر دڵیو فەرمووی: بەم دوو گوێچکەیە گوێم لەم فەرموودانە بووە، وە بەدڵم وەرم گرتوون. جامنیش عەرزیم کرد: دەی ئەم فەرموودەیە ئەم پرسیارە لەلای من دروست دەکا: موعاوییەی ئامۆزای تۆ، ئەوەتا گەڕی ئاڵاندۆتە عەلی، کە لەپێش موعاوییەدا پەیمانی پێ دراوەو عەلی پێشەوای هەقە، چونکە لەپێشا پەیمان بەودراوە، کەچی موعاوییە لەجیاتی ئەوەی کەخۆی بکوژرێ، ئەوەتا خەڵك دەدا بەکوشت لەم جەنگی نێوانی خۆیو عەلییەداو فەرمانمان پێدەکا کە ماڵەکانمان بەناڕەوا لەناو خۆمانا بخۆینو لەشکری کۆکردۆتەوەو ماڵی بەیتولمالیان بەحەرامی دەرخوارد دەدا، ئەمەیش کە موعاوییە دەیکا، بەپێچەوانەی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إلاَّ أنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلاَ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا – النِّسَاء – ٤/٢٩}:

کورتەی واتا: بۆ موسوڵمان دروست نییە ماڵی حەرام بخوا، بەهەرچی مەهانەیێ بێت، وە بەدەستی خۆشتان خۆتان بەناهەق مەکوژن!).

عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەمری کوڕی عاص، ماوەیێ ماتو خامۆش بوو، لەپاشا فەرمووی: (لەو شتانەدا کە موعاوییە بەگوێی خودا دەکا، تۆیش بەگوێی ئەو بکە، لەوشتانەیشدا کە موعاوییە بێ فەرمانی خودا دەکا، تۆیش بێ فەرمانی ئەو بکەو بەگوێی موعاوییە مەکەو بەگوێی خودا بکە).

## ٩٥٤) كاتیٚ پەیمان بدریٚ بەدوو جیٚنشین. (٤٧٧٦)
## بابٌ: إذا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ

١٢٠٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا ». {الحديث: ٤٧٧٦ = ٤٧٦٢ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (هەرکاتیٚ پەیمان درا بەدوو جیٚنشین، ئەگەر ئاخرەکەیان هەروازی نەهیٚنا، بەهیچ شتیٚ چاری نەدەکرا بەکوشتن نەبیٚ، ئەوا بیکوژن).

## ٩٥٥) هەمووتان چاودیٚرنو هەمووتان بەپیٚی حالٚ بەرپرسن
## ٩٥٥} بابٌ: كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِه

١٢٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: « أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِه، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ». {الحديث: ٤٧٠١ = ٤٦٨٨ فم. تجريد/١/٤٤٩، رقم: ٤٧٤ = ٨٩٣، ٢٤٠٩، ٢٥٥٤، ٢٥٥٨، ٢٧٥١، ٥١٨٨، ٥٢٠٠، ٧١٣٨}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: بزانن! کەئیٚوە هەمووتان چاودیٚرو شوانن‌و هەمووتان بەبیٚ جیاوازیی بەرپرسیارن لەژیٚر دەست (رەعییەت)ەکانی خۆتان، پیٚشەوا (کە سەرۆکی هەموو ملەتە) چاودیٚرەو شوانی ملەتە، وە ئەو لەلای خودا بەرپرسیارە لەو هەموو خەلکەی کەوان لەژیٚر چاودیٚری ئەوداو ئەو بووە بەشوانیان، پیاو لەناو مالٚی خۆیدا شوانەو چاودیٚرە، وە ئەو بەرپرسیارە لەوانەی کەوان لەژیٚر چاودیٚریی ئەودا، ژن لەناو مالٚی میٚردەکەیدا شوانەو چاودیٚرە، وە ئەو بەرپرسیارە لەخیٚزان‌و منالٚی میٚردەکەی، وە کۆیلە شوانی مالٚی ئاغاکەیەتی‌و بەرپرسیارە لەلای خودا لەو مالٚە،

ئەدیی! ئیتر هەمووتان هەر شوانن‌و هەمووتان بەپێی حاڵ بەرپرسیارن لەهەموو ئەوانەی کەوان لەژێر چاودێری ئێوەدا، خوای ماڵ‌و منداڵ‌و خێزان‌و کەسانی تربن، خوای ماڵات‌و ئاژەڵ‌و گیاندارانی بێ زمان بێ). {تاج/٣/٨٤، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣١} + {ریاض/١/٢٤٢، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٣}.

## ٩٥٦) ناباشە کەسێ داوای فەرمانڕەوایی بکات. (٤٢٣٩ - ٤٢٥٨)
## بابٌ: كَرَاهِيَّةَ طَلَبِ الإِمَارَةِ وَالحِرْصُ عَلَيْهَا

١٢٠٢- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا». {الحديث: ٤٢٥٧ = . تجريد/٥/٣٠٥، رقم: ٢٠٤٨ = ٦٦٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧}:

ئەورەحمانی کوڕی سەمووره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەورەحمان! داوای فەرمانڕەوایی (ئەمارەت = ئەمیریی) مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت، فەرمانڕەوایی‌و بەرپرسیی وەربگریت، لێت دەبێ بەبار، بەڵام ئەگەر بەبێ ئەوە کەخۆت هەوڵی بۆبدەی، بکرێیت بە فەرمانڕەوا، یا بەسەرکارێ، ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریدا). {تاج/٣/٧٠، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٦}.

١٢٠٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفًا، وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي، لاَ تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ، وَلاَ تَوَلَّيَنَّ مَالَ يَتِيمٍ». {الحديث: ٤٦٩٧ = ٤٦٨٤ فم}:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! من دەبینم کەتۆ پیاوێکی لازەبوونی، وەمن چیم بۆ خۆم پێ خۆشە، ئەوەیشم بۆ تۆ پێ خۆشە، نەکەیت فەرمانڕەوایی بکەی، با بەسەر دوو کەسیشەوەبێ، وە قەت قەتیش مەبە بەسەر پەرشتی ماڵی هەتیو). {تاج/٣/٧٢، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٩}.

١٢٠٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي؟ قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي ثُمَّ قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ ضَعِيفٌ، وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ، وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ، إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا، وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا». {الحديث: ٤٦٩٦ = ٤٦٨٣ فم}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بریا دەتکردم بەسەرکاری سەرکارێ؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دا بەسەر شانماو فەرمووی: (ئەی ئەبو زەڕ! تۆ پیاوێکی لازەبوونی، ئەم کارەیش سپاردەو ئەمانەتەو لەدوا ڕۆژدا لێپرسینەوەیەکی سەختی هەیە، لەبەرئەوە سەرکاریو کاربەدەستی، لەڕۆژی دواڕۆژا، هۆی تەریقیو مایەی پەشیمانییە، مەگەر بۆ کەسێ کە بەحەق پێی هەڵسێو مافی خۆی بداتێ!). {تاج/٣/٧٢، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٥}.

### ٩٥٧) ئەو کەسە ناکەین بەکاربەدەست کەخۆی داوای بکاتو ئارەزووی لەکاربەدەستی بێ. (٤٦٩٦ - ٤٦٩٧)

### بابٌ: لا نستعملُ على عملنا منْ أرادهُ

١٢٠٥- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى: أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعِي رَجُلاَنِ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ، أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِي، وَالآخَرُ عَنْ يَسَارِي، فَكِلاَهُمَا سَأَلَ الْعَمَلَ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَاكُ، فَقَالَ: «مَا تَقُولُ يَا أَبَا مُوسَى أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ»؟ قَالَ: فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَطْلَعَانِي عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمَا، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ، قَالَ: وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى سِوَاكِهِ تَحْتَ شَفَتِهِ وَقَدْ قَلَصَتْ، فَقَالَ: «لَنْ - أَوْ لاَ - نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ، وَلَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ يَا أَبَا مُوسَى أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ»، فَبَعَثَهُ عَلَى الْيَمَنِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ، قَالَ: انْزِلْ، وَأَلْقَى لَهُ وِسَادَةً، وَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ، قَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ، ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السَّوْءِ فَتَهَوَّدَ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَقَالَ: اجْلِسْ، نَعَمْ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ (ثَلاَثَ مَرَّاتٍ). فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ، ثُمَّ تَذَاكَرَا الْقِيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا (مُعَاذٌ): أَمَّا أَنَا فَأَنَامُ وَأَقُومُ، وَأَرْجُو فِي نَوْمَتِي

مَا أَرْجُو فِي قَوْمَتِي. {الحديث: ٤٦٩٥ = ٤٦٨٢ فم. تجريد/٣/٧٥، رقم: ١٠٠٢ = ٢٢٦١، ٣٠٣٨، ٤٣٤١، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٦١٢٤، ٦٩٢٣، ٧١٤٩، ٧٧٥٦، ٧١٥٧، ٧١٧٢}:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسا، فەرمووی: باوکم فەرمووی: خۆم‌و دوو پیاو لە ئامۆزاکانم، لە ئەشعەرییەکانی قەومم، چووینە خزمەتی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکێکیان لەلای راستمەوە بوو، ئەوی تریان لەلای چەپمەوە بوو، عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بمانکە بە کاربەدەستی سەرکاریێ؟ لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەریکی سیواك کردن بوو، بەمنی فەرموو: (ئەی ئەبو مووسا تۆ دەڵێی چی؟) یا فەرمووی: (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس! تۆ دەڵێی چی؟).

منیش گوتم: قوربان! بەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەرو ئەم ئایینە راست‌و دروستەی پیادا ناردووی، بۆ دانیشتوانی سەر رووی زەوی، ئاگام لەم نیازەیان نەبووەو نەمزانیوە کە بەم نیازە هاتوون، کەداوای ئیش‌و کار لەتۆ بکەن، ئەبو مووسا فەرمووی: ئێستایش دەڵێی والەبەرچاوم، کە سیواکەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژێر لێویدا بوو، لێوی کرژەوە بوو بوو، کە فەرمووی: (ئێمە ئەو جۆرە کەسانە ناکەین بەسەرەوکاری کارەکانمان، کەخۆیان حەزیان لەسەر کارییەو خۆیان داوای دەکەن). ئەوجا فەرمووی: (بەڵام تۆ ئەی ئەبو مووسا) یا فەرمووی: (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس! بڕۆ ببە بە کاربەدەستی ئێمە). ئەبو بوردە فەرمووی: جا باوکمی نارد، کردی بەکاربەدەستی سەر وڵاتی یەمەن، هەروەها موعازی کوڕی جەبەلیشی ناردو کردی بە فەرمانڕەوای یەکێ لەدوو ناوچەکەی یەمەن، جا جارێ موعاز بە قەڵەمڕەوی خۆیدا دەسووڕێتەوە، کە لەئەبو مووسای هاوڕێی نزیك دەبێتەوە، بەسواری قاترێ دەچێ بۆلای، دەڕوانێ وا ئەبو مووسا دانیشتووەو خەڵك دەورەیان لێ داوەو پیاوێکیش وا لەلایدا، هەردوو دەستی بەکۆت‌و زنجیر شەتەك دراوەو کراوەتە ملی!!

ئەبو مووسا دۆشەکەڵەیێ رادەخا بۆ موعازو پێی دەفەرموێ: دابەزەو لێرە دانیشە، ئەویش پێی دەفەرموێ: ئەی ئەبو مووسا! ئەم پیاوە چییە، بۆ واکۆت‌و

زنجير كراوه؟ دەفەرموێ: ئەمە جوولەكە بووەو موسوڵمان بووەو، لەپاشا چووەتەوە سەر ئايينە خراپەكەی جارانی خۆی‌و بووەتەوە بە جوولەكە. موعاز فەرمووی: نەخەیر، هەتا بەپێی بڕیارو حوكمی خوداو پێغەمبەری خودا، كە دایان ناوە بۆ ئەم جۆرە كەسە، ئەم پیاوە نەكوژرێ دانانیشم. ئەبو مووسا دەفەرموێ: دەتۆ دانیشە، خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە، ئەم قسەو گوفتوگۆیە، تا سێ‌جار لەنێوانیانا دووبارە بۆوە، ئەوجا ئەبو مووسا فەرمان دەداو پیاوەكە دەكوژرێ.

ئەوجا لەناو خۆیانا باسی شەو نوێژیان كرد، موعاز فەرمووی: بەڵام من لەپێشا دەخەوم بەنیازی ئەوە كە بەهێزبم بۆ شەو نوێژ، ئەوسا هەڵدەسم بۆ شەو نوێژ، جا هەم لە خەوتنەكەمدا بەتەمای پاداشی باشم، هەم لەشەو نوێژەكەمدا بەتەمای پاداشی باشم). {تاج/٤/٨٤٦، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧ + تاج/٣/٧١، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٧}.

## ٩٥٨) پاداشی پێشەوای موسوڵمانان كاتێ فەرمان بكا بەتەقوای خوداو دادپەروەر بێ. (٤٧٤٩)

## بابٌ: الإمام إذَا أمَرَ بِتَقْوَى اللهِ وَعَدَلَ كَانَ لَهُ أَجْرٌ

١٢٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّمَا الإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَعَدَلَ، كَانَ لَهُ بِذَلِكَ أَجْرٌ، وَإِنْ يَأْمُرْ بِغَيْرِهِ كَانَ عَلَيْهِ مِنْهُ». {الحديث: ٤٧٤٩ = ٤٧٣٥ فم. تجريد/٣/٣٣٤، رقم: ١٢١١ = ٢٩٥٧، ٧١٣٧ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێشەوای ئیسلام قەڵایە، موسوڵمانان لەدەوری پوورە دەدەن‌و لێی كۆدەبنەوەو لەگەڵیانا جەنگ دەكەن لەدژی دوژمن، لەهەمان كاتا پێشەوا پشت‌و پەناشە بۆیان، جا ئەگەر فەرمانی كرد بە لەخودا ترسی‌و پێشەوایەكی دادپەروەر بوو، ئەوە لەجیاتی ئەوە پاداشێكی گەورەی بۆ هەیە، ئەگەر فەرمانیشی كرد بەشتێكی تر،

ئەوە شتێكی ترەو پاداشەكەی لەچەشنی كردەوەكەیەتی). {تاج/٣/٨٦، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٣، چ/٤}.

### ٩٥٩) كەسێ دادپەروەرانە ببێ بەكاربەدەستی شتێ. (٤٦٩٨ - ٤٧١٠)
### باب: مَنْ وَلِيَ شَيْئاً فَعَدَلَ فيه

١٢٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللَّهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ، وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ، الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا ». {الحديث: ٤٦٩٨ = ٤٦٨٥ فم}:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕۆژی دواڕۆژ دادپەروەران لەخزمەتی خودادان، وان لەسەر مەشخەڵی نوور، وان لەدەستە ڕاستی خودای میهرەبانەوە، هەردوو دەستی خودای میهرەبانیش هەر دەستە ڕاستە، چونكە مەبەست ئەوەیە كەنازو نیعمەتو بەهرەی خودا، ڕژاوە بەسەریاناو، بوون بەژێر نازو بەهرەی خوداوەو، ئەوەندە نازیان لێ گیراوەو ئەوەندە پایەو پلەی بەرزیان پێ خەڵات كراوە، ئەگینا مەبەست ئەوەنییە كە خودا وەك ئێمە دوو دەستی هەیە، یەكێكیان ڕاستو یەكێكیان چەپ، دادپەروەران ئەو كەسانەن، كە بەهەقو عەداڵەت حوكمو بڕیار دەكەنو بڕیاری ڕاست دەدەنو لەناو خاوو خێزانو كەسو كاری خۆیاندا، دادپەروەرنو لەگەڵ ژێر دەستەی خۆیاندا بەدادنو دادپەروەرن!). {تاج/٣/٨٨، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٤٠} + {ریاض/٢/١٨٧، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٦٦٠}.

### ٩٦٠) كاربەدەستی نەرمو نیانو كاربەدەستی بارگرانكار. (٤٦٩٨ - ٤٧١٠)
### باب: من ولي شيئاً فشقّ أو رَفق

١٢٠٨- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شُمَاسَةَ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ لِأَسْأَلَهَا عَنْ شَيْءٍ، فَقَالَتْ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ، فَقَالَتْ: كَيْفَ كَانَ صَاحِبُكُمْ لَكُمْ فِي غَزَاتِكُمْ هَذِهِ؟ فَقَالَ: مَا نَقَمْنَا مِنْهُ شَيْئًا، إِنْ كَانَ لَيَمُوتُ لِلرَّجُلِ مِنَّا الْبَعِيرُ، فَيُعْطِيهِ الْبَعِيرَ، وَالْعَبْدُ،

فَيُعْطِيهِ الْعَبْدَ، وَيَحْتَاجُ إِلَى النَّفَقَةِ فَيُعْطِيهِ النَّفَقَةَ، فَقَالَتْ: أَمَا إِنَّهُ لاَ يَمْنَعُنِى الَّذِى فَعَلَ فِى مُحَمَّدِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ أَخِى أَنْ أُخْبِرَكَ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِى بَيْتِى هَذَا: « اللَّهُمَّ مَنْ وَلِىَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِى شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ، وَمَنْ وَلِىَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِى شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ ». {الحديث: ٤٦٩٩ = ٤٦٨٦ فم} :

عەبدوڕەحمانی کوڕی شوماسە فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی دایکە عائیشە، تا پرسیاری شتێکی لێ بکەم، فەرمووی: خەڵکی کوێیت؟ گوتم: پیاوێکی میصریم، فەرمووی: لەم غەزایەتانا، فەرمانڕەواکەتان چۆن بوو بۆتان؟ عەرزیم کرد: هیچ گلەییەکمان لێی نییە، پیاوی وامان هەبوو وشترەکەی دەمرد، گورج وشترێکی تری دەدایە، هەمان بوو پێویستی بەخەرجی بوو، خەرجی دەدایە، عائیشە فەرمووی: گەرچی ئەم فەرمانڕەوایەی ئێوە کەتۆ ئەم وەسپە جوانەی دەکەی، کاتی خۆی خراپەی دەربارەی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری برام کردووە، بەڵام ئەوە ڕێگەی ئەوەم لێ ناگرێ، کە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرت پێ بڵێم، کە وەسپی جوانی ئەم جۆرە فەرمانڕەوایانە دەکا، لەم ماڵەی خۆما، بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (ئەی خودایە! هەرکەسێ بوو بەسەروکاری شتێ لەکاروباری گەلی ئیسلامی منو خراپ بوو بۆیانو سەخڵەتی کردن، تۆیش خراپبە بۆ ئەوو سەخڵەتی بکە، وە هەرکەسێ بوو بە کاربەدەستو سەرەوکاری شتێ لەکاروباری گەلی ئیسلامی منو باش بوو بۆیانو دڵی پێیان سووتا، تۆیش باشبە بۆیو دڵت پێی بسووتێ). {تاج/٣/٨٧، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٦} + {ریاض/٢/١٨٤، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٥ چاپی دووەم} .

## ٩٦١) ئایین ئامۆژگارییە بەنیازی ساغ. (١٩٤ - ١٩٩)
## بابُ: الدّينُ النصيحةُ

١٢٠٩- عَنْ تَمِيمِ الدَّارِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَعَامَّتِهِمْ». {الحديث: ١٩٤ = ٢٠٧ فم} :

**تەمیمی داری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئایین (واتە: دین) برێتییە لە ئامۆژگاری ساغو دڵسۆزی) ئێمەیش گوتمان: بەرابەر بەکێ؟ فەرمووی: (بەرابە بەخوداو بە قورئانو بە پێغەمبەرو پێشەوایانی موسوڵمانانو تێکڕای موسوڵمانان بەگشتی). {تاج/١/١٧، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١١، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

**تەمیمی داری** (رەزای خودای لێ بێ) **لەپێشا مەسیحی بوو، لەساڵی نۆی کۆچیدا، موسوڵمان بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، غەزای لەخزمەت پێغەمبەردا کردووە پێغەمبەر داستانی جەساسەو جەجاڵی لەوەوە گێڕاوەتەوە، وە ئەوە دائەنرێ بەگەورەترین شانازی بۆی. {تاج/٥/٦١٥، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٥٦٠٥، چ/٤}.**

**یەکەم کەس بوو کەچرای لەمزگەوت داگیرساند، یەکەم کەسیش بوو کە چیرۆكو داستانی گێڕایەوە، بەشەو شەو نوێژی زۆری دەکرد، جاری وابووە لەیەك ڕکاتی شەو نوێژدا، هەموو قورئانی خەتم کردووە! هەمیشەو بەردەوام شەو نوێژێکی زۆر زۆری دەکرد، شەوێ تا بەیانی هەر بەم ئایەتە شەو نوێژی دەکرد، لەهەموو ڕکاتێکا لەپاش فاتیحەوە دووبارەی دەکردەوە:**

**{أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاء مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ — جاثية — ٢١/٤٥}.**

**واتە: با بێباوەڕان کە ئەو هەموو کوفرو بەدکاریو خراپەیان تێ گوشیوە، کەچی باوەڕیشیان وایە: کە ئەوانو موسوڵمانان کە ئەو هەموو کردەوە باشانەیان کردووە، لەدنیاو قیامەتدا، بەیەك چاو تەماشایان بکەین؟ با بێباوەڕان خۆیان بەمجۆرە بۆچوونە هەڵەیە دەسخەڕۆ نەکەن، بەڕاستی ئەمە بڕیارێکی زۆر خراپو هەڵەو چەوتە.**

**لەپاش کوشتنی عوسمان تەمیم ڕۆیشت بۆ شام، وە لەوێ مرد، گۆڕی وا لەبەیت جەبرین، لە وڵاتی فەلەسطین، حەزرەتی عومەر زۆر ڕێزی لێ دەگرت.**

١٢١٠- عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. {الحديث: ١٩٧ = ٢١٠ فم. تجريد/١، رقم: ٥٢ = ٥٧، ٥٨، ٥٢٤، ١٤٠١، ٢١٥٧، ٢٧١٤، ٢٧١٥، ٧٢٠٤. ترمذي. بروصلة: ١٩٢٥. تحفة الأشراف: ٣٢٢٦}:

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڵێن و پەیمانمدا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەرئەوە کە نوێژ بەرپێك و پێکی بکەم و، زەکات بدەم و، ئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێکیش بکەم). {تاج/١/٤٢، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٨، چ/٤}.

## ٩٦٢) گزیو ناپاکی کردن لەوانەی کەوان لەژێر چاودێری مرۆڤداو ئامۆژگاری نەکردنیان. (٣٦١ - ٣٦٤)

## باب: مَنْ غَشَّ رَعِيَّتَهُ وَلَمْ يَنْصَحْ لَهُمْ

١٢١١- عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: عَادَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ الْمُزَنِيَّ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لَوْ عَلِمْتُ أَنَّ لِي حَيَاةً مَا حَدَّثْتُكَ بِهِ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ ». {الحديث: ٣٦١ = ٣٧٥ فم. تجريد/٥/٣٦٧، رقم: ٢١٠٦، ٢١٠٧ = ٧١٥٠، ٧١٥١ فتح الباري + رياض/٢/١٨٣، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٤}:

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: مەعقیلی کوڕی یەساری ئەلموزەنی، کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو، لەنەخۆشی سەرە مەرگا، عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد (کە ئەو سەردەمە فەرمانڕەوای بەصرە بوو) چوو بۆلای بۆ سەرخۆشی لێکردنی، مەعقیل پێی فەرموو: گوێ بگرە فەرموودەیەکی پێغەمبەرت بۆ بگێڕمەوە، کە خۆم لێیم بیستووە، ئەگەر بمزانیبایە دەژیم بۆم نەدەگێڕایتەوە، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (هەر بەندەیێ، لە بەندەکانی خودا، خودا بیکا بەکاربەدەست و بیکا بە گەورەی کۆمەڵێ لە موسوڵمانان و گزیو ناپاکییان لێ بکاو، لەسەر ئەو حاڵە

بەردەوام بێ تادەمرێ، ئەوە بێگومان کە خودای گەورە لەسەر ئەو ناپاکییە بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٢، ج/٤}.

**روونکردنەوە:**

مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێش ڕۆژی حودەیبییەدا موسوڵمان بوو، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی (بیعة الرضوان) بوو، فەرموودەی لە صەحیحەین‌و سونەنی ئەربەعەدا هەیە، لە بەصرە نیشتەجێ بوو، ئەم زاتانەو کەسانی تریش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە: عەمری کوڕی مەیموونی ئەزدی‌و ئەبو عوسمانی نەهدی‌و حەسەنی بەصری، دوو فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، لەئاخرو ئۆخری جێنشینی موعاوییەدا مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ). {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٤}.

١٢١٢- عَنْ الْحَسَنُ: أَنَّ عَائِذَ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) -، دَخَلَ عَلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ زِيَادٍ، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: « إِنَّ شَرَّ الرِّعَاءِ الْحُطَمَةُ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»، فَقَالَ لَهُ: اجْلِسْ فَإِنَّمَا أَنْتَ مِنْ نُخَالَةِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: وَهَلْ كَانَتْ لَهُمْ نُخَالَةٌ؟ إِنَّمَا كَانَتِ النُّخَالَةُ بَعْدَهُمْ وَفِي غَيْرِهِمْ. {الحديث: ٤٧١٠ = ٤٦٩٦ فم}:

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عائیذی کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێ بێ) کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد، کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو، کە زیادی باوکی ناسراوە بە (زیاد بن أبیە. بڕوانە: ژمارە: ٤٦، ٧٣٤ لەپێشەوە رابورد) پێی فەرموو: ئەی کوڕی خۆم! بۆ خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) بیست دەیفەرموو: (بەدترین شوان شوانی ران پسینە: خراپترین کاربەدەست کاربەدەستی میللەت ڕەتێنە). جا

ئامـان سـەد ئامـان تـۆ ئـەی عوبەیـدوڵڵا لـەو شـوانە ران پسـێنکانە نـەبیتو لـەو فەرمانڕەوا میللەت رەتێنانە نەبیت!

عوبەیدوڵڵایش پیی گوت: دانیشە، تۆیش لەسەر کۆزەری یـارانی پێغەمبـەریت (دروودی خودای لەسەر بێ).

عائیذیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوان هـەموو گەنمـە قەنـدەهاری بـوون، کـوا سۆسو سەرکۆزەریان هەبوو؟! سۆسو سـەرکۆزەرو سـەپلە لـەدوا ئـەوانو لەخـەڵکی تردا هەبوو. {ریاض/١/١٧٦، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٩٢ چاپی دووەم + تاج/٣/٨٦، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٥، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

عائیـذی کـوڕی عـەمری مـوزەنی، کەسـناوی ئـەبو هورەیرەیـە، لـەژێر درەختـی پەیمانی خۆشنوودی (بیعة الرضوان)دا پەیمانیدا بـە حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لـە بەصرە نیشتەجێ بـوو، دوو فـەرموودەی لـە موسـلیمدا هەیـە، عائیـذ بۆئـەوەی کـە ئـازاری موسـوڵمانان نـەدا، چـڵکاوو ئـاوی بـەکارهاتووو ئـاراوو شـتی وای نەدەڕشـتە کۆڵان. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئیبنو زیـاددا مـەرگ بـوو بـەمیوانیو بەرەحمـەت چوو (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

**٩٦٣) گزیو دەستپیسی کاربەدەستان لە دەستکەوتی جەنگ.** (٤٧١١ - ٤٧١٤)

**بابٌ: ماجاءَ فِی غلُولِ الأمراءِ وتعْظِيمِ أمْرِه**

١٢١٣- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ، فَذَكَرَ الْغُلُولَ، فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ، ثُمَّ قَالَ: «لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِیءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِی، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِیءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِی، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِیءُ يَوْمَ

الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ نَفْسٌ لَهَا صِيَاحٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ». {الحديث: ٤٧١١ = ٤٦٩٧ فم= فتح الملهم تجريد/٢، رقم: ٦٧٠ = ١٤٠٢، ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٩٦٥٨}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ڕۆژێ** هەڵسایەوە، وتارێکی فەرمووو بۆمان، باسی ناخونەکو دەستپیسی لەماڵی تالانی کرد، وە ئەوەی بە تاوانێکی گەلێ گەورە دانا، وە فەرمووی: (نامەوێ لەڕۆژی قیامەتدا بگەم بە یەکێکتان، وشترێ، بە بۆڕە بۆڕ، بە قەلاندۆشکانیەوەبێ، بێ بلێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە، گرفتاری دەستی ئەم وشترە دزێتییە بووم، ڕزگارمکە لەدەستی، منیش پێی دەڵێم: من دەستەلاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆت، من لەکاتی خۆیدا، لەجیهاندا، پێم ڕاگەیاندوویت، نامەوێ لەڕۆژی قیامەتدا بگەم بە یەکێکتان ئەسپێ، یا ماینێ، بە لووشکە لووشك، بە قەلاندۆشکانیەوە بێ، کە لەجیهانا بەناهەق بەدەستی هێنابێ، بێت بۆلامو بلێ: ئەی پێغەمبەری خودا! دەخیلتم لێم قەوماوە، بەدەستی ئەم ئەسپەوە پەرێشانم، هەم شەکەتو ماندوومو هەم ئابڕووم چووە، دەی فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم کەمن دەستەلاتی هیچم نییە بۆت کەبیکەم، من لەکاتی خۆیدا پێم ڕاگەیاندووی، نامەوێ لەڕۆژی دوا ڕۆژدا بگەم بە یەکێکتان مەڕێ، یابزنێ، بە باڕە باڕو قاڕە قاڕو باعە باع، بەسەر نەڕەی شانیەوە بێ، بێو بلێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم: من دەستەلاتی هیچم نییە کە بۆتی بکەم، من لەکاتی خۆیدا پێم ڕاگەیاندووی!

نامەوێ لەڕۆژی دوا ڕۆژدا بگەم بەکەسێکتان، کەسێ بەهاتوو هاوارو قیژە قیژ بە قەلادۆشکانیەوە بێ، بێت بۆلامو بلێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریامکەوە،

بەدەست ئەم کۆیلەوە کە لە تالانییەکەم حەشارداوە کە ئێستا وا بەکۆڵمەوە پەرێشانم، منیش پێی دەڵێم: من دەستەڵاتی هیچم نییە بۆت کەبیکەم بۆت، من لەکاتی خۆیدا پیتم راگەیاندووە، نامەوێ لەڕۆژی دوا رۆژدا بگەم بە یەکێکتان کاڵاو جلو بەرگ، بەخشە خش، بە قەڵادۆشکانیەوە بێ، بێ بۆلامو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریامکەوە، داماوم بەدەست ئەم کووتاڵی دزییەوە، منیش پێی دەڵێم: من دەستەڵاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆت، من لەجیهانا پێتم راگەیاندووە، نامەوێ لەڕۆژی دوا رۆژدا بگەمەوە بەکەسێکتان، مردە ماڵو زێڕو زیوی دزێتیو گزێتیو فزێتی، بە قەڵادۆشکانیەوە بێت، بێت بۆلامو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم: من دەستەڵاتی هیچم نییە کەبیکەم بۆت، من لەجیهانا، سەبارەت بە ئۆباڵی ئەم جۆرە کاروبارە پێم راگەیاندووی). {تاج/٣/٩٥، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٦، چ/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە بڕوانە ئەم ژمارانە کە لەپێشەوە رابوردن: (٩٢، ٩٣، ٩٤، ٩٥، ٩٦، ٩٧، ٩٨، ٩٩، ١٠٠).

٢- بەکۆی دەنگ زاناکان دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەردوو جیهاندا، سوودی بۆ موسوڵمان هەیە، ڕەحمەتەن لیلعالەمینە، وە مەبەست لەم فەرموودەیەو وێنەی ئەم فەرموودەیە، یەکێکە لەم دوو مەبەستە:

١- هەڕەشەو گوڕەشە، بەتایبەتی لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە، هەتا خەڵك بایەخی تەواو بە هەوڵو کۆششی خودی بدەن.

٢- (ئەگەر کەسێ موسوڵمان نەبێو لەسەر بێ باوەڕی بمرێ، نە لەجیهاناو نە لەدوا رۆژدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوودی نابێ بۆی، چونکە کلیلی رزگاری نییە، کە باوەڕە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە!).

## ٩٦٤) فەرمانڕەواکان هەرچی حەشاربدەن، دادەنرێ بەدزیو فزی.
(٤٧١٥ - ٤٧٢٢)

## باب: ماكتم الأمراء فهو غلول

١٢١٤- عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ فَكَتَمَنَا مِخْيَطًا فَمَا فَوْقَهُ كَانَ غُلُولاً يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، قَالَ: فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ أَسْوَدُ مِنَ الأَنْصَارِ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اقْبَلْ عَنِّي عَمَلَكَ، قَالَ: «وَمَا لَكَ»؟ قَالَ: سَمِعْتُكَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: « وَأَنَا أَقُولُهُ الآنَ: مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ، فَلْيَجِئْ بِقَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، فَمَا أُوتِيَ مِنْهُ أَخَذَ، وَمَا نُهِيَ عَنْهُ انْتَهَى ». {الحديث: ٤٧٢٠ = ٤٧٠٦ فم}:

عەدیی کوڕی عەمیرەی ئەلکیندی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: بەگوێیی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ لەئێوە بیکەین بەسەرکار لەسەر کارێ، لەدەرزییەکەوە بیگری هەتا زیاتر، لەوکارە حەشاربداو بیشارێتەوە بۆ خۆیو نەیداتەوە دەست ئێمە، هەتا بەپێی یاسا نامەی خودا، دابەشی بکەین بەسەر شایستەگانو پێشیاوانا، ئەوە دادەنرێ بە ناخونەكو بەگزیو بەدەستپیسی، لەڕۆژی دواڕۆژدا دەینێ بەنەڕەی شانیەوەو دەیهێنێ بۆپای هەقو حیسابو لێکۆڵینەوە!). فەرمووی: جا پیاوێکی ڕەشکەڵەی ئەنصاری، کە ئێستایش دەڵێی لەبەرچاومە، هەڵسا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کارەکەتم لێ وەرگرەوە، فەرمووی: (بۆچی ئەوە چیتە وادەڵێیت؟) وتی: گوێم لەم فەرمایشتەی تۆ بوو، کەوا وات فەرموو، لەبەرئەوە مەترسی دەکەم. فەرمووی: (دەی ئێستایش هەروا دەڵێم: هەرکەسێ لەئێوە بیکەین بەکاربەدەستی سەر شتێ، باکەمو زۆریمان بۆ بهێنێ، ئەوەی کە دەدرێ پێی، لەلایەنی فەرمانڕەواوە، چی وەك مووچەو کرێ بێ چی وەك بەخششو خەڵات باوەری بگرێ، ئەوەی کە لەسەر ئەم شێوەیە نادرێ پێی بادەستی بۆ نەبات). بۆ ژیاننامەی عەدیی بڕوانە پاش ژمارە: (١٢١٥).

## ٩٦٥) باسی دیاری کاربەدەستو فەرمانڕەواکان. (٤٧١٥ - ٤٧٢٢)

## باب: فِي هَدَايَا الأمَراءِ

١٢١٥- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً مِنَ الأَسْدِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ يُدْعَى ابْنَ الأُتْبِيَّةِ، فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ، قَالَ: هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا»؟ ثُمَّ خَطَبَنَا فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مِمَّا وَلاَّنِي اللَّهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، أَفَلاَ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا؟ وَاللَّهِ لاَ يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْهَا شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلأَعْرِفَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعِرُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ يقول: «اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ بَصُرَ عَيْنِي، وَسَمِعَ أُذُنِي». {الحديث: ٤٧١٧ = ٤٧٠٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٢٣ = ١٥٠٠، ٩٢٥، ٢٥٩٧، ٦٦٣١، ٦٩٧٩، ٧١٧٤}:

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی ئەسدی کرد بە سەرکاری سەر زەکات، کە لەبەنی سولەیم کۆی بکاتەوە، ناوی ئیبنوللوتبییە بوو، کابراکە هاتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێپرسینەوەی لەگەڵدا ئەنجامدا، ئەویش گوتی: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بەدیاری بۆم هاتووە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا کەوایە بۆ لەماڵی باوکت یا لەماڵی دایکت دانانیشیت هەتا بزانیت کە دیاریت بۆ دێت یانا، ئەگەر ڕاست دەکەیت؟).

جا لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرکەوتە سەر دوانگەو ڕاوەستاو ستایشو سوپاسی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە، گەلێ جار وادەبێ هەندێ پیاو لەئێوە دەکەم بەسەرکاری سەرکارێ، لەو ئیشو کارانەی کە خودای گەورە سپاردوونی بەمن، کەچی کەدێتەوە دەڵێ: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بەدیاری بۆم هاتووە، جا ئەگەر وایە ئەدیی بۆچی لەمالی بابی، یا لەماڵی دایکی

دانانیشیت هەتا بزانێ کە دیاریی بۆدێ یانا؟ ئەگەر راست دەکا؟ بەخودای گەورە، ئەوەی لەئێوە ناخونەك لەم ماڵە بداو چەپو گووپی لێ بکا بەناهەق، ئەوە لەرۆژی دواییدا ئەو ناخونەکە دەنێ بە نەرەی شانیەوەو دەیهێنێ بۆ دیوانی خودای گەورە، جا نامەوێ کە لەرۆژی دوارۆژدا بگەمەوە بەکەسێکتان، وشترێ بە بۆرە بۆر بە کۆڵەوەبێو بێ بۆ دیوانی خودا، یا بگەمەوە بە یەکێکتان کە رەشە وڵاخێ دزێتی بەکۆڵیەوەبێو بێ بۆ دیوانی خودا، یابگەمەوە بە کەسێکتان مەرێ، یا بزنێکی دزێتی بەکۆڵەوە بێو بێ بۆ دیوانی خودا).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی بەرزەوەکرد، هەتا سپیدەی هەردوو بنباڵەکانی بینران، ئەوجا فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە، ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناو پەیامی تۆم پێیان راگەیاند!!). ئەبو حەمید فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی کە ئەم فەرمایشتانەی دەفەرموو، وە بەگوێی خۆم گوێم لەم فەرمایشتانەی بوو، لەبەرئەوە دڵنیام لەم فەرموودەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٥، ٢٤٥٦} .

**روونکردنەوە:**

عەدی کوری عەمیرەی کینەدی هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەرە، چەند فەرموودەیەکی لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، عورسی برای کە ئەویش لە هاوەڵانی پێغەمبەر بووە، یەکێکە لەوانەی کە فەرموودەکانی عەدییان گێراوەتەوە، هەندێ دەفەرموون: عەدی لەجەزیرە مردووە، واقیدی دەفەرموێ: لە کۆفە مردووە، ساڵی چلی کۆچی، هەندێ تر دەڵێن: لەکووفە نیشتەجێ بووە، بەڵام پاش کوشتنی عوسمان کووفەی بەجێهێشتووەو چووە لەجەزیرە مردووە.

**٩٦٦) پەیمانی ژێر درەختی پەیمانی خۆشنوودیی (شەجەرەی بەیعەتی ریزوان) لەسەر ئەوە بووە کەپشتی پێغەمبەر چۆڵ نەکەن‌و لەکاتی جەنگ‌و غەزادا هەڵ نەیەن. (٤٧٨٤ - ٤٨٠١)**

**بابٌ: مُبَايَعَةُ النَبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسلمَ) تَحْتَ الشَّجَرَةِ عَلَى تَرْكِ الفِرَارِ**

١٢١٦- عَنْ جَابِرِ بْنُ عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ، فَبَايَعْنَاهُ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) آخِذٌ بِيَدِهِ تَحْتَ الشَّجَرَةِ، وَهِيَ سَمُرَةٌ، قَالَ: وَبَايَعْنَاهُ عَلَى أَلاَ نَفِرَّ، وَلَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ. {الحديث: ٤٧٨٤ = ٤٧٧٠ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٦١ = ٣٥٧٦، ٣١٥٢، ٤١٥٣، ٤٨٤٠، ٥٦٣٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئێمەی لەشکری موسوڵمانان کە لەڕۆژی حودەیبییەدا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، هەزارو چوار سەد کەس بووین لەیارانی موحەممەد (درووودی خودای لەسەر بێ)، کە ئێمە پەیمانمان دەبەست لەگەڵی، عومەر لەژێر درەختەکەدا، کەدار سەموورەیە بوو، دەستی پێغەمبەری گرتبوو، جابیر فەرمووی: لەسەر ئەوە پەیمانماندا بە حەزرەت کە لەکاتی جەنگا رانەکەین، بەڵام لەسەر مردن پەیمانمان پێ نەدا.

**روونکردنەوە:**

بۆ واتای (سەموورە) بڕوانە ژمارە: (١١٨٩) لە (غاية المأمول شرح التاجُ الجامعُ للأصول) دەفەرموێ: مۆزە، بڕوانە: تاج/٤، ص٢٣٨. كتاب التفسير. سورة الفتح، ئایەتی {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} ئەصڵە عەرەبییەکە.

١٢١٧- عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ؟ فَقَالَ: لَوْ كُنَّا مِائَةَ أَلْفٍ لَكَفَانَا، كُنَّا أَلْفًا وَخَمْسَمِائَةٍ. {الحديث: ٤٧٨٩ = ٤٧٧٥ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٦١ = ٤١٥٤، ٣٥٧٦، ٣١٥٢، ٤١٥٣، ٤٨٤٠، ٥٦٣٩} + {تجريد/٤، رقم: ١٥٦٠، ١٥٦٢، ١٥٦٣، ١٥٦٤}:

سالی کوڕی ئەبولجەعد فەرمووی: دەمزانی کە بیرەکەی حودەیبییە بەهۆی نزای پێغەمبەرەوە، لەسەر شێوەی موعجیزە، پیتو فەڕێکی گەورەی تێکەوتووەو بەشی لەشکرەکەی کردووە، بەڵام نەمدەزانی کە ژمارەی ئەو لەشکرە چەند بووە، جا لەم رووەوە عەرزی جابیری کوڕی عەبدوڵلام کرد: کە ژمارەی سوپاکەی پێغەمبەر، لەکاتی رێکەوتنی حودەیبییەدا، کە ناودارن بە ئەصحابی شەجەرە، چەندبوون؟ فەرمووی: ئەگەر سەد هەزاریش بووینایە، ئاوی بیرەکە بەشی دەکردین، چونکە بەهۆی نزای پێغەمبەرەوە پیتو فەڕێکی لەبەرچاوی تێ کەوتبوو، بەڵام خۆمان لەو غەزایەدا هەزارو پێنج سەد کەس بووین).

١٢١٨- عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ الشَّجَرَةِ أَلْفًا وَثَلاَثَمِائَةٍ، وَكَانَتْ أَسْلَمُ ثُمُنَ الْمُهَاجِرِينَ. {الحديث: ٤٧٩٢ = ٤٧٧٧ فم. بخاری. مغازی: ٤١٥٣، ٤١٥٥. تحفة الأشراف: ٥١٧٧} :

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژمارەی سوپای ئەصحابی شەجەرە، لەغەزای حودەیبییەدا، هەزارو سێ سەد کەس بوون. مایەی شانازیمە کە هۆزی بەنی ئەسلەم، کەمن خۆم لەو هۆزەم، لەو لەشکرەدا، هەشت یەکی کۆچکاران (موهاجیرین) بوون!).

**ڕوونکردنەوە:**

لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: واقیدی دەفەرموێ: ژمارەی هۆزی بەنی ئەسلەم، لە غەزای حودەیبییەدا، سەد کەس بوون، کەواتە ژمارەی کۆچکاران دەکاتە (٨ × ١٠٠ = ٨٠٠) هەشت سەد کەس، کەواتە: (١٥٠٠ — ٨٠٠ = ٧٠٠) حەوت سەد کەس بوون لە یاریدەدەران (ئەنصار).

## ٩٦٧) پەیماندان لەسەر مردن (٤٧٨٤ - ٤٨٠١)
## باب: المُبَايَعَةُ عَلَى المَوْتِ

١٢١٩- عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِى عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ. {الحديث: ٤٧٩٩ = ٤٧٨٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢١٤ = ٢٩٦٠، ٤١٦٩، ٧٢٠٦، ٧٢٠٨}:

یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوتم بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع: لەڕۆژی ڕووداوی حودەیبییەدا، لەسەرچی لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانتان بەست؟ فەرمووی: لەسەرئەوە پەیمانمان پێدا: ئەگەر بشکوژرێین لەفەرمانی حەزرەت دەرنەچین). {تاج/٤، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٤٢٦٦، چ/٤}.

## ٩٦٨) پەیمان بەستن لەسەر گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی بەپێی توانا. (٤٨١٣)
## بابُ: المُبَايَعَةُ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِيما اسْتَطَاعَ

١٢٢٠- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا: «فِيمَا اسْتَطَعْتَ». {الحديث: ٤٨١٣ = ٤٧٩٨ فم. تجريد/٥، رقم: ٢١١٢ = ٧٢٠٢ فتح الباری}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: جاران کە پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەوەندەی کە لەتواناتانا هەیەو دەتوانن!). {تاج/١، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٩، چ/٤}.

## ٩٦٩) پەیمان بەستن لەسەر گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی، مەگەر بێباوەڕییەکی ئاشکرا ببینرێ. (٤٧٢٣ - ٧٤٨)
## باب: البيعة عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ إِلاَّ أَنْ يَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً

١٢٢١- عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِى أُمَيَّةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا أَصْلَحَكَ اللَّهُ بِحَدِيثٍ يَنْفَعُ اللَّهُ بِهِ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَمَ)، فَقَالَ: دَعَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَبَايَعْنَاهُ، فَكَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، قَالَ: «إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ». {الحديث: ٤٧٤٨ = ٤٧٣٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٩٣ = ٧٠٥٥، ٧٠٥٦. تحفة الأشراف: ٥٠٧٧}:

جونادەی كوڕی ئەبو ئومەییە فەرمووی: چووین بۆسەردانی عوبادەی كوڕی صامیت، نەخۆش بوو، عەرزمان كرد: خودا چاكت بۆبكا، فەرموودەیەكمان بۆ بگێڕەوە، كەخۆت لە پێغەمبەرت بیستبێ، كەخودا بیكا بەمایەی سوودو قازانج بۆ هەموو لایێ، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی كردین، لەشەوی پەیمانی عەقەبەدا، داوای لێ كردین، كەپەیمانی پێ بدەین، ئێمەیش پەیمانمان پێدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی پەیمان لێ وەرگرتنەكەماندا، فەرمووی پێمان: (پەیمانو بەڵێنم پێ بدەن لەسەرئەوە: كە هەمیشە گوێڕایەڵو فەرمانبەری خوداو پێغەمبەری خودابن، لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەكاتی ئاسوودەییو تەنگانەدا، تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەواكانیشمان خۆمانە خۆمانەمان لەگەڵدا بكەنو نازی ئەمو ئەو بدەن بەسەر ئێمەدا، ئێمە ئەوە نەكەین بەمەهانەو لەفەرمانیان دەرنەچین). وە لەسەر ئەوەیش پەیمانمان داپێی: (كە گەڕو گێچەڵو تەشقەڵە بەو كەسانە نەكەین، كەبوون بەسەرەوكارو كاربەدەستو بەرپرسو فەرمانڕەوای موسوڵمانان، مەگەر لەكاتێكا كە بەتەواوی شووڵی لێ هەڵ بكێشینو لەڕێ دەرچنو كار بگاتە ئەوە، كوفرێكی پەتیو بێ باوەڕییەكی ئاشكرایان بەچاوی خۆتان لێ ببینن، كە ببێ بە بەڵگەیەكی رۆشنو بەهانەیەكی رەوا بۆتان لەلای خودا، ئەوجا هەقتان هەیە بەزەبری شیرو تیر، بایان پێ بدەنەوە بۆسەر شەقامە رێگەی ئیسلام). {تاج/١/٤٢، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٧، ج/٤}.

## ٩٧٠) تاقیكردنەوەی ژنی بڕواداری كۆچكار لەكاتی پەیمان پێداندا.
(٤٨١١ - ٤٨١٢)

## بابٌ: إمْتِحَانُ المُؤمِنَاتِ إذَا هَاجَرْنَ عِنْدَ المُبَايَعَةِ

١٢٢٢- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: كَانَتِ الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُمْتَحَنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ يَسْرِقْنَ وَلاَ يَزْنِينَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ فَقَدْ أَقَرَّ بِالْمِحْنَةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ، قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «انْطَلِقْنَ فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ»، وَلاَ وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلاَمِ. قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): وَاللَّهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى النِّسَاءِ قَطُّ إِلاَّ بِمَا أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى، وَمَا مَسَّتْ كَفُّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَفَّ امْرَأَةٍ قَطُّ، وَكَانَ يَقُولُ لَهُنَّ إِذَا أَخَذَ عَلَيْهِنَّ: «قَدْ بَايَعْتُكُنَّ». كَلاَمًا. {الحديث: ٤٨١١ = ٤٧٩٦ فم. بخاري. طلاق: ٥٢٨٨، ٤٨٩١، ٧٢١٤ + تجريد/٤، رقم: ١٧٠٥ = ٤٨٩٢ + تجريد/١، رقم: ٦٢٨ = ١٣٠٦ فتح}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەكانی بێ) فەرمووی: جاران كە پێغەمبەر (درودی خوداى لەسەر بێ) پەیمانو بەیعەتی وەردەگرت لەئافرەتە بڕوادارەكان، بەتایبەتی لەوانەیان كە كۆچیان دەكرد، لەشوێنی خۆیانەوە، لەبەر ڕەزای خودا، بۆلای پێغەمبەری خودا لەمەدینە، تەنیا بەدەمو بەقسە، نەك بە تەوقەكردنو دەست خستنە ناودەست، پەیمانی لێ وەردەگرتن، لەسەر ڕەفتاركردن بەم ئایەتە:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – المتحنة – ٦٠/١٢}. واتە:

ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات کە پەیمانو بەیعەتت پێ بدەن، لەسەر ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بەهیچ جۆرێ هاوبەشو هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدەنو دزی نەکەنو حیزی نەکەنو منداڵی خۆیان نەکوژنو کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەنو بوختانی درۆ لەنێوان دەستو پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن لەبەینی دەستو پێی خۆیان دایبنێنو بەدرۆو ناهەق بیکەن بەمنداڵی مێردەکەیان، وە لەکردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەنو سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەمە، لەخودا بپاڕێرەوە بۆیان کەلێیان خۆش بێ، بەڕاستی خودا تاوانبەخشو میهرەبانە).

عائیشە فەرمووی: جا هەر ژنێکی موسوڵمان ئەمەی قەبووڵ بکردایە، ئیتر دەرچوو دەبوو لە تاقیکردنەوەکەیدا، دەستووری پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: هەر ژنێ لەژنە باوەڕدارەکان، بەدەم ئەمەی قەبوول بکردایە، کە لەم ئایەتەدا گوتراوە، پێی دەفەرموو: (بڕۆ پەیمانم پێتدا).

عائیشە فەرمووی: نا بەخودا شتی وا نەبووە، کە پێغەمبەر لەکاتی پەیمان وەرگرتندا، دەست بخاتە ناو دەستی ژنەوە، قەت نەبووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەدەستی ژنی ناخۆیی (نامەحرەم) بکەوێ، مەگەر ئافرەتێ کە حەڵاڵی خۆی بووبێ، بەڵام بەدەم، تەنیا بەقسە پەیمانی لێ وەردەگرتن.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوێندم بەخودا هەرگیز پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی لەژنان وەرنەگرتووە، کە خودای گەورە فەرمانی ئەوەی پێ نەکردبێ، هەرگیز لەپی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکەوتووە لە لەپی ژنی بێگانە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی لێ وەردەگرتن، پێی دەفەرموون: (ئەوا پەیمانم پێتاندا) واتە بەس بەقسە پەیمانم لێ وەرگرتن. {تاج/١، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٦٠، چ/٤}.

## ٩٧١) فەرمانبەریی پێشەوا. (٤٧٢٣ - ٤٧٤٨)

## باب: طاعة الإمام

١٢٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أنه قَالَ: « مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي ». {الحديث: ٤٧٢٤ = ٤٧١٠ فم. بخاري. أحكام: ٧١٣٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ فەرمانبەریی من بکا، ئەوە فەرمانبەریی خودا دەکا، چونکە من هەموو شتێ لەسەر فەرمانی ئەو دەکەم، وە هەرکەسێ لەمن یاخی ببێ ئەوە لەخودا یاخی دەبێ، وە هەرکەسێ فەرمانبەریی فەرمانڕەوای من بکا، ئەوە فەرمانبەریی من دەکا، وە هەرکەسێ لەفەرمانی فەرمانڕەوای من دەرچێ ئەوە لەفەرمانی من دەردەچێ). {تاج/٧٨/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٠ ج/٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٦٧١}.

## ٩٧٢) بەگوێکردنو فەرمانبەریی کەسێ کە کارو ڕەفت بە قورئانی نامەی خودای گەورەو سەروەر بکا. (٤٧٢٣ - ٤٧٤٨)

## باب: السَّمْعُ والطَّاعةُ لِمَنْ عمِلَ بكتابِ اللّه عزَّ وجلَّ

١٢٢٤- عَنْ يَحْيَى بْنِ حُصَيْنٍ عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ الْحُصَيْنِ، قَالَ: سَمِعْتُهَا تَقُولُ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) حَجَّةَ الْوَدَاعِ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) قَوْلاً كَثِيرًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ (حَسِبْتُهَا قَالَتْ) أَسْوَدُ، يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ تعالَى، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا ». {الحديث: ٤٧٣٩ = ٤٧٢٥ فم}:

یەحیای کوڕی حوصەین لە ئوممولحوصەینی نەنکییەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە نەنکمم بیست دەیفەرموو: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی مالاّواییدا، حەجم کرد: نەنکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمایشتی زۆری فەرموو، دوایی فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! ئەگەر گریمان

فەرمانڕەواکەتان کۆیلەیەکی قولە ڕەشی دەستو پا قرتاویش بوو، بەمەرجێ بەپێی قورئان ڕەفتاربکا لەگەڵتاناو بەپێی قورئان جڵەوکێشیتان بکا، ئەوا بەگوێی بکەنو لەفەرمانی دەرمەچن). {تاج/٣/٧٨، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٣، چاپی چوارەم}.

## ٩٧٣) فەرمانبەریی لە نافەرمانی خودادا نییە، فەرمانبەریی تەنیا لەچاکەدا هەیە. (٤٧٢٣ - ٤٧٤٨)

## بابٌ: لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللّهِ إِنّمَا الطَّاعَةُ فِي المعروف

١٢٢٥- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً، فَأَوْقَدَ نَارًا، وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الآخَرُونَ: إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: «لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»، وَقَالَ لِلآخَرِينَ قَوْلاً حَسَنًا، وَقَالَ: «لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ». {الحديث: ٤٧٤٢ = ٤٧٢٨ فم. تجريد/٤/٣٤٣، رقم: ١٥٩٧ = ٤٣٤٠، ٧١٤٥، ٧٢٥٧ فتح الباري. نسائي. بيعة: ٤٢١٦. أبو داود. جهاد: ٢٦٢٥. تحفة الأشراف: ١٠١٦٨}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی ناردو پیاوێکی لە یاریدەدەران (ئەنصار) کرد بەسەرکردەیان، وە فەرمانی پێیانکرد کە فەرمانبەریی ئەو فەرماندەیە بکەنو لەفەرمانی دەرنەچن، جا ڕۆژێ فەرماندەکە تووڕە دەبێ، لەسەرئەوە فەرمانێکیان پێ دەکا، ئەوانیش بەگوێی ناکەن، جا دەڵێ: ئەی باشە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی نەکردووە بەئێوە کە لەفەرمانی من دەرنەچنو بەگوێم بکەن! گوتیان: بەڵێ، دەڵێ: ئادەی بارێ دارم بۆ کۆبکەنەوە، ئەوانیش دارەکەی بۆ کۆدەکەنەوە، دەڵێ: ئادەی ئاگری تێ بەردەن، ئەوانیش ئاگری تێ بەردەدەن ئەوجا دەڵێ: ئادەی بچنە ناوی، چەند کەسێکیان ویستیان بچنە ناوی، کەسانێ تریش گوتیان: نەکەن شتی وا بکەن، چونکە ئێمە

لەدەستی چوونە ناو ئاگری دۆزەخ هانامان بردووە بۆ پەنای ئایینی موحەممەد، ئیتر چۆن ئێستا بچینە ناوی؟

ئیتر ئەمە حاڵیان بوو، لەم بارەیەوە هەر مقۆ مقۆیان بوو، وە نەچوونە ناوی هەتا ئاگرەکە دامردەوە، لەولایشەوە فەرماندەکەیان رقەکەی نیشتەوە. جا ئەم باس و خواسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ روونکردنەوەی کارەکە فەرمووی بەوانەی کە ویستبوویان بچنە ناو ئاگرەکە: (ئەوانە ئەگەر بەقسەی ئەو فەرماندەیەی خۆیان بکردایەو بەبێ لێکۆڵینەوەی شایان لێی، بچوونایەتە ناو ئەو ئاگرە، ئەوە تاوانێکی گەورەی وادەبوو، کە لەتۆڵەو سزای ئەوەدا هەتا رۆژی قیامەت لەو ئاگرەدا دەمانەوەو لەژیانی بەرزەخدا، لەناو ئەو ئاگرەدا دەبوون، باشیان کردووە کە لەمەدا بەگوێی فەرماندەکەی خۆیانیان نەکردووە، چونکە فەرمانەکەی ناهەق بووە).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) مەدحی ئەوانی تری کرد، کە بەگوێی فەرماندەکەیان نەکردبوو، وە فەرمووی: (شتێ کە بێ فەرمانی خودابێ، نابێ بەقسەی کەس ئەنجام بدرێ، تەنیا لەکاری باشدا مرۆڤ دەبێ گوێڕایەڵ بێ!!).

**روونکردنەوە:**

بۆ روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە بەهرە لەگێڕانەوەکەی تەجریدی بوخاری وەرگیراوە.

**٩٧٤) کەسێ فەرمانی پێ بکرێ کەبێ فەرمانی خودا بکاو گوناهو تاوان ئەنجام بدا، نابێ بەگوێی ئەو فەرمانکارە بکا. (٤٧٢٣ - ٤٧٤٨)**

**بابٌ: إذ أمر بمعْصيَةٍ فلاَ سَمْعَ ولاَ طاعَة**

١٢٢٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: « عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ». {الحديث: ٤٧٤٠ = ٤٧٢٦ فم} :

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (پیاوی موسوڵمان لەسەریەتی کە گوێڕایەڵو فەرمانبەربیو لەفەرمانی گەورەی خۆی دەرنەچێ، ئەوکارەی پێ خۆش بێ یانا، بەمەرجێ فەرمانی پێ نەکرێ بە گوناهو خراپە، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێکرا بە گوناهو خراپە، ئەوەنابێ بەگوێی بکا)**. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢١} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٦٦٣}.

## ٩٧٥) گوێڕایەڵیو بەگوێکردنی فەرمانڕەواکان پێویستە بامافی ڕەوای خەڵکیش نەدەن. (٤٧٥٦ - ٤٧٦٠)

## بابٌ: طَاعَةُ الأمراءِ وإنْ منَعُوا الحُقُوقَ

١٢٢٧- عَنْ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ قَالَ: سَأَلَ سَلَمَةُ بْنُ يَزِيدَ الْجُعْفِيُّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ قَامَتْ عَلَيْنَا أُمَرَاءُ يَسْأَلُونَا حَقَّهُمْ، وَيَمْنَعُونَا حَقَّنَا، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ، فَجَذَبَهُ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ وَقَالَ: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا، وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ». وفي رواية قال: فجذبه الأشعث بن قيس فقال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ». {الحديث: ٤٧٥٩ = ٤٧٤٥ فم}:

**وائیلی ئەلحەضرەمی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ سەلەمەی کوڕی یەزیدی ئەلجوعفی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **پرسیاری لە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **کرد، فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! وادانێ کەسانێ دەبن بە کاربەدەستو فەرمانڕەوا بەسەرمانەوە، داوای مافی خۆیان لەئێمەی موسوڵمانان دەکرد، بەڵام لەهەمان کاتا مافی ئێمەی ژێر دەست (رعيّة)ی ئەوانیان نەدەدا، لەکاتی وادا تۆ فەرمانت چییە بە ئێمە!؟**

**پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ڕووی لێ وەرچەرخانو وەڵامی نەدایەوە، لەپاشا سەلەمە هەمان پرسیاری لێ کردەوە، دیسان پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ڕووی لێ وەرچەرخانو وەڵامی نەدایەوە، جا لەجاری دووەما، یا لەجاری سێیەما، ئەشعەثی**

كوڕی قەیس سەلەمەی ڕاکێشا بەلای خۆیەوە، نەبادا بەهۆی ئەو پرسیارەوە، پێغەمبەر زویربێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە گوێڕایەڵو فەرمانبەربن، چونکە هەرکەسێ لە ئێوەو لە ئەوان بەرپرسیارن لە جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانی خۆیان!). {ریاضی صالحين/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٦٦٩}.

## ٩٧٦) پێشەوای باشو پێشەوای خراپ. (٤٧٨١ - ٤٧٨٣)

## بابٌ: فِی خِيارِ الأَئِمَّةِ وَشِرارِهِمْ

١٢٢٨- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ؟ فَقَالَ: «لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ، فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ، وَلاَ تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ». {الحديث: ٤٧٨١ = ٤٧٦٧ فم}:

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێشەواو کاربەدەستە باشەکانتان ئەوانەن کەئێوە ئەوانتان خۆش دەوێو ئەوان ئێوەیان خۆش دەوێ، هەم ئێوە دووعاو نزای باش بۆ ئەوان دەکەنو هەم ئەوان دووعاو نزای باش بۆ ئێوە دەکەن، وە پێشەواو کاربەدەستە خراپەکانتان ئەوانەن کە هەم ئێوە ڕقتان لەوانەو هەم ئەوان ڕقیان لەئێوەیە، وە هەردوو لایشتان، چ ئێوەو چ ئەوان لەعنەتو نەفرەت لەیەکتری دەکەن، ئێوە لەوانو ئەوان لەئێوە!

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! تاوی شمشێریان لێ نەدەین؟ فەرمووی: (هەتا نوێژتان بۆ بکەن نەء! کاتێ شتێ لە کاربەدەستەکانی خۆتان پەسەند ناکەن، ئەوە بێز لەوکارە ناپەسەندەیان بکەنەوەو بەس، بەلام بەکەمترین بیانوو، یا مەهانە، لە فەرمانیان دەرمەچنو دەست مەکێشنەوە لە بەگوێکردنو گوێڕایەڵییان).

{تاج/٣/٨٤، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٣٠، ج/٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٦٦١}.

## ٩٧٧) بێزاری لەکاری ناپەسەندی فەرمانڕەواکان، بەبێ پەلاماردانی چەك لێیان، بەمەرجێ نوێژ بکەن. (٤٧٧٧ - ٤٧٨٠)

## بابٌ: فِی الإِنْكَارِ عَلَى الأُمَرَاءِ وَتَرْكِ قِتَالِهِمْ مَاصَلَّوا

١٢٢٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ، فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: «لاَ مَا صَلَّوْا». أَيْ مَنْ كَرِهَ بِقَلْبِهِ وَأَنْكَرَ بِقَلْبِهِ. {الحديث: ٤٧٧٨ = ٤٧٦٤ فم}:

ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بێگومان ڕۆژێ دەبێ کاربەدەستانێ دەبن بە فەرمانڕەواتان چاكو خراپ تێکەڵ دەکەن، جا ئەوەی خراپەکەیانی پێ ناخۆش بێ، ئەوە خۆی دەپەڕێنێتەوە، وە ئەوەی بەرهەڵستی خراپەکەیان بکا، ئەوە خۆی سەرفراز دەکا، بەڵام ماڵ وێرانو هاوبەشی تاوان ئەو کەسانەن کە بەو خراپەیە ڕازی دەبنو پەیڕەوی ئەوان دەکەن، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نەچین بەگژیانا؟ فەرمووی: هەتا نوێژبکەن نەء).

قەتادە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە یەکێکە لە پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: (واتە: پێناخۆشبوونەکە بەدڵ بێ، نەوەك بەدەمو بەقسەی ڕووت، هەروا بەرهەڵستیو دەربڕینی بێزاریش لە خراپەکانیان بەدڵ بێو بەدەم نەبێ. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٥، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ٩٧٨) لەکاتی خۆخۆیی کردنو خۆپەرستیدا ئارامگرتن زۆر پەسەندە. (٤٧٥٦ - ٤٧٦٠)

## باب: الأمر بالصبر عند الأثرة

١٢٣٠- عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ خَلاَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِی كَمَا اسْتَعْمَلْتَ فُلاَنًا؟ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ

بَعْـدِى أَثَـرَةً فَاصْـبِرُوا حَتَّـى تَلْقَـوْنِى عَلَـى الْحَـوْضِ». {الحـديث: ٤٧٥٦ = ٤٧٤٢ فـم. تجريـد/٤، لاپـەڕە: ١٧٤، رقـم: ١٤٨٨/٣٧٩٢، ٧٠٧٥. ترمـذى. فـتن: ٢١٨٩. نسـائى. قضاة: ٥٣٩٨. تحفة الأشراف: ١٤٨}:

ئوسـەيدى كـوڕى حـوضـەيـر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێکی ئەنصـاری لـە پەنایەکـەوە عـەرزی حـەزرەتی کـرد: ئـەی پێغـەمبـەری خـودا! منـیش وەك فیسـارە کەس بکە بەسەرکاری سەرکاریێو لەسەر ئیشێ دام بنێ! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێـوە دوای خـۆم تووشـی خۆخـۆیی‌و خۆپەرسـتی دەبـن‌و نـازی ئـەم‌و ئـەو دەدەن بەسەرتانا، جا لـەکاتی وادا ددان بـەخۆتانا بگـرن‌و صـەبرو ئـارام بکـەن بـە پیشـەی هەمیشەتان‌و لەسەر پڕوپیتی جیهان ئاژاوە بەرپا مەکەن، هەتا لەبەهەشـتا، لەسـەر حەوزی کەوسەر بەخۆم دەگەنەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٦٣، چ/٤}.

## ٩٧٩) فەرمانکردن بە پابەندبوون بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوە لەکاتی بەرپابوونی ئاژاوەو فەرتەنە گەلدا. (٤٧٦١ - ٤٧٧٢)

## باب: الأمْرِ بِلُزُومِ الجَماعَةِ عِنْدَ ظُهُورِ الفِتَنِ

١٢٣١- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكنِى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِى جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ، فَجَاءَنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْـرِ، فَهَـلْ بَعْـدَ هَـذَا الْخَيْـرِ شَـرٌّ، قَالَ: «نَعَمْ» فَقُلْتُ له: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَـالَ: «نَعَـمْ وَفِيـهِ دَخَـنٌ»، قُلْـتُ: وَمَـا دَخَنُهُ؟ قَالَ: «قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بِغَيْرِ سُنَّتِى وَيَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِى، تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ»، فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَـذَفُوهُ فِيهَا»، فَقُلْتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ صِـفْهُمْ لَنَـا، قَـالَ: «نَعَـمْ هـم قَـوْمٌ مِـنْ جِلْـدَتِنَا وَيَتَكَلَّمُـونَ بِأَلْسِنَتِنَا». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِـى ذَلِـكَ؟ قَـالَ: «تَلْـزَمُ جَمَاعَـةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ»، فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جماعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ؟ قَالَ: «فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْـتَ عَلَـى ذَلِـكَ». {الحـديث: ٤٧٦١ =

٤٧٤٧ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ١١٧، رقم: ١٤٣٥ = ٣٦٠٦، ٣٦٠٧، ٧٠٨٤. ابن ماجة. فتن: ٣٩٧٩. تحفة الأشراف: ٣٣٦٢} :

حوزەیفەی کوڕی یەمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مەردوم لەبارەی چاکەو خێرەوە، لە پێغەمبەری خۆشەویستیان دەپرسی، بەڵام من لەبارەی شەڕو خراپەوە لێم دەپرسی، مەبادا تووشم ببێ، جا عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی، ئێمە لەسەردەمی نەزانیدا، لە حاڵێکی خراپدا بووین، ئێستاکەیش خودای گەورە دەرووی خێری لێ کردووینەتەوەو کەوتووین بەسەر ئەم خێرو خۆشییەدا، جا ئایا لەپاش ئەم خێرە شەڕی تر دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ). گوتم: ئەی باشە لەپاش ئەو شەڕە خێری تر دێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، بەڵام لیخنو دووکەڵاوییە). گوتم: قوربان! لێڵیو تەماوییەکەی هی چییە؟ فەرمووی: (کۆمەڵێ پەیدا دەبن، بەشێوەیێ رابەری ئەو خەڵکە دەکەن، کەدوورە لەرابەریو رێنمایی ئایینی منەوە، شت تێکەڵو پێکەڵ دەکەن، کاری شەرعیو کاری بێ شەرعییان لێ دەبینی). گوتم: باشە لەپاش ئەم خێرە دووکەڵاوییەو تەمومژاوییە، خراپەی تر دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، کۆمەڵانێ پەیدادەبن، لەدەرگای دۆزەخدا وەستاون، پەیتا پەیتاو کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکان لەڕێ دەردەکەنو بەرەو دەرگاکانی دۆزەخ راپێچیان دەکەن، هەرکەسێ بەگوێیان بکا، فڕەی دەدەنە ناوی!).

عەرزیم کرد: قوربان! ناونیشانی ئەمانەمان پێ بفەرمووە؟! فەرمووی: (بەناو بەدیمەن لەخۆماننو لە رەگەزی ئێمەنو بەزمانی خۆمان دەدوێن). گوتم: باشە، من یاهەر موسوڵمانێ کەوتە ئەو سەردەمە، فەرمانت بەچییە پێی؟ فەرمووی: (لایەنی کۆمەڵی موسوڵمانانو پێشەوای ئەوان بگرە). گوتم: ئەی ئەگەر نە کۆمەڵو نە پیشەوایان هەبوو چۆن؟ فەرمووی: (لەوتیپو تاقمانە لەهەموویان کلاو کەناربە، تەنانەت ئەگەر هەرچارت نەبوو، باوەش بکە بە قەدی شێخەڵێکاو، لەبن شێخەڵێکا بۆ خۆت ستار بگرە، هەتا دوور لەوان لەسەر ئەو حاڵە مردن دەگاتە فریاتو مەرگ دەبێ بە میوانت!). {تاج/٣، لاپەڕە: ٨٠، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٦} .

## ٩٨٠) ئەوانەی لەفەرمانی پێشەوا دەردەچن‌و لە کۆمەڵ جیادەبنەوە.

(٤٧٦١ - ٤٧٧٢)

## باب: فيمنْ خرجَ منَ الطّاعة وفارقَ الجماعة

١٢٣٢- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ، وَفَارَقَ الْجَمَاعَةَ، فَمَاتَ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً، وَمَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ يَغْضَبُ لِعَصَبَةٍ، أَوْ يَدْعُو إِلَى عَصَبَةٍ، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبَةً فَقُتِلَ فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ، وَمَنْ خَرَجَ عَلَى أُمَّتِي يَضْرِبُ بَرَّهَا وَفَاجِرَهَا، وَلاَ يَتَحَاشَ مِنْ مُؤْمِنِهَا وَلاَ يَفِي لِذِي عَهْدٍ عَهْدَهُ، فَلَيْسَ مِنِّي، وَلَسْتُ مِنْهُ». {الحديث: ٤٧٦٣ = ٤٧٤٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ لەفەرمانی فەرمانڕەوا دەرچێ‌و لە کۆمەڵ جیاببێتەوە، لەپاشا لەسەر ئەو حاڵە بمرێ، ئەوە بە نەزانی دەمرێ، وەك مردنی سەردەمی نەزانی، وە کەسێ بکوژرێ، یا کوشتار بکا لەژێر ئاڵای کوێرانەدا، کە ئاڵای کوێرانە ئەوەیە، بەهەق‌و بەناهەق لەسەر خزم‌و خوێشی خۆی هەڵبداتێ‌و لەپێناوی ئەوانا جەنگ بکاو گوێ بەهەق‌و ناهەق نەدا، ئەوە لە ئۆمەتی من نییەو کوشتنەکەی کە دەکوژرێ کوشتنێکە وەك کوشتنی سەردەمی نەزانی لەپێناوی ڕەگەز پەرستیدایە، نەوەك لەبەر خودا، وە هەرکەسێ لە ئۆمەتم ڕاست بێتەوە لە ئۆمەتم‌و پەلاماری بداو کوێرانە خاس‌و خراپی داپلۆسێ‌و بەهەر کەسێکا بگا تێی سرەوێنێ‌و شەلم کوێرم دەست لە موسوڵمانان نەپارێزێ‌و پەیمانی خاوەن پەیمانەکان، کەپێیان دەگوترێ ئەهلی ذیمە نەباتە سەر، ئەوەیش لەمن نییە). {تاج/٣، لاپەڕە: ٨٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٧}.

١٢٣٣- عَنْ نَافِعٍ قَالَ: جَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُطِيعٍ حِينَ كَانَ مِنْ أَمْرِ الْحَرَّةِ مَا كَانَ، زَمَنَ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: اطْرَحُوا لأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ وِسَادَةً، فَقَالَ: إِنِّي لَمْ آتِكَ لأَجْلِسَ، أَتَيْتُكَ لأُحَدِّثَكَ حَدِيثًا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ خَلَعَ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ لَقِيَ اللَّهَ

يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ حُجَّةَ لَهُ، وَمَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِى عُنُقِهِ بَيْعَةٌ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً». {الحديث: ٤٧٧٠ = ٤٧٥٦ فم}:

نافیع فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) هات بۆلای عەبدوڵلای کوڕی موطیع، لەو سەردەمەدا کە کوشتارە گەورەکەی ئەلحەررە روویدا، کە لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا بوو، عەبدوڵلای کوڕی موطیع، فەرمووی: ئادەی رایەخێ بۆ باوکی ئەورەحمان راخەن تا لەسەری دانیشێ ئیبنو عومەر فەرمووی: من بۆ دانیشتن نەهاتووم، بۆئەوە هاتووم بۆلات کە ئەم فەرموودەیەت پێ بڵێم، کە بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە، لێیم بیست دەیفەرموو: (کەسێ دەست بکێشێتەوە لەو پەیمانەی کە داویەتی بە فەرمانڕەواو لە فەرمانبەریی‌و تاعەتی دەرچێ، لەڕۆژی دوارۆژدا، کە دەچێتەوە دیوانی خودا، هیچ بەڵگەو قەواڵەیەکی نییە، لەسەر ئەو پەشیمان بوونەوەو دەست کێشانەوە لە فەرمانبەریی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٨}.

**روونکردنەوە:**

رۆژی ئەلحەررە رۆژێکی ناسراوە لەمێژووی ئیسلاما، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا روویدا، سوپایەکی زۆری هێنا لەخەڵکی شام، بەسەرکردەیی موسلیمی کوڕی عوقبەی ئەلموری، لەمانگی قوربانی ساڵی شەستو سێی کۆچیدا (٦٨٣ز) دەستیان کرد بەکوشتو بڕی خەڵکی مەدینە، وەشاری مەدینەیان تالان کرد، صەحابەو تابیعییەکی زۆریان شەهید کرد، ئەلحەررە خڕە بەرداوییەکە، وا لەدەوری مەدینەی جاران، بەردێکی رەشی زۆری والێ، جەنگەی کوشتارەکە لەوێدا روویدا. (بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، لاپەڕە: ٣٣٦، ژمارە: ١٢١٣).

## ٩٨١) تاوانی کەسێ یەکرێزیی گەل تێك بدات. (٤٧٧٣ - ٤٧٧٥)
## باب: فِيمَنْ فرَّقَ أمْرَ الأمَّةِ وَهِيَ جَمِيعٌ

١٢٣٤- عَنْ عَرْفَجَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « إِنَّهُ سَتَكُونُ هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ وَهْيَ جَمِيعٌ، فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ، كَائِنًا مَنْ كَانَ». {الحديث: ٤٧٧٣ = ٤٧٥٩ فم}:

**عەرفەجە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: بیستم لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (گەلێ کارەسات ڕوودەدەن و گەلێ ئاژاوەو ئاشووب بەرپادەبن، جا ئەگەر ئەم ئۆمەتی ئیسلامە، یەك پارچە بوون و، گێرە شێوێنێ ویستی یەکرێزییان تێك بداو دووبەرەکییان تێ بخات، ئەوە هەرکەسە بووە، گریمان پیاو چاکیش بووە، کۆی لێ مەکەنەوە، بەشمشێر دایپاچن، مادام دەبینن بەبێ مەهانەی ڕەوا، هەلگەڕاوەتەوە لەپێشەوای موسوڵمانان). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٩}.**

**ڕوونکردنەوە:**

**عەرفەجەی کوڕی شورەیح، لە هاوەڵانی پێغەمبەرە، لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە پیاوان (ڕیجال)ی صەحیحی موسلیم و ئەبو داوودو نەسائییە، لە ئەبوبەکری صەدیقەوە گێڕانەوەی هەیە، مامۆستای ئەم زاتانەیش بووە: زیادی کوڕی علاقەو ئەبو حازیمی ئەشجەعی و ئەبو یەعقووبی ئەلعەبدی و کەسانی تریش.**

## ٩٨٢) ئەوەی چەك لەئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە. (٢٧٩ - ٢٨٠)
## باب: مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاحَ فَلَيْسَ مِنَّا

١٢٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاحَ فَلَيْسَ مِنَّا، وَمَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا». {الحديث: ٢٧٩ = }:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەوەی چەك لەئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە، وە ئەوەی گزی لەئێمە بکا لەئێمە نییە). {ڕیاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە: ١٥٧٩}.**

### ٩٨٣) فەرمان بەدەستگرتن بەكۆمەڵێ، بە كەمەندی پتەوی خودای گەورەو وازهێنان لە دووبەرەكی. (٤٤٥٦ - ٤٤٦١)

### بابٌ: الأمْرُ بِالْإِعتصامِ بِحَبْلِ اللّهِ وَتَرْكِ التفرُّقِ

١٢٣٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ اللَّهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثًا، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاثًا، فَيَرْضَى لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا وَيَكْرَهُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ». {الحديث: ٤٤٥٦ = ٤٤٤٦ فم} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لەم سێ شتەتان زۆر رازییە: یەكەم: ئەوەیە كە بەس تەنها خودای گەورەی خۆتان بپەرستن. دووەم: ئەوەیە كە بەهیچ جۆرێ هاوبەشی بۆ پەیدانەكەن. سێیەم: ئەوەیە كە بەكۆمەڵی دەست بەكەمەندی پتەوی خودای گەورە بگرن‌و هەموو بەبێ دووبەرەكی پشتی ئایینی خودا بگرن. خودای گەورە حەزیش ناكا لەم رەفتارانە بۆتان: لەوتی وتیءو لە پرسیاری زۆرو لە سواڵ كردنی زۆر، وە لەزایەكردنی ماڵ بەخۆڕایی). {ریاضی الصالحین/١/٢٧٢، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٠ + ریاض/٤، لاپەڕە: ١٦٣، زنجیرە: ٢٥٦، ژمارە: ١٧٨١} .

### ٩٨٤) نوێباوێ رێك نەكەوێ لەگەڵ یاسانامەی خودادا ئایەخ دەكرێ‌و دەدرێتە دواوە. (٤٤٦٧ - ٤٤٦٨) (باب: رَدُّ المحْدَثات مِنَ الأمُور)

١٢٣٧- عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: سَأَلْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ رَجُلٍ لَهُ ثَلاَثَةُ مَسَاكِنَ فَأَوْصَى بِثُلُثِ كُلِّ مَسْكَنٍ مِنْهَا، قَالَ: يُجْمَعُ ذَلِكَ كُلُّهُ فِى مَسْكَنٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ قَالَ: أَخْبَرَتْنِى عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ». {الحديث: ٤٤٦٨ = ٤٤٥٧ فم. بخاری. صلح: ٢٦٩٧. أبو داود. السنة: ٤٦٠٦} :

سەعدی كوڕی ئیبراهیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای قاسمی كوڕی موحەممەد، ئەم پرسیارەم لێی كرد: پیاوێ سێ خانووی هەبێ، راسپێرێ كە لەپاش مەرگی خۆی، لەهەر خانوویەك لەو سێ خانووانە سێ یەكێكی خێربێ، ئایا ئەمە

چۆنەو ئەم راسپێرییە تەواوە یانا؟ فەرمووی: هەرسێ سێ یەکەکە لەیەك خانوویانا کۆدەکرێنەوەو ئەو خانووە هەمووی دەبێ بەخێرو دوو خانووەکەی تر دەمێننەوە بۆ کەلەپوور بەرەکان، چونکە من لە عائیشەی پوورمم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ شتێکی ناشایستە لەم ئایینەی ئێمە زیاد بکا، کە پەیوەندی پێوە نەبێ، ئەو شتە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٣} گێڕانەوەی ئێرە ئاوایە: (هەرکەسێ کارێ بکا، کە فەرمانو رەزای ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوکارە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە!).

**روونکردنەوە:**

١- لەپەڕاوە شەرحەکانا، پوختەی ئەم پرسە ئەمەیە:

(مەبەست ئەوەیە کە لایەنێ لە لایەنانی خاوەن ماف، لەم جۆرە پرسەدا زیانەومەند نەبێ، دەنا لەم پرسیارەی بەردەستدا، ئەگەر سێ خانووەکە لە باشیو خراپیدا جیاوازییان هەبوو، ئەوە دەبێ هەرسێ خانووەکان سێ یەکیان لێ دەرکرێ، دەنا نا، تا کەلەپوور بەرەکان زیانیان لێ نەکەوێ).

٢- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق برازای حەزرەتی عائیشەیە، کە کەسناوی (کونیە)ی ئەبو عەبدورەحمانە، گێڕانەوەی لەزۆر لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەرەوە هەیە، وەك عائیشەو عەبادیلە، قاسم راستاڵو بلندو زاناو پێشەوا بوو، زۆر خاوەن وەرع بوو، فەرموودەی زۆرە، کە موحەممەدی باوکی کوژرا، ئەوکاتە قاسیم هەتیو بوو، عائیشەی پووری سەرپەرشتی ئەوی دەکرد، بوخاری دەفەرموێ: قاسم باشترینی سەردەمی خۆی بوو، سوننەت زانێکی زۆر نایاب بوو، دەڵێن لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا، لە سەدو شەشی کۆچیدا مردووە.

## ٩٨٥) کەسێ فەرمان بکا بەچاکەو خۆی نەیکا
## باب: في الذي يأمر بالمعروف ولا يفعله

١٢٣٨- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قِيلَ لَهُ: أَلاَ تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ؟ فَقَالَ: أَتُرَوْنَ أَنِّى لاَ أُكَلِّمُهُ إِلاَّ أُسْمِعُكُمْ؟ وَاللَّهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَيْنِى وَبَيْنَهُ مَا

دُونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لاَ أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ وَلاَ أَقُولُ لأَحَدٍ يَكُونُ عَلَيَّ أَمِيرًا، إِنَّهُ خَيْرُ النَّاسِ، بَعْدَ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: « يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُلْقَى فِي النَّارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ، فَيَقُولُونَ: يَا فُلاَنُ مَا لَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ: بَلَى، كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ». {الحديث: ٧٤٠٨ = تجريد/٣، لاپەڕە: ٤٤٨، رقم: ١٣٢٠ = ٣٢٦٧، ٧٠٩٨. تحفة الأشراف: ٩١} :

بە ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە (رەزای خودایان لێ بێ) یان گوت: ئەوە بۆ ناچیت بۆلای عوسمانو قسەی لەگەڵدا بکەیت، سابەڵکوو خودا ئاوێ بکا بەم ئاگرەدا، فەرمووی: بۆچی لەئێوە وایە کەدەبێ هەر لەبەرچاوی ئێوە ئەم باسەی لەگەڵدا بکەم، بەخودا لەم بارەیەوە دوو بەدوو گەڵێ قسەم لەگەڵیدا کردووە، بەڵام خۆم نادەم لەو ئاقارە کەمن یەکەم کەس بم ئاڵای ناڕەزایی هەڵکەمو ببم بەمایەی ئاژاوە بەرپاکردن!

لەهەمان کاتدا من بەهیچ فەرمانڕەوایەکی خۆشم نالێم: کە باشترین کەسە، لەسەر ئەم فەرمایشتەدا کە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیم بیستووە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی دواڕۆژدا، بازێ پیاو دێننو توورِی دەدەنە ناو ئاگرەوە، کابرا وەك گێرە بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو ریخۆڵەکانی خۆی گێرە دەکا، دۆزەخیەکان لەدەوری کۆمەڵە دەکەنو پێی دەڵێن: ئای! فلانە کەس! ئەمە خۆتی؟! ئەوە تۆ بۆ؟! تۆ چییتە؟ تۆ چی دەکەی لێرە؟ خۆ تۆ لای خۆی ئامۆژگاری باشی ئێمەت دەکرد! ئەمەت لەچیو ئەوەت لەچی؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ وابووم بەڵام داخەکەم بۆ خۆم وانەبووم، بە پێچەوانەوە بە ئێوەم دەگوت چاکە بکەنو خۆم نەیم دەکرد، بە ئێوەم دەگوت خراپە مەکەن، کەچی بۆ خۆم خراپەم دەکرد، ئەمەی دەیبینن سزای ئەو کەسانەیە، کە ئەمە رەفتارو کرداریان بووە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٥٢٣١ + ریاض/١، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٩٨، لاپەڕە: ١٨١} .



# ٣٥- نامەی راوو شكارو سەربڕاوەكان

## كِتَابُ الصَّيْدِ وَالذَّبَائِحِ

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١، لاپەڕە: ١٤٨، لەژمارە: ٢٥٤٩ هەتا ژمارە: ٢٦٣٥ = زنجیرە: ١ هەتا زنجیرە: ١٦، ج/٤} + {فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٥٨ هەتا زنجیرە: ٣٧٥}.

### ٩٨٦) راوكردن بەتیرو كەوانو ناوی خوا هێنان لەكاتی تێگرتندا. (٤٩٤٩ - ٤٩٦٤)

### باب: الصَّيْدُ بِالسِّهَامِ وَالتَّسْمِيَةُ عِنْدَ الرَّمْيِ

١٢٣٩- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ، فَكُلْهُ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ، وَقَدْ قَتَلَ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَيُّهُمَا قَتَلَهُ، وَإِنْ رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ غَابَ عَنْكَ يَوْمًا فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلاَّ أَثَرَ سَهْمِكَ، فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، وَإِنْ وَجَدْتَهُ غَرِيقًا فِي الْمَاءِ فَلاَ تَأْكُلْ».

{الحديث: ٤٩٥٨ = ٤٩٤٢ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١١٦، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٥، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧. فتح الباری}:

عەدی كوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (كاتێ سەگی فێرە راوی خۆتت بەرەڵا كردە گیانی نەچیر ناوی خودا بهێنە، جا ئەگەر نەچیرەكەی گرت بۆتو بەزیندوویی پیاگەیشتیت، ئەوا سەری ببڕە، ئەگەر فریاشی نەكەوتیو بەرلەوە تۆ گەیشتیتە سەری، ئەو كوشتی، بەڵام لێی نەخواردبوو، ئەوا لەم كاتەیشدا ئەو نەچیرە كوژراوە حەڵاڵەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر روانیت وا لەگەڵ سەگەكەی تۆدا، سەگێكی تریش هەیە لەسەر نەچیرەكە، وە نەچیرەكە كوژراوە، ئەوا لێی مەخۆ، چونكە تۆ نازانی سەگەكەی تۆ

کوشتوویەتی کەناوی خودات لێ هێناوە، یا سەگەکەی تر کوشتوویەتی، کە نازانی خاوەنەکەی لەکاتی بەرەڵا کردنیدا بۆ گیانی نێچیرەکە، ناوی خودای هێناوە یانا، کاتێکیش تیر دەگریتە نەچیرێ، ناوی خودا بهێنەو بیسمیللا بکە، ئەگەر نەچیرە زامارەکە رۆژێ نەدۆزرایەوەو بەو زامارییەشەوە خۆی شاردەوەو دوایی دۆزیتەوەو روانیت بەس شوێنەواری تیرەکەی تۆی واپێوە، ئەوا ئەگەر حەزدەکەیت حەڵاڵەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر نەچیرە پێکراوەکە کە دۆزیتەوە لەئاوا خنکابوو، ئەوا مەیخۆ، چونکە نازانی کە تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی، یا ئاوەکە خنکاندوویەتی). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٦٧، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**٩٨٧) راوکردن بەتیرو کەوانو بەسەگی فێرە راوو سەگی تر.** (٤٩٤٩ - ٤٩٦٤)
**باب: فی الصَّيْدِ بِالقَوْسِ وَالكَلْبِ المُعلَّمِ وَغَيْرِ المُعلَّمِ**

١٢٤٠- عَنْ أَبِى ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ نَأْكُلُ فِى آنِيَتِهِمْ، وَأَرْضِ صَيْدٍ أَصِيدُ بِقَوْسِى، وَأَصِيدُ بِكَلْبِىَ الْمُعَلَّمِ أَوْ بِكَلْبِىَ الَّذِى لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، فَأَخْبِرْنِى مَا الَّذِى يَحِلُّ لَنَا مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكُمْ بِأَرْضِ قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ تَأْكُلُونَ فِى آنِيَتِهِمْ، فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَ آنِيَتِهِمْ فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا، ثُمَّ كُلُوا فِيهَا، وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكَ بِأَرْضِ صَيْدٍ، فَمَا أَصَبْتَ بِقَوْسِكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ كُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ كُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِى لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ». {الحديث: ٤٩٦٠ = ٤٩٤٤ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١١٨، رقم: ١٨٢٧ = ٥٤٧٨، ٥٤٧٨، ٥٤٩٦. أبو داود. صيد: ٢٨٥٥. ترمذي. السير: ١٥٦٠م. نسائي. صيد: ٤٢٧٧}:

ئەبو ثەعلەبەی ئەل-خوشەنی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لە وڵاتی شامین، دراوسێی خاوەن نامەکانینو لە وڵاتی ئەواندایین، واین لەگەڵ مەسیحیو جوولەکەدا، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان لە مەنجەڵەکانیاندا، گۆشتی بەراز

دەکولێنن، لەقاپو حاجەتەکانیاندا، مەیو بادەو ئارەق دەخۆنەوە، لەم بارودۆخەدا ئێمە چارمان چییە، ئایا لەو حاجەتەیانا شت بخۆین، یاشت بخۆینەوە؟ وە هەروەها ئێمە واین لە ولاتێ نەچیری زۆرە، هەم بەتیرو کەوان راودەکەم، هەم بەو سەگەم کە مەشقی راوی کردووە، هەم بەو سەگەم کە مەشقی راوی نەکردووە (کەلبی موعەللەم: سەگی فێرکراو: سەگی مەشق دیدە) جا ئەی پێغەمبەری خودا! لەم جۆرە راوە کامەیان حەلاڵە بۆم؟ فەرمووی: (ئەوەی کە گوتت، ئێوە وان لەناو ولاتی خاوەن نامەکاناو لەناو قاپو قاچاخی ئەوانا شت دەخۆنو شت دەخۆنەوە، ئەگەر دەفری ترتان دەست کەوت، لەوەدا بخۆنو بخۆنەوەو لەدەفری ئەوانا، نەبخۆنو نەبخۆنەوە، بەلام ئەگەر حاجەتی ترتان دەست نەکەوت بەئاو پاك بیان شۆرنو ئیتر تیایاندا بخۆنو بخۆنەوە، بۆ ئەوەیشی کە گوتت واین لەولاتێ کە نەچیری زۆرە، ئەوەی کە بەتیرو کەوان راوی دەکەیت، وەناوی خودای لێ دەهێنی لەکاتی تیر پێوەنانا، ئەوە بیخۆ، هەروەها ئەوەیشی کە بەسەگی راوی خۆت راوی دەکەیت، ناوی خودای بالا دەستو شکۆمەندی لێ بهێنەو ئەوجا بیخۆ، هەروەها، ئەوەیشی کە بەسەگی خۆت راوی دەکەیتو سەگی مەشق دیدە نییە، ئەگەر فریای سەربڕینی کەوتیت ئەوا بیخۆ).

**روونکردنەوە:**

ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی، لە هاوەڵە پێشینەکانی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پەیمانی (بەیعەتی شەجەرە)دا، لەخزمەت پێغەمبەردا پەیمانی وەرگرت. {بڕوانە: ژمارە: ١٢١٢، تەجرید =ژمارە: ٢٩٥٨ فەتحولباری. بەرگی/٣، لاپەڕە: ٣٣٥، چاپی یەکەم = لاپەڕە: ٣٣٢، چ/٢}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆناو هۆزەکەی خۆی، لەسەر دەستی ئەودا هۆزەکەی قەبووڵی ئیسلامیان کرد، لەجەنگی صەفیندا، لەگەڵ کەسیان نەبوو، بەشداری ئەم جەنگەی نەکرد، دەفەرموون: هەموو شەوێ دەچووە دەرەوە،

تەماشایەکی وردی ئاسمانی دەکرد، ئەوسا دەگەڕایەوەو سەجدەیەکی ئایاتی دەبرد.
{بڕوانە: التاج الجامع للأصول/١، ص٣١٢. السجدة لمطلق الآيات بەرگی/١، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ٩٣٤ وەرگەڕاوە کوردییەکە}.

ئەبو ثەعلەبە دەفەرموێ: (لەخودا دەخوازم کەمن لەسەرەمەرگا، وەك ئێوە کە لەکاتی گیانەڵادا دەکەونە لرخە لرخ، من ئاوا نەکەومە لرخە لرخ) ئەبو زاهیریە دەفەرموێ: (جا شەوێ ئەبو سەعلەبە شەو نوێژدەکا، لەناو جەرگەی شەوا، لەناو سەجدەدا فەرمانی هەق بەجێ دەهێنێو دەمرێ، لەوکاتەدا کچەکەی دخەوێ، لەخەویدا دەبینێ کەوا باوکی مردووە، کچەکە لەخەو رادەچەنێو هاواردەکا: کوا باوکم؟ دەڵێن: وا لەنوێژگاکەی خۆی سەرگەرمی شەو نوێژە، جالای خۆیەوە بانگی دەکا: بابە، بابە! وەڵام نابێ، جا رادەکا بۆلای، دەڕوانێ بە مردوویی والە کوڕنووشدا، کە رایدەوەشێنێ دەکەوێ بەلادا!

ئەبو سەعلەبە لەبوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە (متفق علیە)یە. کۆمەڵێ لە مێژوو نووسانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموون: لەساڵی حەفتاو پێنجی کۆچیدا لەشام مردووە). مامۆستا حاجی مەلا موحەممەدی رەئیس، کە مامۆستای گەلاڵەی لای ماوەت بو، جەڵتەیەکی سەخت لێی دەدا، لە خەستەخانە دەیخا، سێ کەس لە کوڕەکانی گێڕایانەوە گوتیان: (نەخۆشینەکەی زۆر گران بوو، بەردەوام دووعای دەکردو دەیفەرموو: خودایە! لەم سەرە مەرگەدا نوێژم نەچێ، کوڕەکانی دەیانگوت حەزمان دەکرد: کەنزایێ تر بۆ خۆی، یا بۆ ئێمە بکا، بەڵام هەر ئەوە نزاکەی بوو: (خودایە! نوێژم نەچێ!) گوتیان: ئاخرجار دەستنوێژی عەصرمان بۆ گرتو لەسەر قەرەوێڵەکە بەرەو قیبلە رامان کێشا، نوێژێکی جوانی رێکوپێکی بەدڵی خۆی کردو لەپاش سلاودانەوە، هەندێ ویردو قورئانی لەبەر خوێندو بەر لەبانگی شێوان، زۆر بەئاسانی وەك خەوی لێ بکەوێ گیانی دەرچوو!!

## ٩٨٨) راوکردن بەتیرە کۆڵەو نەقیزەو ناوی خودا هێنان لەکاتی تێبەردانی سەگەکە بۆ گیانی نێچیرەکە. (٤٩٤٩ - ٤٩٦٤)

## بابٌ: الصَّيْدُ بِالْمِعْرَاضِ وَالتَّسْمِيَةِ عِنْدَ الإِرْسَالِ

١٢٤١- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْمِعْرَاضِ؟ فَقَالَ: «إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ، فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ فَإِنَّهُ وَقِيذٌ فَلاَ تَأْكُلْ». وَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، عَنِ الْكَلْبِ؟ فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ، فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّهُ إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: فَإِنْ وَجَدْتُ مَعَ كَلْبِي كَلْبًا آخَرَ، فَلاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَهُ؟ قَالَ: «فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ». {الحديث: ٤٩٥٤ = ٤٩٣٨ فم. تجريد/٥، زنجـيره: ٧٥، رقـم: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٦، تجريد/٥، رقم: ١٨٣٠ = ٥٤٨٤، ٥٤٧٥ فتح البارى = رقم: ١٨٢٦ تجريد، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧. ابن ماجة. صيد: ٤٢١٤. تحفة الأشراف: ٩٨٦٠}:

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! من ڕاودەکەم، جاری واهەیە تیرە کۆڵە، یا نەقیزە، کە بەعەرەبی پێی دەڵێن (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێکم، ئەم جۆرە ڕاوە حەڵاڵە یانا؟ فەرمووی: (ئەگەر تیرە کۆڵەت گرتە نەچیرو بە باری تیژییەکەیدا پێکای‌و تێی هەڵچەقی‌و زاماری کرد، ئەوە بیخۆ، چونکە حەڵاڵە، تەنانەت کاتێ دەگەیتە سەری مردبوو هەر حەڵاڵە، بەمەرجێ نەگەنی بێ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی ئەنگاوتی‌و کوشتی‌و فریای سەربڕینی نەکەوتی‌و بەوتیرە مردار بوویەوە، ئەوە مەیخۆ، چونکە ئەوە بەزەبر مردارەوە بووەو بەر ئەو مەوقووزەیە دەکەوێ کەخودا لە قورئاندا حەرامی کردووە، کە ناسراوە بە (مَوْقُوذَة).

وەلێشم پرسی لەبارەی نەچیری ڕاوکراو بەسەگی فێرەڕاو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرە ڕاوم هەیە کە دەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆ من، وە لەکاتی بەرەڵاکردنیاندا کە دەیانکەمە نەچیرەکە ناوی خودا دەهێنم، ئەی ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (کاتێ سەگی فێرە ڕاوی خۆتت بەرەڵا کردە گیانی نەچیرو

ناوى خودات لێ هێنا، ئیتر لە گۆشتی نەچیرەکە بخۆ، بەمەرجێ سەگەکە لێی نەخواردبێ، دەنا لێی مەخۆ چونکە لەکاتی وادا سەگەکە راوی بۆ خۆی کردووە نەوەك بۆ تۆ).

عەرزیم کرد: قوربان! ئەگەر وا رێکەوت، سەگێ تریش لەگەڵ سەگەکەی مندا، لەسەر نێچیرەکە بوو، وە نەم دەزانی کە کامیان گرتوویەتی، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خودات لە سەگەکەی خۆت هێناوە، وەناوی خودات لەسەگی تر نەهێناوە).

### ٩٨٩) ئەگەر نێچیرەکەی لێ ون بوو، دوایی دۆزییەوە
### باب: إذَا غَابَ عَنْهُ الصَّيْدُ ثُمَّ وَجَدَهُ

١٢٤٢- عَنْ أَبِى ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فِى الَّذِى يُدْرِكُ صَيْدَهُ بَعْدَ ثَلاَثٍ: فَكُلْهُ مَا لَمْ يُنْتِنْ». {الحديث: ٤٩٦٣ = ٤٩٤٧ فم}:

ئەبو سەعلەبە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ لەپاش سێ شەو نەچیرەکەی بدۆزێتەوە، بابیخوات، بەمەرجێ نەگەنیبێ).

### ٩٩٠) دروستە سەگی راوی و سەگی پاسی ئاژەڵ و پاسی کشتوکاڵ رابگیرێ. (٣٩٩٢ - ٤٠١٣)
### باب: إبَاحَةُ إقْتِنَاءِ كَلْبِ الصَّيْدِ وَالمَاشِيَةِ

١٢٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا إلاَّ كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ». {الحديث: ٤٠٠٠ = ٣٩٩٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢٩ = ٥٤٨٠، ٥٤٨١، ٥٤٨٢}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ سەگێ رابگرێ، کەسەگی راوو پاسی ئاژەڵ و پاسی زەوی و زارو مەزرانەبێ، هەموو رۆژێ (هەتا ئەو سەگە رابگرێ) دوو پارچە لە پاداشی کردەوەی باشی کەم

دەبێتەوە). {تاج/٢، زنجيره: ١٧١، ژماره: ١٩١٨ + تاج/٣، زنجيره: ٦، ژماره: ٢٥٨٧ چ/٤} + {رياض/٤، زنجيره: ٣٠٦، ژماره: ١٦٨٨/١}.

١٢٤٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَنِ اتَّخَذَ كَلْبًا إِلاَّ كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ، انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ». قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَذُكِرَ لاِبْنِ عُمَرَ قَوْلُ أَبِى هُرَيْرَةَ فَقَالَ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ صَاحِبَ زَرْعٍ. {الحديث: ٤٠٠٧ = ٤٠٠٢ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (هەرکەسێ سەگێ ڕابگرێ، سەگی پاسی ئاژەڵو سەگی ڕاوو سەگی پاسی زەویو زارو مەزرا نەبێ، هەموو ڕۆژێ ئەندازەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

زوهری دەفەرموێ: کاتێ ئەم فەرموودەیەی ئەبو هوروەیرە باسکرا بۆ ئیبنو عومەر، کە ئەم ڕستەیەی واتیا: (سەگی پاسی زەویو زارو مەزرا نەبێ) فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبو هورەیرە بێ، خۆی خاوەنی مەزرا بوو، بۆیە وا گرنگی داوە بەم ڕستەی (سەگی پاسی زەویو زارو مەزرا نەبێ).

**ڕوونکردنەوە:**

بابەتێکی بەسوودم لەبارەی سوود وەرگرتن لەسەگ نووسیوە، ئەگەر تەماشا بکرێ بێ سوود نابێ، وا لەبەرگی پێنجی تەجریدی بوخاری، لەکۆتایی وەرگەڕاوی فەرموودەی ژمارە: ١٨٢٩ = ٥٤٨٠ فتح الباری).

## ٩٩١) باسی کوشتنی سەگ. (٣٩٩٢ - ٤٠١٣)

## بابٌ: فِى قَتْلِ الكِلاَبِ.

١٢٤٥- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِقَتْلِ الْكِلاَبِ، حَتَّى إِنَّ الْمَرْأَةَ تَقْدَمُ مِنَ الْبَادِيَةِ بِكَلْبِهَا فَنَقْتُلُهُ، ثُمَّ نَهَى النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ قَتْلِهَا، وَقَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ الْبَهِيمِ ذِى النُّقْطَتَيْنِ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ». {الحديث: ٣٩٩٦ = ٣٩٩٢ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد، کە سەگ بکوژین، تەنانەت وای لێ هاتبوو، ژن لەلادێوە سەگی خۆی دەهێنا بۆمان دەمان کوشت، لەپاشا جڵەوگیری کرد لەکوشتنی سەگ، وە فەرمووی: (سەگی ڕەشی سادەی چوارچاو قوتار مەکەن، کەدوو نیتکەی سپی وا بەژوور چاویانەوە، چونکە ئەم جۆرە سەگە شەیتانن). {تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٧٩}.

## ٩٩٢) ڕێگری لە پەلەپیتکە تەقاندن. (٥٠٢٣ - ٥٠٢٧)

## بابٌ: النهی عَن الحذف

١٢٤٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّ قَرِيبًا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَذَفَ قَالَ: فَنَهَاهُ، وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهى عَنِ الْخَذْفِ، وَقَالَ: «إِنَّهَا لاَ تَصِيدُ صَيْدًا، وَلاَ تَنْكَأُ عَدُوًّا، وَلَكِنَّهَا تَكْسِرُ السِّنَّ وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ». قَالَ: فَعَادَ، فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهى عَنْهُ ثُمَّ تَخْذِفُ لاَ أُكَلِّمُكَ أَبدًا. {الحديث: ٥٠٢٦ = ٥٠١٤ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢٨ = ٥٤٧٩، ٦٢٢٠}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی خزمی عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل، پەلەپیتکەی دەتەقان، عەبدوڵلا پێی فەرموو: پەلەپیتکە مەهاوێژە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی نەداوە، وە دەیفەرموو: (ئەوە نە نێچیری پێ ڕاو دەکرێ‌و نە دوشمنی پێ کوڵەوار دەکرێ، بەلام بە پێچەوانەوە دوور نییە کە ددانی کەسێ بشکێنێ، یا چاوی دۆستێ کوێربکا). فەرمووی: جا ماوەیێ لەوەدوا دیسان عەبدوڵلا پیاوەکەی دییەوە پەلەپیتکەی دەهاویشتەوە، جا عەبدوڵلا بەکابرای فەرموو: من فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ تۆ دەگێڕمەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگە بە پەلەپیتکە هاویشتن نادات، کەچی تۆ هەرواز ناهێنی، جا کەوای لێ هات هەرگیزاو هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەم!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٩٥ ج/٤}.

## ٩٩٣) راوی ئاژەڵ و گیانداری ماڵی نادروستە. (٥٠٣٠ - ٥٠٣٦)

## باب: النهى عَنْ صَيْدِ البَهَائِمِ

١٢٤٧- عَنْ هِشَامَ بْنَ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ جَدِّي أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دَارَ الْحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَإِذَا قَوْمٌ قَدْ نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ. {الحديث: ٥٠٣٠ = ٥٠١٨ فم. بخاري. ذبائح: ٥٥١٣. تجريد/٥، رقم: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فتح الباري}:

هیشامی کوڕی زەیدی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکی باپیرەما چووم بۆ ماڵی حەکەمی کوڕی ئەییوب، روانیمان وا کۆمەڵێ مریشکێکیان ناوەتەوە بە نیشانەو تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کە لێی نەئەدا دەیاندا بەخاوەنی مریشکەکە، فەرمووی: جا باپیرەم ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا کە ئاژەڵ و گیانلەبەر بنرێتەوە بەنیشانەو لەسەر ئەو شێوەیە بکوژرێت!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١، لاپەڕە: ٥٤، چاپی: دووەم + ١٦٠٢/١٣ - ٦٧}.

١٢٤٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: مَرَّ ابْنُ عُمَرَ بِفِتْيَانٍ مِنْ قُرَيْشٍ قَدْ نَصَبُوا طَيْرًا، وَهُمْ يَرْمُونَهُ، وَقَدْ جَعَلُوا لِصَاحِبِ الطَّيْرِ كُلَّ خَاطِئَةٍ مِنْ نَبْلِهِمْ، فَلَمَّا رَأَوُا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ لَعَنَ اللَّهُ مَنْ فَعَلَ هَذَا، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَعَنَ مَنِ اتَّخَذَ شَيْئًا فِيهِ الرُّوحُ غَرَضًا. {الحديث: ٥٠٣٥ = ٥٠٢٣ فم. تجريد/٥/١٣٥، رقم: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فتح الباري}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا بووم، لەلای تاقمێ لاوی قوڕەیشەوە رەت بووین، باڵندەیەکیان نابۆوە بەنیشانەو تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کە لێی نەدەدا دەیاندا بەخاوەن مریشکەکە، کە چاویان کەوت بە ئیبنو عومەر، لەشەرمانا هەڵهاتن و بلاوەیان لێکرد، ئیبنو عومەر فەرمووی: کێ ئەمەی کردووە؟ ئەمە ئیشی چی بێ ویژدانێکە، دەك نەفرینی خودای لێ بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرەت و لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە گیانلەبەر، هەر گیانلەبەرێ بێ،

دەنێتەوە بەنیشانە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٢٦٠٢ چ/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١ چاپی دووەم}.

## ٩٩٤) فەرمانکردن بەسەربڕینی گیانلەبەری حەڵاڵ لەسەر شێوەیەکی پەسەندو تیژکردنی چەقۆو ئامێری سەربڕین. (٥٠٢٨ - ٥٠٢٩)

## بابٌ: الأمر بإِحْسَانِ الذبْح وحَدّ الشَّفْرَة

١٢٤٩- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ». {الحديث: ٥٠٢٨ = ٥٠١٦ فم. أبو داود. أضاحي: ٢٨١٥. ترمذي. ديات: ١٤٠٩. نسائي. ضحايا: ٤٤١٧. رياض الصالحين/٢، زنجيره: ٧٤، ژماره: ٩/٦٤٠}:

شەددادی کوڕی ئەوس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو شتم لە پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرکردووە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا چاکەی لەسەر هەموو شتێ نووسیوە، وە فەرمانی کردووە کە هەموو شتێ بە ڕێکوپێکیو لەسەر شێوەیەکی جوانو ڕەوا بکرێ، جا کەوابوو، ئەگەر کەسێکتان لە تۆڵەی کەسێکی کوژراودا کوشتەوە، یا بەحەددی شەرعی کوشتتان، ئەوە لەسەر شێوەیەکی باش بیکوژنەوەو لەوکاتەدا بە نەزاکەت بن لەگەڵیاو، ئەگەر داوای ئاوو شتێکی کرد لەپێش کوشتنیدا بیدەنێو شایەتمانی پێ بهێنن، تا لەسەر ئیسلامەتی بمرێ، وە هەروەها ئەگەر شتێکتان سەربڕی، لەسەر شێوەیەکی باش سەری ببڕن، وە تیغەکەتان تیژبکەنو پشووی سەربڕاوەکەتان بدەنو زیادە ئازاری مەدەن!). {تاج/١٦/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٥، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

أ/ ئەم شتانە لەکاتی جێبەجێ کردنی حەددی کوشتنەوەو لەسێدارەداندا، بەکورتی سوننەتن:

١- ئاوو نانـدان بەكەسـى كـوژراو، شـايەتمان هێنـان پێـی، تەوبـەكردن، وەسـێت كـردن، وەك ئـەوە چـی خێرێكـی بـۆ بكـەن‌و قـەرزی كێـی لەسـەرەو قـەرزی لەسـەر كێیەو داوای گەردن ئازادی لـە خـەڵك‌و فیسـارە كـەس نوێـژی لەسـەر بكـاو فیسـارە كەس بیشۆرێ‌و حەجی بۆ بكەن‌و نوێـژەكانی بـۆ بگێڕنـەوەو هـەروا ڕۆژوو، ئەگـەر نوێژ، یا حەج، یا ڕۆژوو قەرزار بوو، یا هەر وەسێتێكی تر كە ڕەواو شەرعی بێ.

٢- سوننەتە كە بەپێی بـواری گونجـاو، ڕێگـەی پـێ بـدرێ كـە كەسوكاری خـۆی ببینێ‌و لەگەڵیان دابنیشێ لەپێش كوشتنەوەدا.

٣- ئەگـەر سـپاردەیێ، نامەیـەكی هـەبوو، بـدرێ بـە خـاوەنی‌و بـدرێ بەكەسـی پەیوەندیدار.

٤- بەپێی ڕۆژو شوێن هەوڵ بدرێ كوشتنەوەكەی بەپێی شەرع بێ‌و ئازاری كەم بـێ‌و جەسـتەی نەشـێوێنرێ‌و تەرمەكـەی بدرێتـەوە بـەخاوەنی، یـا بەكەسـوكاری‌و بشۆرێ‌و كفـن بكـرێ‌و نوێـژی مـردووی لەسـەر بكـرێ‌و لـە گۆڕسـتانی موسـوڵمانان بنێژرێ، ئەگـەر خـۆی موسـوڵمان بـوو، وە پرسـەی سـێ ڕۆژ بـۆ دابنـرێ وەسـێ ڕۆژ پرسەو سەرەخۆشـی لەكەسـوكاری بكـرێ‌و دێنـی‌و سـەردانی گـۆڕی بكـرێ لەلایـەنی كەسوكاریەوە، وە ئەگەر ژنی هـەبوو، ژنەكـەی چـوار مـانگ‌و دەشـەو ڕەشپۆشـی بـۆ بگرێ‌و تازێ نەشكێنێ‌و نابێ لەو ماوەیەدا شووبكاتەوە، یاخۆی بڕازێنێتەوە، ئەگەر سكی هەبوو هەتا سكەكەی دادەنێ تازێ نەشكێنێ‌و شوونەكاتەوە.

كورت‌و پوخت: (ئـەوەی كـەبۆ مـردووی ئاسـایی، پێویسـتە بكـرێ، یـا سـوننەتە بكرێ، بۆ كوژراوی بەداری حەددیش، پێویستە بكرێ، یا سوننەتە بكرێ!).

٥- لەپێش جێبەجێ كردنی كوشـتنی یـا لەسـێدارەدانی، ڕێگـەی پـێ بـدرێ، كـە دوو ركات نوێژی سوننەتی سەرە مەرگ بكا، بۆ ئەم نوێژە بڕوانە: {تاج/٤، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٤٦٤٣}.

٦- هـەموو كەسـێ كـە دەمـرێ، یـا دەكـوژرێ، لەبـەر هـەر هۆیـەك بـێ، یـاخۆی دەكوژێ، ئەمانەی سەرەوەی بۆ دەكرێ، منداڵ بێ، گەورەبێ، ژن بێ یـا پیـاو، نێربـێ،

یامێ، یا نێرومێ بێ، بەمەرجێ موسوڵمان بێ، شەهیدی مەعرەکە نەبێ، واباشە بەجلەکانی خۆیەوە بنێژرێ، بەڵام موسوڵمانێ بەحەددی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بکوژرێ، نە دەشۆررێ، نە کفن دەکرێ، نە پرسەی بۆ دادەنرێ، نە لەگۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێ، نەخێری بۆ دەکرێ، بەڵام دەکرێ بەژێر خۆڵەوە لەجێگەیەکی شیاودا.

ب/ ئاژەڵێ، یا گیانداری کە سەردەبڕرێ، دیسان سوننەتە کەئاو بدرێ، برسی نەکرێ، ئازاری زیاد نەدرێ، چەقۆکە تیژبکرێ.

ج/ شەددادی کوڕی ئەوسی کوڕی ثابیتی ئەلخەرەجی، برازای حەسسانی کوڕی ثابیتە، خۆیو ئەوسی باوکی موسوڵمان بوون (رەزای خودایان لێ بێ) باوکی ئامادەی بەدر بوو، لە ئوحوددا شەهید بوو، پیاوێکی زاناو دانابوو، لەشام نیشتەجێ بوو، تابڵێی قسەزانو رەوانبێژ بوو، لەکاتی تووڕە بوونا، رقی خۆی قووت ئەدایەوە، شەدداد لەزانایانی هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، شامیەکان فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی پێدەدا: (کەخۆیو منداڵەکانی دەبن بە پێشەوایانی خەڵکی شام). لەسەردەمی موعاوییەدا لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا، لە فەلەستین دەمرێ، لەساڵی پەنجاو هەشتی کۆچیدا، لە بەیتولمەقدیس نێژراوە.

### ٩٩٥) سەربڕین بەهەر شتێ فیچقە بەخوێن بکا، ددانو نینۆکی لێ دەرچێ. (٥٠٦٥ - ٥٠٦٩)

### بَابٌ: الذَّبْحُ بِمَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَالنَّهْيُ عَنِ السِّنِّ وَالظُّفُرِ

١٢٥٠- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لاَقُو الْعَدُوِّ غَدًا، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى؟ قَالَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَعْجِلْ أَوْ أَرْنِي، مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ، فَكُلْ لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ». قَالَ وَأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وَغَنَمٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ لِهَذِهِ الإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَإِذَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شَيْءٌ فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا». {الحديث: ٥٠٦٥ = ٥٠٥٣ فم. تجريد/٣/١٦٨، ژمارە:

١٠٧٧ = ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٤، ٥٥٠٢، ٦٠٥٥، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤، ترمـــذى. أحكام: ١٤٩٢. نسائي. صيد: ٤٣٠٨، ٤٤٢٢، ٤٤٢٣}:

رافیعی کوڕی خەدیج (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە سبەینێ دەگەین بەدوژمن، وەچەقۆیشمان پێ نییە، ئایا بەلەتە قامیش‌و بەچەقۆی بەردین‌و شتی وای تر ئاژاڵ سەربڕین؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (گورجبە) یا فەرمووی: (دەستوبردی لێکە، تا لەژێر دەستتا مردار نەبێتەوە، ئیتر بەهەرچی سەری دەبڕی باشە، بەمەرجێ فیچقە بەخوێن بکاو لەکاتی سەربڕیندا خوێنەکە پەلەمیزکە ببەستێ، وەناوی خودای لێ ببرێ، وە بەمەرجێ ئەو شتە ددان‌و نینۆك نەبێ، ئەوە لێی بخۆن، پێشت بڵێم کە لەبەرچی دروست نییە شت بەددان‌و بە نینۆك سەربڕێ، چونکە ددان ئێسکەو ئێسکیش کوڵەو تیژنییەو بەزۆری مرداری دەکاتەوە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشییەکانە، فەرمووی: جا تالانی وشترو رانمان هێنا، وشترێ لە تالانییەکە تەرا بوو، پیاوێ تیرێکی پێوە ناو، گلی دایەوە، وە بەو تێرە وشترەکە مرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەندێ وشتر هەن سڵ‌و سرکن، وەك جانەوەری کێوی سرك‌و تۆڕ وان، جا ئەگەر شتی وا روویداو چارتان نەدەکرد، وەك ئەمە ئاوای لێ بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٢٥٩٦}.



# ٣٦- نامەی قوربانی

## كتابُ الأضاحي

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٦٧ هەتا زنجیرە: ٣٧٥ لە لاپەڕە: ٩٩١وە هەتا لاپەڕە: ١٠١٣ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ١٣٥ + تاج الأصول. بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ١٨٠، زنجیرە: ١٢ هەتا زنجیرە: ١٥، لەژمارە: ٢٦١٥وە هەتا ژمارە: ٢٦٣٥، چ/٤} + {تەجرید/٥، لاپەڕە: ١٠٠ هەتا لاپەڕە: ١١٢}.

**٩٩٦) كاتێ دەی یەكەمی مانگی قوربان دەستی پێكرد، باش نییە بۆ كەسێ كە دەیەوێ قوربانی بكا، لەمووی خۆی بگرێ، یا نینۆكی خۆی بكا.** (٥٠٨٩ - ٥٠٩٥)

**بابٌ: إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ فَلاَ يَمَسَّ مِنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ**

١٢٥١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَنْ كَانَ لَهُ ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ فَإِذَا أُهِلَّ هِلاَلُ ذِي الْحِجَّةِ فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ، وَلاَ مِنْ أَظْفَارِهِ شَيْئًا حَتَّى يُضَحِّيَ». {الحديث: ٥٠٩٣ = ٥٠٨٢ فم}:

ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ و ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاكیزەكانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسێ دەیەوێ قوربانی بكا، كە مانگی نوێی قوربان هەڵهات، ئیتر با نەموو لەخۆی بكاتەوەو نە ناخونی خۆی بكا، تا قوربانییەكەی دەكات). {تاج/٣، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ٢٦٣٣، چ/٤}.

**٩٩٧) كاتی دیاریكراو بۆ سەربڕینی قوربانی.** (٥٠٣٧ - ٥٠٥٤)

**باب: الوَقْتُ الَّذِي يذبحُ فيهِ الأُضْحيةَ**

١٢٥٢- عَنِ جُنْدَبُ بْنُ سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ الأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَلَمْ يَعْدُ أَنْ صَلَّى وَفَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ سَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ يَرَى لَحْمَ أَضَاحِيَّ قَدْ ذُبِحَتْ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ، فَقَالَ: «مَنْ كَانَ ذَبَحَ أُضْحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ،

أَوْ نُصَلِّيَ، فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ». {الحديث: ٥٠٣٧ = ٥٠٢٥ فم. بخاري. عيدين: ٩٨٥، ٥٥٠٠، ٥٥٦٢، ٦٦٧٤، ٧٤٠٠. نسائي. ضحايا: ٤٣٨٠. ابن ماجة. أضاحي: ٣١٥٢. تحفة الأشراف: ٣٢٥١}:

جوندوبی کوڕی سوفیان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، هەر کە لەنوێژی جەژن بوویەوە، یەکسەر بەبێ دواکەوتن سڵاوی دایەوە، کەچی چاوی بەگۆشتی قوربانی کەوت، کە بەرلەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرنوێژیی نوێژی جەژن ببێتەوە سەربڕابوون، فەرمووی: (هەرکەسێ قوربانی سەربڕێ، پێش ئەوە کە نوێژی جەژنی کردبێ، با لەجێگەی ئەوە ئاژەڵێ تر سەربڕێ) یا فەرمووی: (بەرلەوە کە ئێمە نوێژی جەژنمان ئەنجام دابێ، با لەباتی ئەوە قوربانییەکی تربکا، بەلام ئەوەی کەهەتا دوا تەواو بوونی نوێژی جەژن سەری نەبڕیوە، باناوی خودای لێ بێنێو سەری ببڕێ!).

**ڕوونکردنەوە:**

لەمەزهەبی وڵاتی کوردەواری خۆمانا، کە مەزهەبی ئیمامی شافیعییە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کاتی قوربانی دەست پێدەکا، لەپاش خۆرکەوتنو تێپەڕبوونی ئەوەندە کە بەشی کردنی نوێژی جەژنو دوو وتاربکا، وە هەتا ڕۆژی چوارەمی جەژنی قوربان، کاتەکەی بەرۆژو بەشەو بەردەوامە هەتا بانگی شێوانی شەوی چواردەی مانگ، ئیتر نوێژی جەژن کرابێ، یا نەکرابێ، شاربێ یا گوند جیاوازی نییە.

## ٩٩٨) کەسێ لەپێش کردنی نوێژی جەژندا قوربانی سەربڕێ، بری قوربانی ناکەوێ. (٥٠٣٧ - ٥٠٥٤)

## بابٌ: مَنْ ذَبَحَ الضَّحِيَّةَ قَبْلَ الصَّلاَةِ لَمْ تُجْزِهِ

١٢٥٣- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَن نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَنْحَرُ، فَمَنْ فَعَلَ

ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ»، وَكَانَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَدْ ذَبَحَ فَقَالَ: عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ، فَقَالَ: «اذْبَحْهَا وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ». {الحديث: ٥٠٤٦ = ٥٠٣٤ فم. تجريد/١، رقم: ٥٠٠ = ٩٥١، ٩٥٥، ٩٦٥، ٩٦٨، ٩٧٦، ٩٨٣، ٥٥٤٥، ٥٥٥٧، ٥٥٦٠، ٥٥٦٣، ٦٦٧٣. أبو داود. أضاحي: ٢٨٠٠. ترمذي. أضاحي: ١٥٠٨. نسائي. عيدين: ١٥٦٢ + تجريد/١/٤٧٧، ذمارة: ٥٠٠/٩٥١}:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەم ڕۆژەمانا، کە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، یەکەم شت لەڕێو ڕەسمی جەژن کە دەستی پێدەکەین ئەوەیە کە نوێژی جەژن دەکەین، ئینجا دەگەڕێینەوەو قوربانی سەردەبڕین، جا ئەوەی کەئاوا بکا ئەوە یاساو سوننەتی ئێمەی پێکاوە، بەڵام ئەوەی لەپێش نوێژدا قوربانی سەربڕێ ئەوە دانانرێ بە قوربانیو فڕی بەسەر قوربانییەوە نییە، بەڵکوو ئەوە گۆشتەو کردوویەتی بۆ کەسوکاری خۆی).

ئەبو بوردەی کوڕی نییاز (ڕەزای خودای لێ بێ) قوربانییەکەی خۆی لەپێش نوێژدا، سەربڕیبوو، عەرزی حەزرەتی کرد: گێسکێکم هەیە لە چێتیرێ باشترە ئایا دەبێ کە بیکەم بەقوربانی؟ فەرمووی: (سەری ببڕەو بیکە بە قوربانی، بەڵام لەپاش تۆ گێسك بۆ کەسی تر دروست نییە کەبیکا بە قوربانی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٢٦٢١}.

## ٩٩٩) ئاژەڵ لەچی تەمەنێکا دەست دەدا بۆ قوربانی. (٥٠٥٥ - ٥٠٥٩)

## باب: مَايَجُوزُ مِنَ الأَضَاحِي مِنَ السِّنّ

١٢٥٤- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً، إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ». (الحديث ٥٠٥٥=٥٠٤٣ فم. أبوداود. أضاحي:٣٧٩٧. نسائي. ضحايا: ٤٣٩٠).

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاژەڵی سەرە بکەن بە قوربانی، بەڵام ئەگەر دەستتان نەدەڕۆیشت، کاوڕو گێسکیش بکەن بەقوربانی!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٦} .

**ڕوونکردنەوە:**

بەپێی مەزهەبی ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **جەزەعە لەبزنا** ئەوەیە کە ساڵێکی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە دوو ساڵ، گێسك بەم واتایە، لەلای شافیعییەکان، بەکۆی دەنگ، دەست نادات بۆ قوربانی، جەزەعە لەمەڕا، ئەوەیە کە یەك ساڵی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە ساڵی دووەم، کاوڕ بەم واتایە، لەلای شافیعییەکان دەست دەدات بۆ قوربانی بەکۆی دەنگ.

بەڵام لە فەرموودەیەکا هەیە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی بە عوقبەی کوڕی عامیرداوە، کە گێسك (عەتوود = جەزەعە) بکا بەقوربانی بۆ خۆی. {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٥ چ/٤ — ش/د/ت/ن} .

جا لەو بیرو باوەڕەدام بۆ نەدارا، دروستە گیسك بکا بەقوربانی، بەمەرجێ ساڵێکی تەواوکردبێ. لە فەتحولمولهیمدا، لە خەطیبی شەربینییەوە ڕاگوێز دەکا: (جەزەعە لە بزن‌و لەمەڕدا ئەوەی کە ساڵێکی تەواوکردبێ‌و پێی نابێتە دوو ساڵ، وە ئەگەر لەپێش ئەوەیشدا کە ساڵ تەواو بکا ببێ بە جەزەعە، واتە: ددانی بکەوێ، دەست دەدا بۆ قوربانی). {بڕوانە: فەرموودەی دواوە ژمارە:١٢٥٥} .

## ١٠٠٠) **کردنی گێسك بە قوربانی.** (٥٠٥٥ - ٥٠٥٩)

## باب: **الضحية بالجذع**

١٢٥٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِينَا ضَحَايَا، فَأَصَابَنِي جَذَعٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أَصَابَنِي جَذَعٌ، فَقَالَ: «ضَحِّ بِهِ». {الحديث: ٥٠٥٨ = ٥٠٤٦ فم. تجريد/٣، زنجيرە: ٤٥، رقم: ١٠١٢ = ٢٣٠٠، ٢٥٠٠، ٥٥٤٧، ٥٥٥٥. ترمذى. أضاحى: ١٥٠٠م. نسائى. ضحايا: ٤٣٩٢. تحفة الأشراف: ٩٩١٠} :

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕکەیێ ڕانی پێمدا، کە دابەشی بکەم بەسەر هاوڕێکانمدا بۆ قوربانی، گێسکێ مایەوە بۆ خۆم، عەرزی پێغەمبەرم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! گێسکێ بەرمن کەوتووە، فەرمووی: (بیکە بە قوربانی بۆ خۆت!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٥}.

**١٠٠١) کردنی دووبەرانی تەوی شاخدار بە قوربانی سوننەتە، وە هەروەها سوننەتە بەدەستی خۆی قوربانی سەربڕێ، وە ناوی خودا بهێنێ‌و ئەڵڵاهو ئەکبەر بکا.** (٥٠٦٠ - ٥٠٦٤)

**باب: استحبابُ الضَّحيّة بِكَبْشَيْنِ أملَحَيْنِ أقْرَنَيْنِ، والذّبْحُ باليد، والتَّسْميةُ والتكبير**

١٢٥٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ، أَقْرَنَيْنِ، قَالَ: وَرَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ، قَالَ: وَرَأَيْتُهُ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا، قَالَ: وَسَمَّى وَكَبَّرَ. {الحديث: ٥٠٦١ = ٥٠٤٩ فم. بخاري. أضاحي: ٥٥٥٨. نسائي. ضحايا: ٤٤٢٧. ابن ماجة. أضاحي: ٣١٢٠. تحفة الأشراف: ١٢٥٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووبەرانی تەوی شاخداری کرد بەقوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین، فەرمووی: وەناوی خودای هێناو ئەڵڵاهوئەکبەری کردو فەرمووی: (بِسْمِ اللّهِ وَاللّهُ أَكْبَرُ) وەقاچی دانا لەسەر لاملیان، وە لەسەر لای چەپ پاڵی خستن‌و بەدەستی چەپی سەری گرتن‌و بەدەستی ڕاستی چەقۆکەی گرت. ئەنجا سەری بڕین). {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٣ ج/٤}.

**١٠٠٢) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قوربانی دەکا بۆ خۆی‌و بۆ کەسوکارەکەی‌و بۆ گەلی ئیسلامی خۆی.** (٥٠٦٠ - ٥٠٦٤)

**باب: ذَبْحُ النّبيّ (صلّى اللهُ عليهِ وسلم) الضحيّةَ عنهُ وعنْ آله وأمّته**

١٢٥٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، يَطَأُ فِي سَوَادٍ، وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ، فَأُتِيَ بِهِ لِيُضَحِّيَ بِهِ، فَقَالَ

لَهَا: «يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ»، ثُمَّ قَالَ: «اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ»، فَفَعَلَتْ، ثُمَّ أَخَذَهَا، وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قَالَ: «بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ»، ثُمَّ ضَحَّى بِهِ. {الحديث: ٥٠٦٤ = ٥٠٥٢ فم}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەرانێکی شاخداریان بۆ هێنا، کە بیکا بە قوربانی، هەرچوار پەلیو دەموچاوو ژێر سکی بەرانەکە بۆ رەلۆوکێکی رەشباو بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! کێردەکە بهێنە بە هەسانێ، بە بەردێ تیژی کە، منیش فەرمانەکەیم بەجێ هێناو وامکرد، ئینجا کێردەکەی هەلگرتو بەرانەکەی پاڵ خستو سەری بڕیو لەکاتی سەربڕینەکەیدا فەرمووی: {بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ}: بەناوی خودا، ئەی خودایە! ئەی پەروەردگارم! ئەم قوربانییە قەبووڵ بفەرموو لە موحەممەدو لەخانەوادەی موحەممەدو لەگەلی موحەممەد، ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە بەرانەکەی کرد بەقوربانی).

**روونکردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە بەلگەیە لەسەر ئەوە، کە موسوڵمان لەپاش ئەوە کە کارێکی خێر ئەنجام دەدا، وەك ئەوە قوربانییەك دەکا، یا خەتمەیەکی قورئان دەکا، موسوڵمانێ تریش لەپاداشەکەیدا هاوبەش بکا. تەماشای فەتحولمولهیم بفەرموو.

٢- نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپێشا لەسەر لای چەپ پاڵی بخا، ئەگەر بزنو مەڕو شتی تری وابوو، سەری ئاژەڵەکە بەدەستی چەپی بگرێ، وە قاچ دابنێ لەسەر لاملی، لەکاتی دەستکردن بەسەربڕین ناوی خودا بهێنێو باش وایە بلێ: (بِسْمِ اللّهِ وَاللّهُ أَكْبَرْ)و بەجوانی سەری ببڕێ بەچەقۆیەکی تیژ. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٢٦١٦}.

**١٠٠٣) لەپاش تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ بەسەر قوربانیدا، با قوربانیکەر لێی نەخوات.** (٥٠٧٠ - ٥٠٨٧)

**بابُ: النَّهْىُ عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الأَضَاحِى بَعْدَ ثَلاَثٍ**

١٢٥٨- عَنِ أَبِى عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ: أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِى طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، قَالَ: فَصَلَّى لَنَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ نَهَاكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ نُسُكِكُمْ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ فَلاَ تَأْكُلُوا. {الحديث: ٥٠٧١ = ٥٠٥٩ فم. تجريد/٥/١٢٥، ژمارە: ١٨٣٨ = ٥٥٦٩ فتح البارى}:

ئەبو عوبەید، مەولای ئیبنو ئەزهەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت عومەری کوڕی خەطابا (ڕەزای خودای لێ بێ) ئامادەی جەژنی قوربان بووم، لەپاش ماوەیێ، لەو سەردەمەدا کە ئیمامی عوسمان ئابلۆقە درابوو، ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، عەلی کوڕی ئەبو طالیب کردی بۆمان، لەپێش وتاردا نوێژی جەژنی بۆ کردین، ئەوجا وتارێکیدا بۆمان، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیگری دەکرد لەوە کە لەدوا تێپەڕبوونی سێ شەو بەسەر سەربڕینی قوربانییەکانتانا لە گۆشتی قوربانییەکانتان بخۆن، کەواتە لەپاش سێ شەو لەگۆشتی قوربانییەکانتان مەخۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ٢٦٣٥}.

**١٠٠٤) مۆڵەتدان بۆ خواردنی گۆشتی قوربانی لەپاش سێ شەو، دروستیشە لێی پاشەکەوت بکرێو لێشی بکرێ بەخێر.** (٥٠٧٠ - ٥٠٨٧)

**باب: فِى الإِذْنِ فِى لُحُومِ الأَضَاحِى بَعْدَ ثَلاَثٍ، وَجَوازِ الإِدِّخَارِ وَالتَّزَوُّدِ وَالصَّدَقَةِ**

١٢٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَاقِدٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى بَكْرٍ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ، فَقَالَتْ: صَدَقَ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) تَقُولُ: دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حِضْرَةَ الأَضْحَى، زَمَنَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «ادَّخِرُوا ثَلاَثًا ثُمَّ تَصَدَّقُوا بِمَا بَقِىَ»، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ قَالُوا:

يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ يَتَّخِذُونَ الأَسْقِيَةَ مِنْ ضَحَايَاهُمْ وَيَجْمِلُونَ فِيهَا الْوَدَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَمَا ذَاكَ»؟ قَالُوا: نَهَيْتَ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَقَالَ: «إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِي دَفَّتْ فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا». {الحديث: ٥٠٧٦ = ٥٠٦٤ فم. بخاري. أطعمة: ٥٤٢٣، ٥٤٣٨، ٥٥٧٠، ٦٦٨٧، ترمذي. أضاحي: ١٥٤٧. أبو داود. أضاحي: ٢٨١٢. نسائي. أضاحي: ٤٤٣١. ابن ماجة. أضاحي: ٣١٩٧. تحفة الأشراف: ١٧٩٠١}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر، فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی واقید (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەوە کە قوربانیکار، لەپاش تێپەڕبوونی سێ شەو لە گۆشتی قوربانی خۆی بخوات. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر فەرمووی: ئەمەم باسکرد بۆ عەمرە، فەرمووی: ڕاست دەکا، من بۆخۆم لە عائیشەم بیست (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەڕۆژی جەژنی قوربانا، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند کەسێ لە خەڵکی سارانشینەکان، هاتن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە، بە ئومێدی یارمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (لە گۆشتی قوربانییەکانتان، بۆتان هەیە ئەگەر بتانەوێ بەشی سێ ڕۆژی خۆتانی لێ هەڵبگرن، ئیتر چی لەوە زیاتربوو ببیەخشنەوە). جا لەدوا ئەو ساڵە، هەندێ کەس عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! کەسانێ لەپێستی قوربانییەکانیان کوندەو مەشکەو هیزە دروست دەکەن‌و پیوی تواوەی تیا هەڵدەگرن، ئایا شتی وادەبێ؟ فەرمووی: (بۆچی چی بووە تا ئێوە ئەم پرسیارە بکەن؟).

عەرزیان کرد: ئەی ئەوە نەبوو کەتۆ ڕێگریت دەکرد لەوە کە لەپاش سێ ڕۆژ لە گۆشتی قوربانی خۆمان بخۆین؟ دەی کردنی پێستی قوربانی بە کوندەو مەشکەو هیزە بەر ئەم نەهیە ناکەوێ؟ لەوەڵاما فەرمووی: (ئەوە ئەوجارە بۆیە نەییم لێ کردن لەخواردنی گۆشتی قوربانییەکانتان لەپاش سێ شەو، هەتا یارمەتی ئەو سارا نشینە هەژارانە بدەن، کە ڕەویان کردبوو بۆلای ئێوە تا دەستگیرۆییەکیان

بکەن، جا دروستە کە لەگۆشتی قوربانی خۆتان بخۆن‌و لێی قایمە بکەن‌و لێشی ببەخشنەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٠} .

## ١٠٠٥) باسی فەرع‌و عەتیرە. (٥٠٨٨)

## باب: فِی الفَرَعِ وَالعَتِیرَةِ

١٢٦٠- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رَضِیَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِیرَةَ»، زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِی رِوَایَتِهِ: وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ کَانَ یُنْتَجُ لَهُمْ فَیَذْبَحُونَهُ. {الحدیث: ٥٠٨٨ = ٥٠٧٧ فم. تجرید/٥/١٠١، ژمارە: ١٨٢٥ = ٥٤٧٣، ٥٤٧٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەفەرەع هەیەو نەعەتیرە). {ش/د/ت/ن = بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داودو تەرمەزی‌و نەسائی = تاج/٣/١٨٨، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٦١١} لە گێڕانەوەی بوخاریدا: ئیمامی زوهری لە تەفسیری فەرەع‌و عەتیرەدا دەفەرموێ: (فەرەع یەکەم نۆبەرەی ئاژەڵە، جاران لەسەردەمی نەزانیدا، سەریان دەبڕی بۆ بتە سەرکەشەکانیان، کەهۆی گومڕابوونیان بوو، عەتیرەیش جۆرە کوشتییەك بوو، لەدەی یەکەمی مانگی رەجەبا، ئاژەڵێکیان بەناوی عەتیرەوە سەردەبڕی، بەناوی پەرستشەوە) لەگێڕانەوەی موسلیمدا دەفەرموێ: لە گێڕانەوەی ئیبنو رافیعدا ئەمەی پترە: (فەرەع نۆبەرەی ئاژەڵەکانیان بوو، کە گەورە دەبوو سەریان دەبڕی‌و دەیانکرد بەخێر).

**روونکردنەوە:**

کورت‌و پوخت، بەکوردی پەتی عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: (ئەو خێرو چاکەو عیبادەت‌و رەفتارو عادەتانەی کە لەسەردەمی نەزانی پێشهاتنی ئاپینی پیرۆزی ئیسلامدا، بەهەر ناوێکەوە کراون، لەپاش هاتنی ئاپینی پیرۆزی ئیسلام ئەمە بڕیارەکەیانە:

١- ئەگەر ئیسلام ئیقراری کردنو پووچی نەکردنەوە، ئەوە لەسەر ئەو شێوەیە دەکرێن، کەلە یاسانامەی خوادا، پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیزو نازدار روونی کردوونەتەوە بۆمان، ئەمانەیش زۆر زۆرن. وەك: حەجو عەمرەو گرتنی رۆژوو قوربانیو سیلەی رەحمو ریش هێشتنەوەو رێزی بەیتو ژنهێنانو ناوهێنانی خوداو چاو رشتنو مارەییو خوازبێنیو ناشتنی مردوو، وەك: میوانداریو مافی هاوسێو هاورێو گەورەو بچووکیو خوێندنو راوکردنو کەشتوکاڵو راگرتنو بەخێوکردنی ئاژەڵو کەسابەتو بازرگانیو زۆر شتی تریش کەهەر زۆر زۆرن.

٢- بەلاّم ئەگەر ئیسلام رێگەی پێ نەدانو پووچی کردنەوە، ئەوە بەهیچ جۆرێ دروست نییە کەبکرێن، وەك: بەشەو بەرۆژوو بوونو فرە ژنی بەبێ ژمارەو مارەکردنی باوەژنو نەسیئیو حامو وەصیلەو بەحیرەو سائیبەو بتپەرستیو کچ زیندە بەچاڵکردنو بێ بەشکردنی ژن لە کەلەپوورو زۆر شتی تر کەلە قورئانو سوننەتدا باسکراونو قەدەغە کراون.

٣- ئەگەر لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا لەبەر هۆیەك نەهیان لی کرابوو، یا لە ئایینی پیرۆزی ئیسلاما، بەچاكو خراپ باسیان نەکرابوو، وە لەجۆری بتپەرستیو بێ فەرمانی خودا نەبوون ئەوە بەپێی بنەمای بنەرەت لەشتەکاندا رەوابوونە، رەوایەو کردنی بەنیازی پاك کارێ باشە، بەمەرجێ بەنیازی لاسکایی ئەوانەوە نەبێ ئەم جۆرەیش وەك: کردنی فەرەعو عەتیرە، کە بەنیازی پاك بکرێن، بۆ سوپاسی خوداو یارمەتی هەژاران، نەوەك بۆ لاسکایی بتپەرستان، چونکە زاناکان دەفەرموون: نەیی کردن لە فەرەعو عتیرە، کاتێ دەکرێ، کە لەبەر لاسایی بێبڕواکان بێ، بەلاّم ئەگەر بەو نیازە نەبێو بەنیازێکی پاك ئەنجام بدرێن کارێکی پەسەندە بۆ روونکردنەوەی زیاتر بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٨٢٥، زنجیرە: ٧٤، لاپەڕە: ١٠٢ (روونکردنەوە).

## ١٠٠٦) كەسێ شتێ سەربڕێ بۆ غەیری خودا. (٥٠٩٦ - ٥٠٩٨)
## بابٌ: فِی مَنْ ذَبَحَ لِغَیْرِ اللّه

١٢٦١- عَنْ أَبِی الطُّفَیْلِ عَامِرُ بْنُ وَاثِلَةَ قَالَ: کُنْتُ عِنْدَ عَلِیِّ بْنِ أَبِی طَالِبٍ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: مَا کَانَ النَّبِیُّ (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمَ) یُسِرُّ إِلَیْكَ؟ قَالَ: فَغَضِبَ، وَقَالَ: مَا کَانَ النَّبِیُّ (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمَ) یُسِرُّ إِلَیَّ شَیْئًا یَکْتُمُهُ النَّاسَ، غَیْرَ أَنَّهُ قَدْ حَدَّثَنِی بِکَلِمَاتٍ أَرْبَعٍ، قَالَ: فَقَالَ: مَا هُنَّ یَا أَمِیرَ الْمُؤْمِنِینَ؟ قَالَ: قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَیْرِ اللَّهِ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَی مُحْدِثًا، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ غَیَّرَ مَنَارَ الأَرْضِ». {الحدیث: ٥٠٩٦ = ٥٠٨٥ فم}:

ئەبو طوفەیلی کوڕی عامیری کوڕی واثیلە فەرمووی: من لەخزمەتی عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا بووم، پیاوێ هاتە خزمەتی، عەرزی کرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئایا پێغەمبەر شتێکی تایبەتی نهێنی بەتۆ فەرمووە؟ فەرمووی: عەلی نووڕە بوو، وە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی وای بەنهێنی بەمن نەوتووە کە لەو خەڵکەی تری شاردبێتەوە، بەڵام ئەم چوار وشەیەی پێم فەرموو، فەرمووی: پیاوەکە گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەو چوار وشەیە کامانەن؟ فەرمووی: عەلی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (نەفرەتی خودا لەوکەسە بێ کە نەفرەت لەباوکی خۆی، یا لەدایکی خۆی دەکا، یادەبێ بەهۆی ئەوە کە جنێو بە باوكو دایکی بدرێ، وە لەعنەتو نەفرینی خودا لەوکەسە بێ کەشتێ سەردەبڕێ بۆ کەسێ جگە لەخودا، وەك شت سەربڕێ بۆ بتو کەعبە، وە نەفرەتو نەفرینی خودا لەوکەسە بێ، کە پەنای ئەو کەسانە دەدا، کەشتی ناشایستە لەناو ئاییندا دادەهێنن، وە لەعنەتو نەفرەتی خودا لەوکەسە بێ، کە بەناڕەوا نیشانەو سنووری زەوی دەسکاری دەکاو بەساختەو ناڕەوا لەزەوی خەڵك دەخاتە سەر زەوی خۆی!). {تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤١٧، ج/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٥، ژمارە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠، ١١، ئەم ژمارانە وان لەنێوانی ژمارە: ١٥٥٨ و ١٥٥٩دا}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئەمە پوختەی فەرمایشتی پێشەوا نەوەوییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەبارەی سەربڕین بۆ غەیری خودا:

١- وەك ئەوە لەكاتی سەربڕیندا لەباتی بیسمیلا كردنو ناوی خودا هێنان بڵێ: بۆ بوت، یا بەناوی عیسا، یا بەناوی كەعبە، یا بۆ كەعبە، ئەوە ئەو سەربڕاوە حەرامەو خواردنی نادروستە.

٢- مەروزی كە لەهاوەڵانی شافیعییە دەفەرموێ: ئەو ئاژەڵانەی كە لەبەر پێی میرو شاو ئەمانەدا، بۆ خۆنزیك كردنەوە لەم كەسانە، سەردەبڕێن، زانایانی بوخارا دەفەرموون: حەرامن، چونكە بۆ غەیری خودا سەربڕاونو ناوی غەیری خودایان لێ هێنراوە. بەڵام ئیمامی ڕافیعی دەفەرموێ: (ئەم جۆرە سەربڕینە بۆ دەربڕینی خۆشیو خۆشەویستییە بەبۆنەی هاتنی ئەو كەسەوە، لەشێوەی سەربڕینی حەوتم وایە، كە بەبۆنەی لەدایكبوونی منالەوە سەر دەبڕێ، لەبەرئەوە ڕەوایەو حەڵاڵەو حەرام نییە!).

٣- منیش كە وەرگێڕم دەڵێم: (هەر ئاژەڵو گیانلەبەرێكی حەڵاڵ، كە موسوڵمان سەری دەبڕێو لەكاتی سەربڕیندا ناوی خودای لێ دەهێنێو بێجگە لەناوی خودا، ناوی شتی تری لێ ناهێنێ، ئەوە حەڵاڵە، گریمان لەكاتی سەربڕینەكەدا ئاوایش بڵێ هەر دروستەو حەڵاڵە: (بِسْمِ اللّهِ: بەناوی خودا، هەركەسێ لێی دەخوا مەولوودی پێغەمبەر بێ).

ئەمە لەشێوەی ئەوەیە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەفەرموودەی ژمارە (١٢٥٧)دا دەفەرموێ: {بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ}.

٤- بەڵام بۆئەوەی لەكێشەی ئیهلال بۆ غەیری خودا بەتەواوی ڕزگارمان بێو شتەكەمان بەدڵنیایی ڕێكی شەرعو یاسا نامەی خودا بێ، واباشو پەسەندە،

أ- لەكاتی سەربڕینی ئاژەڵو گیانلەبەری نەزردا، یا لەكاتی سەربڕینی ئاژەڵی خێرو مەولوودیو قوربانی دا، لەپێشا ئاژەڵەكە دیاری بكرێ، جا خاوەن نەزرەكە،

یان هۆی نەزرەکەی دیاری کردووە، یاخود دیاری دەکا، وەك ئەوە دەڵێ: ئەگەر خودا شیفای نەخۆشەکەی دام، یا کوڕێکی پێمدا، مەڕێ، بزنێ، خێری مەولوودی پێغەمبەر بێ. ئەوە لەکاتی سەربڕینەکەدا دەگوترێ: (بِسْم اللّه، بەناوی خودا)، یاخود بڵێ: (بِسْمِ اللّه واللّهُ أكْبَرُ). یاخود بڵێ: (بِسْمِ اللّه، هذا منك وَإليك). جا یا لەپێش دەست کردن بەسەربڕین، خۆی، یا وەکیلەکەی بڵێ: ئەمە نەزرەکەمە، یا خێرەکەیە، یا مەولوودییەکەیە. جا لەپاش سەربڕین: خێرو پاداشی باشی ئەو سەربڕاوە، دروستە ببەخشرێ بەهەر کەسێ دەیەوێ، لە موغنی موحتاج و شەرحی نەوەوی و فەتحولمولهیمدا دەفەرموێ: (دروستە مرۆڤ، قوربانی، یا حەوتم، یا هەر خێرێ تر بکا بۆ خۆی، وە لەپاش دا کەسانی تر بکا بەهاوبەش و شەریکی خۆی لەخێرو پاداشەکەیدا، بەپێی فەرموودەکەی ئیمامی موسلیم ژمارە: (١٢٥٧ = ٥٠٦٤ شیحا) کە لەپێشەوە رابوورد. {بڕوانە: تەجرید/٥، لاپەڕە: ١١٢، بڕگەی ژمارە: ٣١}.

ب- کورت و پوخت: ١- ئاژەڵەکە دیاری بکرێ. ٢- نیێتی لێ بهێنرێ کە ئەمە ئاژەڵی قوربانی، یا نەزر، یاخێر، یا حەوتم، یا هەدی، یا مەولوودییەکەیە. ٣- لەکاتی سەربڕینەکەدا بەس ناوی خودا ببرێ، لەسەر یەکێ لەو شێوەی کە نووسران.

٥- کە ئەو شتانەی کەدەکرێن بەخێر، یا بەقوربانی، یا بازێ کەس دەڵێ: (ئاژەڵێ خێری شێخ عەبدولقادری گەیلانی بێ، یا فیسارە شێخ بێ). با ئەم جۆرە نەزرو خێرانە، گوتەو سیغەکەیان بگۆڕدرێ. لەکاتی سەربڕیندا ناوی ئەم جۆرە کەسانە نەبرێ، لەپاش سەربڕین، مرۆڤ خۆی ئازادو سەربەستە لەخێرو پاداشی سەربڕاوەکەیدا کێ دەکا بەهاوبەشی خۆی، یاخێرو پاداشی سەربڕاوەکەی بەکێ دەبەخشێ، ئارەزووی خۆیەتی و دروستەو کارێکی شەرعییە، وە ئەم جۆرەیان زۆر باشتر و بێ گەردە!).

٦- جەماوەری زاناکان دەفەرموون: (موسوڵمان بۆی هەیە پاداشی کردەوەی باشی خۆی ببەخشێ بەهەرکەسێ دەیەوێ، یا لەپاداشی کردەوەی باشی خۆیدا

کەسانی تـر بکـا بەهاوبـەش، وەك لـەپاش خەتمـەی قورئـان، یـا لـەپاش ڕۆژووی سوننەت، یا لەپاش حەجی سوننەت بڵێ: پاداشی ئـەم خەتمەیـەم بەخشی بـەگیانی باوکم، یا پاداشی ئەم قوربانییەم بەخشی بە پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عەلی، یا نموونەی ئەمانە، تەنیا پاداشی فەرز، ئایا نوێژبێ، یا زەکات بێ، یـا حـەج بـێ، یـا هەرشتێ تری فەرز بێ نابەخشرێ).

٧- لەکاتی قەزاو گێڕانەوەی نوێژو ڕۆژووو زەکاتو حەجو عـەمرەو نـەزردا، بـۆ کەسێ واباشە لەسـەرەتاوە، نیێتـی ئـەوی لێ بێنـێ، وەك ئـەوە بڵـێ: نیێتمـە ئیحرامـی حەج دائەبـەسمتم لـەباتی حـەجی فـەرز لەسـەر بـاوکم، بـە نموونـە. یـا نیێتمـە دوو ڕکات نوێژی فەرزی بەیانی دەگێڕمەوە بۆ دایکم، دەیکەم بۆ خودا ئەڵڵاهوئەکبەر.

تەلەففوظ (کرك کردن)بە نیێت، لەلای مەزهەبەکان، کارێ پەسەندە، لە ڕۆژووو لەحەج دا، دەقی فەرموودەی لەسەرە، حەزرەت دەفـەرموێ: (مَـنْ لَـمْ يُجْمِـع الصِّـيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيامَ لَهُ). {تاج/٢/٩٠، زنجـیرە: ٣٢، ژمـارە: ١٣٢٢ + زنجـیرە: ٤٩، ژمـارە: ١٣٨٦، ١٣٨٧، ١٣٨٨} هەروا بڕوانە: {تـاج/٣، زنجـیرە: ٧٩، ژمـارە: ١٤٨٦، ١٤٨٥، ١٤٨٨ هـەتا ژمارە: ١٤٩٢}.



# ٣٧- نامەی خواردنەوەکان

## كِتابُ الأشْرِبَة

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٩١، زنجیرە: ٣٣٠ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ١٣٩، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ١٨٤٠ هەتا زنجیرە: ٧٨، لاپەڕە: ١٥٣، ژمارە: ١٨٥٦ + تاجول ئوصول/٣، لاپەڕە: ١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٦ هەتا لاپەڕە: ٢٤٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٧٦١} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١١١ هەتا زنجیرە: ١١٦ لەژمارە: ٧٥٧ هەتا ژمارە: ٧٧٨، زنجیرە: ١١٦}.

### ١٠٠٧) باسی نادروستی مەی و بادە (ئارەق). (٥١٧٩ - ٥١٨٩)

### باب: تَحْرِيمُ الخَمْر

١٢٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمـا): أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ». (الحديث ٥١٨٧ = ٥١٧٨ فم).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقە، وەهەموو ئارەقێکیش نادروستو حەرامە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٧٤٨}.

١٢٦٣- عَنْ عَلِيِّ بْنَ أَبِى طالب كرَّم الله وجهه قَالَ: كَانَتْ لِى شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِى مِنَ الْمَغْنَمِ يوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَانِى شَارِفًا مِنَ الْخُمُسِ يوْمَئِذٍ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَنِىَ بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاعَدْتُ رَجُلاً صَوَّاغًا مِنْ بَنِى قَيْنُقَاعَ يَرْتَحِلُ مَعِىَ فَنَأْتِى بِإِذْخِرٍ أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ مِنَ الصَّوَّاغِينَ، فَأَسْتَعِينَ بِهِ فِى وَلِيمَةِ عُرْسِى، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَىَّ مَتَاعًا مِنَ الأَقْتَابِ وَالْغَرَائِرِ وَالْحِبَالِ وَشَارِفَاىَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، وَرَجَعْتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ، فَإِذَا شَارِفَاىَ قَدِ (اجْتُبَّتْ) أَسْنِمَتُهُمَا وَبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَا، وَأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَىَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ مِنْهُمَا، قُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ قَالُوا: فَعَلَهُ حَمْزَةُ بْنُ

عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الأَنْصَارِ، غَنَّتْهُ قَيْنَةٌ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالَتْ فِي غِنَائِهَا: أَلاَ يَا حَمْزَ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ، فَقَامَ حَمْزَةُ بِالسَّيْفِ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا، وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا فَأَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، قَالَ: فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي وَجْهِيَ الَّذِي لَقِيتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا لَكَ»؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا وَهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِرِدَائِهِ فَارْتَدَاهُ، ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي، وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، حَتَّى جَاءَ الْبَابَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُ، فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ فَإِذَا حَمْزَةُ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ حَمْزَةُ: وَهَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لأَبِي؟ فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ ثَمِلٌ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى، وَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ. {الحديث: ٥١٠١ = ٥٠٩٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤٣ = ٢٣٧٥، ٢٠٨٩، ٣٠٩١، ٤٠٠٣، ٥٧٩٣. أبو داود. خراج، إمارة: ٢٩٨٦. تحفة الأشراف: ١٠٠٦٩}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە تالآنەکەی غەزای ڕۆژی بەدر، کە لەم نەبەردەدا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، وشترە مێنگەیەکی سەرەم بەرکەوت. وە لەپێنج یەکی تالآنی ئەو ڕۆژەش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشترێکی تری وای داپێم، بوون بەدووان، کاتێ کەویستم فاطیمەی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بگوێزمەوە، کە مارەبڕم بوو، ڕۆژێ لەبەر دەرگای پیاوێکی ئەنصاریدا، دوو وشترەکەمم ییخ دا، بەنیازی ئەوەی کەبچم باریان بکەم لەسڕناتك (إذخر) وە بارە سوڕناتکیان پێ بهێنم و لەبازاڕ بیفرۆشم و دەسگیرۆیی خۆمی پێ بکەم، بۆ نانی شایی گواستنەوەی فاطیمە، دەسبارێکی شارەزای زەڕەنگەریشم پەیدا کرد، لە جوولەکەکانی بەنی قەینوقاع بوو، کە لەگەڵم بێت بۆ ئەو دەشتە، بۆ هێنانی

سـوڕناتك، هـەتا بیفرۆشـین بـە زەڕەنگـەرەكان، بـۆ ئـیش‌و كـاری كـوورەی زەڕەنگەرییەكەیان، ئەوا من سەرگەرمی ئەوەم كە تفاق بۆ وشترەكانم كۆبكەمەوە، لە كۆپان‌و خەرار‌و رەشكەو گوریس، كاتێ تفاقەكەم كۆكردەوەو گەڕامەوە بۆلای وشترەكانم، دەبینم وا هەردوو وشترەكانم دووگیان بڕاوەو كەلەكەیان هەڵدڕاوەو جەرگیان دەرهێنراوەو براوە! كە ئەم دیمەنە سامناكەم بینی چاوم پەڕییە تەوقی سەرم‌و گوتم: ئەمە كێ وایكردووە؟ گوتیان: حەمزەی كوڕی عەبدولموتتەلیب وایكردووە، وا لەم ماڵەدا، لەگەڵ كۆمەڵێ مەینۆشدا لە یاریدەدەران (ئەنصار) خەریكن بادە دەنۆشن، كەنیزەكێكی گۆرانی بێژ گۆرانی بۆ خۆی‌و هاوڕێكانی دەڵێ، بەدەم چڕینەوە گوتوویە (وافیر):

أَلاَ يَـــا حَمْـــزُ لِلشُّـــرُفِ النِّـــوَاءِ
وَهُـــــنَّ مُعَقَّـــــلاَتٌ بِالفَنَـــــاءِ
ضَـــعِ السِّـــكِّينَ فِـــى اللَّبَّـــاتِ مِنْهَـــا
وَضَـــرِّجْهُنَّ حَمْـــزَةُ بِالـــدِّمَاءِ
وَعَجِّـــلْ مِـــنْ أَطَايِبِهَـــا لِشِـــرْبٍ
قَـــدِيراً مِـــنْ طَبِـــيخٍ أَوْشَـــوَاءِ

واتە:

ئـــەی حـــەمزە! ئـــادەی ئـــەو وشـــترانە
كـــەوان لـــە حەوشـــە، كـــۆت لەپایانـــە
بیانگەوزێنـــــە لـــــەخوێنی خۆیـــــان
مەنجـــەڵ هەڵێنجـــە لـــە گۆشـــت و بۆیـــان
بـــەزمێ ســـازكە، بـــۆ ئـــەم مەســـتانە
بـــە مەرگـــەو كـــەباب، بـــەزمێ شـــاهانە

ئـیتر حـەمزەیش بەشمشـێرەوە رادەپـەڕێ‌و پـەلاماریان دەداو بەشمشـێرەكەی دووگیان دەبڕێ‌و كەلەكەیان كون دەكاو لە جەرگەكەیان دەبڕێ‌و دەیبات. عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: كـە ئـەم دیمەنـە سـامناكەم بینـی راچـەنیم‌و چـووم بـۆلای

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەتا سکاڵا لەدەستی بکەم لەلای پێغەمبەر، چونکە حەمزە مامی حەقی منو پێغەمبەر بوو، کە چوومە خزمەتی، زەیدی کوڕی حاریثەی لەخزمەتا بوو، فەرمووی: پێغەمبەر بە رەنگی رووما زانی کەتووشی چورتومێ بووم، لەبەرئەوە، یەکسەر فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆ وا پەرێشانی؟) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا، قەد ناهەقی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، حەمزە دەستدرێژی کردووە لەهەردوو وشترەکەم، سەرگوزشتەکەم لەنووکەوە گێڕایەوە بۆیو عەرزیشم کرد: ئێستایش وا لەوماڵەدا، کۆمەڵێ مەینۆشی وا لەگەڵدا. ئەمەیش لەپێش ئەوەدا بوو کەمەیو بادە نادروست بێ. جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای عاباکەیی کردو کردیە بەریو بەپێ کەوتەڕێ، منو زەیدی کوڕی حاریثەیش شوێنی کەوتین، هەتا گەیشتینە بەردەرگای ئەو ماڵەی کە حەمزەو برادەرەکانی لەوێ بوون، داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کردو مۆڵەتی پێدرا، پێغەمبەر چووە ژوورەوە، ئەوان مەست بوون، خەریکی خواردنەوە بوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەحەمزە تووڕە بوو، سەرکۆنەیکرد لەسەر ئەم کاروبارە ناشایستەیە کە کردوویەتی، تەماشامان کرد حەمزە مەستە، چاوەکانی بەهۆی مەستییەوە سوور بووە، جا حەمزە لەنووکی پێی پێغەمبەرەوە دەستی کرد بە تەماشاکردنی پێغەمبەر، هەتا تەوقی سەری، ئەوجا بەسەرخۆشی گوتی: ئێوە خۆتان بەچی دەزانن، ئێوە کە بەرەبابی عەبدوڵڵای برامو بەرەبابی ئەبو طالیبی برامن، وەك خوڵامو کۆیلەی عەبدولموتتەلیبی باوکم وابوون!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) کەڕوانی وا بەد مەستە وازی لێ هێناو پاشاو پاش گەڕایە دواوە، وەلای ئەوانی چۆڵکرد، نەبادا حەمزە بەهۆی مەستییەوە کارێ ناشیرینتر بکا، ئیتر ئەو دەرچوو، ئێمەیش لەخزمەتیدا دەرچووین، لەوەدوا پێغەمبەر دوو وشترەکەی بەحەمزە بژارد.

## ١٠٠٨) هەموو سەرخۆشکەرێ نادروستە. (٥١٧٩ - ٥١٨٩)

## بابٌ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ

١٢٦٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً قَدِمَ مِنْ جَيْشَانَ (وَجَيْشَانُ مِنَ الْيَمَنِ) فَسَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ شَرَابٍ يَشْرَبُونَهُ بِأَرْضِهِمْ مِنَ الذُّرَةِ يُقَالُ لَهُ الْمِزْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَوَمُسْكِرٌ هُوَ»؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، إِنَّ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَهْدًا لِمَنْ يَشْرَبُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: «عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ، أَوْ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ». {الحديث: ٥١٨٥ = ٥١٧٦ فم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە جەیشانەوە هات، کە جەیشان لە یەمەنە، لە پێغەمبەری پرسی: لە وڵاتی ئێمە شەرابێ هەیە پێی دەڵێن: (میزر) لە گەنمەشامی دروست دەکرێ، خەڵك دەیخۆنەوە؟ فەرمووی: ئایا ئادەمیزاد سەرخۆش دەکا؟) گوتی: بەڵێ دەیکا، فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە) خودای گەورەو مەزن پەیمانی داوە بەخۆی، کە هەرکەسێ شتی سەرخۆشکەر بخواتەوە، لە چڵپاوی زووخاوی دەرخوارد بدات). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چڵپاوی زووخاو چییە؟ فەرمووی: (چۆڕاوگەی ئارەقو چڵکی دۆزەخییەکانە) یا فەرمووی: (کێمو زووخاوی لەشی داهەزاوی دۆزەخییەکانە). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣٨، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٧٥٠، ٢٧٥١، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٠٠٩) هەر خواردنەوەیێ سەرخۆشکەر بێ نادروستە. (٥١٧٩ - ٥١٨٩)

## بابٌ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ

١٢٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «كُلُّ شَيْءٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ». {الحديث: ٥١٨٠ = ٥١٧١ فم. بخاري. وضوء: ٢٤٢، ٥٥٨٥، ٥٥٨٦. ترمذي. أشربة: ١٨٦٣. أبو داود. أشربة: ٣٦٨٢. نسائي. أشربة: ٥٦٠٧. تحفة الأشراف: ١٧٧٦٤}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا له پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتع حەرامە یانا؟ بەتع شەرابی خەڵکی یەمەن بوو، لەهەنگوین دروست دەکرا. فەرمووی: (هەر خواردنەوەیێ سەرخۆشی ببەخشێو مرۆڤ مەست بکا نادروستەو حەرامە، ئیتر بەهەر ناوێ بێ ئەوە گرنگ نییە، بایستی نادروستی سەرخۆشکردنە، کە سەرخۆش کردن هەبوو، نادروستیو قەدەغە بوونیش هەیە!). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣٤، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٢ ج/٤}.

## ١٠١٠) ئەوەی لەجیهانا ئارەق بخواتەوە، ئەگەر تەوبەی لێ نەکا، لەو جیهانا نایخواتەوە. (٥١٩٠ - ٥١٩٣)

## باب: مَنْ شَرِبَ الخمْرَ فِى الدُّنيا لَمْ يَشْرَبْهَا فى الآخِرَةِ إلاَّ أنْ يَتُوبَ

١٢٦٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِى الدُّنْيَا لَمْ يَشْرَبْهَا فِى الآخِرَةِ، إِلاَّ أَنْ يَتُوبَ». {الحديث: ٥١٩٢ = ٥١٨٣ فم. تەجرید/٥، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ١٨٤٠ = ٥٥٧٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقەو، هەموو سەرخۆشکەرێ نادروستە، وە هەرکەسێ لەجیهانا ئارەق بخواتەوەو فێری ببێو تا دەمرێ وازی لێ نەهێنێو تەوبەی لێ نەکا، ئەوە لەبەهەشتا چەشکەی ناکات). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٧٤٨ — ش/د/ت/ن}.

## ١٠١١) دروستکردنی مەی لەخورماو لەترێ. (٥١١٣ - ٥١١٥)

## بابٌ: الخمر مِنَ النخْلِ وَالعنَب

١٢٦٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ سمعت رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول: «الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ النَّخْلَةِ وَالْعِنَبَةِ». {الحديث: ٥١١٤ = ٥١٠٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (ئارەق لەم دوو درەختە دروست دەکرێ: لەخورماو لەترێ).

## ١٠١٢) ئارەقی بەرسیلەی خورماو لەخورمای گەییو. (٥٠٩٩ - ٥١١٠)
## باب: الخمر من البُسر والتمر

١٢٦٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ وَأَبَا دُجَانَةَ، وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) فِي رَهْطٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا دَاخِلٌ، فَقَالَ: حَدَثَ خَبَرٌ، نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، فَكَفَأْنَاهَا يَوْمَئِذٍ، وَإِنَّهَا لَخَلِيطُ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ. قَالَ قَتَادَةُ: وَقَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: لَقَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ وَكَانَتْ عَامَّةُ خُمُورِهِمْ يَوْمَئِذٍ خَلِيطَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ.
{الحديث: ٥١٠٦ = ٥٠٩٦ فم} :

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەریك بووم مەیو بادەم دەگێڕا بەسەر کۆمەڵێ لە هاوەڵانا، کە ئەبو طەلحەی زڕبابمو ئەبو دوجانەو موعاذی کوڕی جەبەلو تاقمەیێ لە ئەنصارییان تیادابوو، لەوکاتەدا کەسێ هاتە ژوورەوە گوتی: هەواڵێ گرنگ ڕوویداوە، قورئان هاتۆتە خوارەوە، مەیو بادەی نادروست کردووەو ئارەق حەرام بووە. ئیتر ئێمە یەکسەر دەفری ئارەقەکانمان قڵب کردەوەو هەرچی عەرەقێکمان لەلابوو ڕژاندمان، کە تێکەڵەیێ بوو، لە ئارەقی بەرسیلەی خورماو ئارەقی خورمای گەییو. قەتادە دەفەرموێ: ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: ئەوکاتەی کە عەرەق حەرام بوو، زۆربەی ئارەقی ئەو خەڵکە تێکەڵەی ئارەقی بەرسیلەی خورماو خورمای گەییو بوو).

## ١٠١٣) دروستکردنی مەی لەپێنج شت
## بابٌ: الخَمْرُ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاء

١٢٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَلا وَإِنَّ الْخَمْرَ نَزَلَ تَحْرِيمُهَا يَوْمَ نَزَلَ وَهِيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: مِنَ الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وَثَلاثَةُ أَشْيَاءَ وَدِدْتُ أَيُّهَا النَّاسُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عَهِدَ إِلَيْنَا فِيهَا: الْجَدُّ، وَالْكَلالَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا.
{الحديث: ٧٤٧٥ =تجريد/٤، رقم: ١٦٥٧م = ٤٦١٧، ٢٤٦٤، ٤٦٢٠، ٥٥٨٠، ٥٥٨٢، ٥٥٨٣، ٥٥٨٤، ٥٦٠٠، ٥٦٢٢، ٧٢٥٣} :

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) لەمەدینە، لەسەر دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی دا، سوپاسی خودای کردو وەسپێکی جوانی خودای کرد، لەپاشا فەرمووی: لەپاش سوپاس‌و ستایشی خودا، بزانن کەمەی لە قورئانا حەرام کراوە، ئەو سەردەمەی کە نادروست بوونی مەی دابەزی لە قورئانا، مەی لەم پێنج شتە دروست دەکرا: لە گەنم‌و لەجۆو لە خورماو لەمێوژو لە هەنگوین، وە خەمریش ئەوەیە کە هۆش داپۆشێ. واتە: هەرشتێ لەم پێنج شتە دروست بکرێ، یا لەهەر شتێکی تر دروست بکرێ، بەمەرجێ هۆش لابەرێ دادەنرێ بەمەی‌و نادروستە. عومەر فەرمووشی: ئەی خەڵکینە! سێ شتی تریش هەن، حەزم دەکرد، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرلەوە مەرگ ببێ بەمیوانی، ئەم سێ شتەی بۆمان روون بکردایەتەوە: یەکەم بەشە کەلەپووری باپیرە، دووەم: باسی کەلالە، کەجۆرە مردوویەکە، سێیەم: چەند بابەتێ هەیە لە سوود، وەك (رِبَا الفَضْلِ) کە بڕیارەکەی چییەو چی نییە. {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٣٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٠١٤) رێگری لەخۆشاوی تێکەڵەی مێوژو خورما. (٥١١٦ - ٥١٣٥)
## باب: النهيُ أنْ يُنبَذَ الزَّبِيبُ والتَّمْرُ

١٢٧٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الرُّطَبُ وَالْبُسْرُ جَمِيعًا. {الحديث: ٥١١٧ = ٥١٠٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگری دەکرد لەوە کە خورماو مێوژ تێکەڵ بکرێن‌و ئەوسا بکرێن بەخۆشاو، هەروا رێگری دەکرد لەوەیش کە فەریکە خورماو بەرسیلەی خورما تێکەڵ بکرێن‌و بکرێن بە خۆشاو. {بڕوانە: تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٥ = ٥٦٠٢ فتح الباری}.

١٢٧١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَنْ شَرِبَ النَّبِيذَ مِنْكُمْ، فَلْيَشْرَبْهُ زَبِيبًا فَرْدًا، أَوْ تَمْرًا فَرْدًا، أَوْ بُسْرًا فَرْدًا». {الحديث: ٥١٢٣ = ٥١١٣ فم}:

ئەبو سەعید (رەزای خودای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **دەفەرمویٚ: (هەرکەسیٚ لەئیٚوە حەزدەکا کە خۆشاو (نەبیذ) بخواتەوە، با میٚوژ بەتەنیا بکا بەخۆشاو (نەبیذ)و بیخواتەوە، یا خورما بەتەنیا بکا بەخۆشاوو بیخواتەوە، یا بەرسیلەی خورما بەتەنیا بکا بەخۆشاوو بیخواتەوە).**

## ١٠١٥) ریٚگری لەخۆشاوی کوولەکەو بەستووی زفتدراو. (٥١٣٦ - ٥١٧٨)

## بَابٌ: النهيُ عَنِ الإنْتِبَاذ في الدُّبَّاءِ وَالمُزَفَّت

١٢٧٢- عَنْ زَاذَانُ قَالَ: قُلْتُ لابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): حَدِّثْنِي بِمَا نَهَى عَنْهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الأَشْرِبَةِ بِلُغَتِكَ، وَفَسِّرْهُ لِي بِلُغَتِنَا، فَإِنَّ لَكُمْ لُغَةً، سِوَى لُغَتِنَا، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْحَنْتَمِ، وَهِيَ الْجَرَّةُ، وَعَنِ الدُّبَّاءِ، وَهِيَ الْقَرْعَةُ، وَعَنِ الْمُزَفَّتِ، وَهُوَ الْمُقَيَّرُ، وَعَنِ النَّقِيرِ، وَهِيَ النَّخْلَةُ تُنْسَحُ نَسْحًا، وَتُنْقَرُ نَقْرًا، وَأَمَرَ أَنْ يُنْتَبَذَ فِي الأَسْقِيَةِ. {الحديث: ٥١٦٨ = ٥١٥٨ فم}:

**زازان** (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: عەرزی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم کرد** (رەزای خودایان لیٚ بیٚ)**: ئەوشتانەی کە پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **نەهی کردووە لەخواردنەوەیان، بەزمانی خۆتان، کە زاراوەی قورەیشە، پیٚمان بڵیٚو بەزمانو زاراوی خۆجیٚیی خۆشمان بۆمان واتاو راڤەبکە، چونکە زمانی ئیٚوە جیاوازی هەیە لەزمانی ئیٚمە. ئیبنو عومەر فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **نەهی کردووە لە خواردنەوەی خۆشاوی ناو ئەم دەفرانە، چونکە زۆر زوو دەترشیٚنو توند دەبنو دەبن بە ئارەق: بەستوو، واتە: کووپەڵە، کودیی: واتە: کوولەکە، زفت دراو، واتە: شتیٚ بەزفت رووکەش کرابیٚ، کۆتکە: واتە: بنکی دارخورما کە تویٚکڵەکەی پاك دەکەنو ناوەکەی هەڵدەکۆڵن، وە پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **فەرمانی کرد کە**

خۆشاو لەکوندەو جەوەندەو شتی وادا بکەن، نەك لەو دەفرانەدا، چونکە ئەوانە شتیان زۆر زوو تێدا دەترشێ، دوور نییە کە سرکەو خۆشاو دۆشاوەکە ببن بەمەیو ئارەقو خاوەنەکەیان بەوە نەزانێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٣٩ ج/٤} + {بڕوانە: ژمارە: ١ لەپێشەوە رابورد} + {تاج/٣، ژمارە: ٢٧٣٨} + {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٣٩ ج/٤}.

## ١٠١٦) خۆشاو و شەربەت دروستکردن لە کاسەی بەردین دا

## بابٌ: إباحةُ الإنْتِباذِ في تَوْرِ الحِجارَةِ

١٢٧٣- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ يُنْتَبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سِقَاءٍ، فَإِذَا لَمْ يَجِدُوا سِقَاءً نُبِذَ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ، فَقَالَ: بَعْضُ الْقَوْمِ وَأَنَا أَسْمَعُ لأَبِي الزُّبَيْرِ، مِنْ بِرَامٍ؟ قَالَ: مِنْ بِرَامٍ. {الحديث: ٥١٧٤ = ٥١٦٥ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لەخێگەدا شەربەتو خۆشاویان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دروست دەکرد، جا ئەگەر دەفری چەرمینیان دەست نەکەوتایە، لە کاسەیەکی بەردیندا دروستیان دەکرد بۆی). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦١}.

فەرمووده گێڕەوە دەفەرموێ: من گوێم لێ بوو هەندێ کەس لە ئامادەبوان بە ئەبو زوبەیری فەرموو: مەبەست لەکاسەی بەردین قازانی بەردە؟ فەرمووی: بەڵێ مەبەست قازانی بەردە).

## ١٠١٧) مۆڵەتی دروستکردنی خۆشاوو خواردنەوە دروست کردن لەگشت حاجەتو دەفرێکاو نەییکردن لە خواردنەوەی گشت جۆرە سەرخۆشکەرێ

## باب: الرُّخْصَةُ فِي الإنْتِباذِ فِي الظُّرُوفِ كُلِّهَا والنَّهْيُ عَنْ شُرْبِ كُلِّ مُسْكِرٍ

١٢٧٤- عَنِ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ، وَإِنَّ الظُّرُوفَ - أَوْ ظَرْفًا - لاَ يُحِلُّ شَيْئًا وَلاَ يُحَرِّمُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ». {الحديث: ٥١٧٦ = ٥١٦٧ فم}:

بورەیدە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من بەئێوەم ڕاگەیاندبوو کە لەهەندێ حاجەتدا شت مەخۆنەوە، بەلاّم حاجەت خۆی لەخۆیا شت حەلاڵو حەرام ناکا، ئەوەندە هەیە کەهەموو سەرخۆشکەرێ نادروستەو حەرامە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤١}.

## ١٠١٨) ڕێگەدان بەدروستکردنی خۆشاوو ترشیاتو خواردنەوە دروست کردن لە کووپەڵەی زفت نەدراودا

## باب: الرخصة في الجر غير المزفت

١٢٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا نَهى رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ النَّبِيذِ فِى الأَوْعِيَةِ، قَالُوا: لَيْسَ كُلُّ النَّاسِ يَجِدُ، فَأَرْخَصَ لَهُمْ فِى الْجَرِّ غَيْرِ الْمُزَفَّتِ. {الحديث: ٥١٧٨ = ٥١٦٩ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٤٣، رقم: ١٨٤٤ = ٥٥٩٣}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لەو سەردەمەدا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی دەکرد لە دروستکردنی خۆشاو (نەبیز) لەهەندێ حاجەتی تایبەتدا، وەك كووپەی دارینو کوولەکەی ئاوو شتی تری وا، چونکە خۆشاوی ئەم جۆرە دەفرە زوو دەبێ بەمەی، لەم سەردەمەدا عەرزی حەزرەتیان کرد: قوربان! خۆ هەموو کەسێ جەوەندەو کوندەی دەست ناکەوێ، هەتا خۆشاو بەس لەوانەدا بکا، وەك تۆ دەفەرمووی، ئەی چارچییە؟ جا بەهۆی ئەم پرسیارە جوانەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی خۆشاو کردنی لە کۆپەڵەدا دا کەبەزفت رووکەش نەکرابێ).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەستی سەرەکی لە نەهیەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە بووە، کە هەتا دەتوانین لەمەیو بادەو ئارەقو هەرچی سەر دەکێشێ بۆ ئەمانە دووربین، ئیتر دەفرو قاپ لەزاتی خۆیانا حەلاڵو رۆڵ نابینن لە حەرامکردندا.

## ١٠١٩) بەسەرچوونی ماوەی خۆشاو. (ئێکسپایەر). (٥١٩٤ - ٥٢٠٥)
## بابٌ: بيانُ مُدَّةِ الإنتباذ

١٢٧٦- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُنْتَبَذُ لَهُ أَوَّلَ اللَّيْلِ، فَيَشْرَبُهُ إِذَا أَصْبَحَ يَوْمَهُ ذَلِكَ وَاللَّيْلَةَ الَّتي تَجِيءُ وَالْغَدَ وَاللَّيْلَةَ الأُخْرَى وَالْغَدَ إِلَى الْعَصْرِ فَإِنْ بَقِيَ شَيْءٌ سَقَاهُ الْخَادِمَ، أَوْ أَمَرَ بِهِ فَصُبَّ. {الحديث: ٥١٩٤ = ٥١٨٥ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران مێوژیان دەخووساند، بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیانکرد بە خۆشاو بۆی، هەتا ماوەی سێ ڕۆژ هەرلێی دەخواردەوە، ئیتر فەرمانی دەکرد ئەوەی مابوو یا دەیانخواردەوە یان دەیانڕژاند). {ئەمە گێڕانەوەی تاجە، بەرگی: ٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٧٦٠}.

لێرەدا ئاوایە: جاران لەسەرەتای شەوەوە خۆشاویان بۆ پێغەمبەر دەخووساند، بۆ بەیانی لێی دەخواردەوە، ئەو ڕۆژەیش هەتا ئێواری لێی دەخواردەوە، شەوی دواییش هەر لێی دەخواردەوە، بۆ سبەینێش هەر لێی دەخواردەوە، بۆ دوو سبەی شەویش هەر لێی دەخواردەوە بۆ سێ سبەییش هەتا عەصر لێی دەخواردەوە، ئیتر ئەگەر شتێ بمایەتەوە لەوەدوا، یا دەرخواردی نۆکەرو کارەکەری دەدا، یا فەرمانی دەکرد دەیانڕژاند). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٠، چ/٤}.

١٢٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كُنَّا نَنْبِذُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي سِقَاءٍ يُوكَى أَعْلاَهُ وَلَهُ عَزْلاَءُ، نَنْبِذُهُ غُدْوَةً، فَيَشْرَبُهُ عِشَاءً، وَنَنْبِذُهُ عِشَاءً، فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً. {الحديث: ٥٢٠٠ = ٥١٩١ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران شەربەتو خۆشاومان لەترێو خورماو مێوەی تر دروست دەکرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە جەوەندەیەکا، دەمان خووساند، جەوەندەکەمان سەرەو ژوور هەڵ دەواسیو دەمەکەیمان بە دەمبێن دەبەست، جا لە هەنگڵەکەی خوارەوە، لێمان دادەکرد، جاری وادەبوو سەر لەبەیانی دەمان خووساند شێوان دەیخواردەوە، وە ڕۆژی وادەبوو، شێوان دەمان خووساند سەر لەبەیانی دەیخواردەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٧٥٩}.

## ١٠٢٠) مەی بكرێ بەسركە. (٥١١١)

## باب: الخَمْرُ تُتَّخَذُ خَمْراً

١٢٧٨- عَنْ أَنسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) سُئِلَ عَـنِ الْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاًّ؟ فَقَالَ: «لاَ». {الحديث: ٥١١١ = ٥١٠١ فم}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پرسیاركرا لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر مەی بكرێ بەسركە حەڵاڵ دەبێ؟ فەرمووی: نەء). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٧٥٦}.

## ١٠٢١) تیماركردن بەمەی. (٥١١٣ - ٥١١٥)

## بَابٌ: التَّدَاوِي بِالخَمْرِ

١٢٧٩- عَنْ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ: أَنَّ طَارِقَ بْنَ سُوَيْدٍ الْجُعْفِـيَّ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ): سَـأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْخَمْرِ؟ فَنَهَا أَوْ كَرِهَ أَنْ يَصْنَعَهَا، فَقَـالَ: إِنَّمَـا أَصْـنَعُهَا لِلدَّوَاءِ، فَقَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ، وَلَكِنَّهُ دَاءٌ». {الحديث: ٥١١٢ = ٥١٠٢ فم}:

وائیلی ئەلحەضرەمی دەفەرموێ: طاریقی كوڕی سوومیدی ئەلجەعەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی حەزرەتی كرد: مـن ئارەق دروست دەكـەم، ئـەویش ڕێگـەی نـەدام (یـا فەرمووی): حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی نـاخۆش بـوو كەشـتی وا بكـەم، منـیش عەرزیم كرد: خۆ من بۆ دەرمانی دروست دەكەم، نەوەك بۆ خواردنەوە؟ فەرمووی: (ئارەق دەرمان نییە بەڵكوو دەردە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٣}.

**ڕوونكردنەوە:**

طاریقی كوڕی سوومیدی ئەلجوعەفی، هاوەڵی پێغەمبەرە ئەم فەرموودەیەی لـە موسلیمو ئـەبو داودو تەرمـەذیو ئیبنـو ماجـەو دارەمیـدا هەیـە. ڕاجیـایی هەیـە لەناوەكەیدا كە ئایا ناوی طاریقی كوڕی سوومیدە، یاناوی (سوومیدی كوڕی طاریقە) بەڵام قسەی ڕاستر ئەوەیە كە ناوی طاریقی كوڕی سوومیدە.

## ١٠٢٢) سەرداپۆشینی قاپو حاجەت. (٥١١٣ - ٥١١٥)
## بابٌ: فِی تَخمیر الإِنَاءِ

١٢٨٠- عَنْ أَبِی حُمَیْدٍ السَّاعِدِیِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَیْتُ النَّبِیَّ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمَ) بِقَدَحِ لَبَنٍ مِنَ النَّقِیعِ لَیْسَ مُخَمَّرًا، فَقَالَ: «أَلاَّ خَمَّرْتَهُ وَلَوْ تَعْرُضُ عَلَیْهِ عُودًا»، قَالَ أَبُو حُمَیْدٍ: إِنَّمَا أُمِرَ بِالأَسْقِیَةِ أَنْ تُوكَأَ لَیْلاً، وَبِالأَبْوَابِ أَنْ تُغْلَقَ لَیْلاً. {الحدیث: ٥٢١٠ = ٥٢٠١ فم}:

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە نەقیعەوە، کە نزیکەی بیست فرسەق، دەوری شەست میل، لە مەدینەوە دوورە، جامێ ماستم هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری دانەپۆشرابوو، فەرمووی: (ئەگەر تەلێ چیلکەت بەسەری دا رایەڵکردووە، دەبوو سەریت داپۆشیبایە). {تجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٦ = ٥٦٠٥، ٥٦٠٦ فتح}.

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی فەرمووی: هەروا فەرمانمان پێکراوە کە بەشەو دەمی کوندەو مەشکەو جەوەندە ببەستین‌و دەرگا بەشەو داخەین).

## ١٠٢٣) سەری دەفر داپۆشن‌و دەم‌و هەنگڵی کوندەو جەوەندە ببەستن. (٥٢١٤ - ٥٢٢٦)
## باب: غَطُّوا الإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ

١٢٨١- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمَ): «إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّیْلِ، أَوْ أَمْسَیْتُمْ، فَكُفُّوا صِبْیَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّیْطَانَ یَنْتَشِرُ حِینَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّیْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، فَإِنَّ الشَّیْطَانَ لاَ یَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرُوا آنِیَتَكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَیْهَا شَیْئًا، وَأَطْفِئُوا مَصَابِیحَكُمْ». {الحدیث: ٥٢١٨ = ٥٢٠٩ فم. تجرید/٣، لاپەڕە: ٤٥٢، رقم: ٣٢٨٠، ٣٣٠٤، ٣٣١٦، ٥٦٢٣، ٥٦٢٤، ٥٦٩٥، ٦٢٩٦. أبو داود. أشربة: ٣٧٢١. تحفة الأشراف/٢٤٤٦}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (کە بەرایی تاریکی شەو دەستی پێکرد) یا فەرمووی: (کە بوو بەئێواری، ئیتر لەو دەمەدا منداڵەکانتان بگرنەوەو مەهێڵن لەوکاتەدا بڵاو ببنەوە بەملاو بەولادا، چونکە دێوەکان، واتە: شەیاتینی، حەزیان لەتاریکییە، رقیان لە روناکییە، لە تاریکیو ڕەشاییو بارودۆخی وادا، دەکەونە هەڵپەو چالاکی نواندن، بەڵام تاوێ لەشەو تێپەڕیو بوو بەشەوی تەواو، ئیتر ڕێگەی ئاموشۆیان لێ مەگرن، وە دەرگاکانتان دابخەنو ناوی خودا بهێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، وە دەمبێنی کوندەو مەشکەو جەوەندەو هیزەو خیگەی خۆتان ببەستنو ناوی خودا بهێنن، وە سەری قاپو قاجاخو دەفری خۆتان داپۆشنو ناوی خودا بهێنن، ئەگەر هەر هیچت دەست نەکەوت کە سەری حاجەتو دەفری پێ داپپۆشی تەڵێ چیلکەی بەسەردا رابهێڵە، وە چراکانتان بکوژێننەوە).** {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٧، ٢٦٨٨} .

**١٢٨٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «غَطُّوا الإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ، لاَ يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الْوَبَاءِ». وفي رواية: قَالَ اللَّيْثُ (يعني ابن سعد): فَالأَعَاجِمُ عِنْدَنَا يَتَّقُونَ ذَلِكَ فِي كَانُونَ الأَوَّلِ.** {الحديث: ٥٢٢٤ = ٥٢١٥ فم}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (سەری قاپو قاجاخو حاجەت بنێنەوەو دەمبێنی کوندەو جەوەندەو مەشکەو شتی وا ببەستن، چونکی هەموو ساڵێ شەوێکی وای تیادایە، کە پەتای تیادا بڵاو دەبێتەوە، ئەو پەتایە بەلای هەر دەفرێکا بڕوا کە سەری نەنرابێتەوە، وە بەلای هەر جەوەندەو خێگەیەکا بڕوا کە دەمبێنی نەبەسرابێ دەچێتە ناوی).**

لەیتی کوڕی سەعد، کە مامۆستای مامۆستاکەی ئیمامی موسلیمە دەفەرموێ: (ئەو خەڵکە ناعەرەبانەی کە لەوڵاتی ئێمە هەن لەمانگی کانوونی یەکەما خۆیان لەم شەوە دەپارێزن، کەپێشی دەگوترێ مانگی دیسەمبەر). {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٨}.

## ١٠٢٤) خواردنەوەی شەربەتی هەنگوین‌و خۆشاو (نەبیذ)و شیرو دۆو ئاو. (٥١٩٤ - ٥٢٠٥)

## باب: في شرب العسل والنبيذ واللبن والماء

١٢٨٣- عَنْ أَنسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِقَدَحِي هَذَا الشَّرَابَ كُلَّهُ الْعَسَلَ وَالنَّبِيذَ وَالْمَاءَ وَاللَّبَنَ. {الحديث: ٥٢٠٥ = ٥١٩٦ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەم پەرداخەی خۆما، هەموو جۆرە خواردنەوەیەکی حەڵاڵم بەدەستی خۆم دەرخواردی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوە، وەك شەربەتی هەنگوین‌و خۆشاو (نەبیذ)و ئاوو شیرو ئەم جۆرە خواردنەوانە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣٣}.

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ. لە ١٩٩٢/٥/١٩، لە تاجول ئوصولا، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٤٢٢، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٥٢٥٧ ج/٤، پارچەیێ شیعرم نووسیوە، سەبارەت بەیەکەم هەڵبژاردن لە کوردستانا، جا وا ئەم شەویش کە شەوی: ٢٠١٠/٣/٧یە لە نامیلکەی (التُّرْكُمَانُ شَدُّ قُوىَ الْعَرَبِ)ییەوە، ئەم سەرنجە راگوێز دەکەم: (... بەڕاستی مەزلوومییەتی گەلی کورد لە کەرکووك، لە نووسین نایێ، هەر ئەوەندەت دەزانی لە کەرکووك منع التجول بوو، وە کوردێکی بێ تاوانی زۆر، بەتایبەتی لە لاوان ئەگیران‌و لەزیندان توونـد ئەکران‌و لێیان ئیعدام ئەکرا، لە بۆنەکانا، لە جەژنەکانا، لەباتی خەڵات، چەند لاویکی کوردیان لەمەیدان رەمیو، لە یاریگاکانا، لە ئاهەنگێکی جەماوەریدا، بەدەم گۆرانی‌و چەپلە رێزان‌و سروودو شاییلۆغان‌و سەماوە، چەپکێ لاوی کوردی خوێن گەرمیان گوللە باران دەکرد، لەسەر ئەم

شێوەیە، کەمن خۆم بەچاوی خۆم حاڵەکەم دیوە: لەپێشا لەڕێگەی ڕاگەیاندنی ڕەسمییەوە، خەڵکێکی زۆریان کۆدەکردەوە، بەم بۆنەیەوە جۆرەها شیرینیو شەربەتیان تیادەگێڕا، جۆرەها وتاری ئاگرینو سروودی نیشتمانییان دەچڕیو ڕەشبەڵەکیان دەگێڕاو کچە تورکمانو عەگاڵ بەسەر نوقڵو شیرینییان دەگێڕا، دوایی وەك دەسکە گوڵێ، بە بەرچاوی جەماوەرەکەوە، کۆمەڵێ لاوی کوردیان بەجلی کوردییەوە دەهێنا، هەزار تۆمەتی درۆیان بۆ هەڵدەبەستن، چاویان بە پەڕۆیەکی ڕەش دەبەستنەوە بەشەقو تێهەڵدان دەیانبردن بۆ بەرداری سێدارەکان، بە گوریسی گوش، توند توند، سەرتاپا، شەتەکیان دەدان بە کۆڵەکەی ئیعدامەکانەوە، گوێیان لەخڕەی چەخماخەو مەشقی رامیەکانەوە بوو، کە بەتفەنگەکانیانەوە دەیانکرد، کەهەر مەعدوومێ (لەسێدارە دراوێ) شەش سەرباز تیرە بارانی دەکرد، هەر سەربازێ (٣٦) سیو شەش گوللەی پێوەدەنا، نێوانیان شەش هەنگاو بوو! کاتێ ئاهەنگ درێژەی دەکێشا، ئەوسا داواکاری گشتی موقتەبەسی حوکمەکەی دەخوێندەوە، بە بڵندگۆ بۆ عەشاماتەکە، لەم کاتەدا کۆمەڵێ ژنی بەرەڵا، دوور لەجوانترین ڕەوشتی ژنان کە ڕەحمو بەزەییە، بەسەماو ڕەشبەڵەكو گۆرانیو مۆسیقا جەماوەرە تەفرە دراوەکەیان دەورووژاند، بەرە بەرە دەهاتنە سەر ئەم شیعرە، کە بە چریکەیەکی پڕ لە ڕقو کینەو دەغەزەوە دەیانچڕاندو دەیانشیراند:

أَحْلَــى أُغْنِيَــةْ هَيَــا رَدِّدُوا
لَعْلَعَــةْ رَصَــاصْ، بِصَــدْرِ العَــدُوْ

خۆشترین سروود بەلای منەوە
قرمەی گوللەیە بەسینگی دوژمنەوە!!

جەماوەرە خەڵەتاوەکەیش، دەیانکرد بەهەراو هوریاو زەناو شیرە شێڕێ کە نەبێتەوە، جا ئالەم دەمەدا، فەرماندەی دەسڕێژکەرەکان، کە ئەفسەرێ بوو، بە دەنگێکی بەرزی گڕ، دەیقیڕاند: (إرْمِ = دەسڕێژ) ئیتر دەبوو بە قرمەی دەسڕێژو

بەتەقەو چەپڵە ڕێزان‌و هوتاف کێشان‌و تفو نەفرەت لە خائینان‌و ترسنۆکان. ئیتر بەرە بەرە پەتە گوشەکان گوللەیان بەردەکەوت‌و دەپچڕان‌و مەعدوومەکان گرمۆڵە دەبوون وەك ژیژوو، لەسەرەتاوە کە گوللەیان بەردەکەوت، هاوارێ، جووڵەیەکیان دەکرد، ئیتر مەیدانەکە دەبوو بەگۆمی خوێن‌و هەر پارچە جەرگ‌و دڵ بوو، بەدەم گوللەوە دەردەپەڕی‌و دەچوو بۆ نزا لەلای خودا!

گەلێ جار مەعدوومێ ڕۆحی تیادەما، دکتۆرەکە، بەعث وا کردبووی بە دڕندە، بە تەڵقەی ڕەحمەت، لاوە کوردەکەی بە تەواوی دەکوشت‌و خەڵکەکەیش چەپڵەیان بۆ لێدەدا!!).

من وەك شایەتحاڵێ ئەم ڕاستییەیش دەنووسم بۆ مێژوو: (... لە کەرکووك، بەدەیان کوردی مەردی دلێری بێ تاوان لەسێدارە دران، وەك کۆمەڵەی شێخ مەعرووف بەرزنجی‌و مەلا نوری عەبدوڵلا و شێخ حوسەین بەرزنجی، کە سیی‌و دوو (٣٢) کورد بوون، سێ ڕۆژ لەمەیدانی سێدارەکەیانا، بەدار زەیتوونەکانی بەرابەر خەستەخانەی کۆنی سەربازی، لەبەینی دەبۆ کۆنەکەو مزگەوتی ئیبراهیم بەگ تەکریتیدا، هەڵیان واسین‌و ژن‌و پیاوو مناڵ، لە تورکمانە داخ لەدڵەکان، گەڤیان دەکردن‌و بە دارو بە بەردو بەسۆڵ‌و بە پێڵاو، وەك مارو دووپشك بکوژێ لێیان دەدان‌و، تفو بەڵغەم‌و پیساییان لە تەرمەکانیان دەکرد! سێ ڕۆژ کردیان بەشایی لۆغان‌و بەم بۆنەیەوە بە هەزاران مەڕو بزن‌و ئاژەڵیان سەردەبڕی‌و لە خۆشیانا دەیانبەخشییەوە!

وە حوکومەتی بەعث تەرمەکانی بە ئوتومبیل وەك بووك، بەناو گەڕەکە تورکمانەکاندا گێڕا، بۆ پیرۆزبایی‌و شادەکامی!! بەبەرچاوی خۆمەوە لەناو شەریکەی نەوتەکەدا پۆلیسێکی کوردیان گوللە باران کرد، ئەمنێ بەچەند دەست درێژی لاشەکەی کرد بە دوو لەتەوە!!

ئێش‌و ئازارو سووکایەتی‌و قەهری قەومی لە کورد، لە کەرکووك، بەڕادەیێ وابوو، کە گشت چینەکانی کوردی گرتبۆوە، گەڕەکە کوردەکان لەگشت خزمەتێ بێ

بەش بوون، نەئاو، نە کارەبا، نە قیرتاو، نە کەمترین خزمەتی شارەوانی، هەمیشە عەرەبو تورکمانو حوکومەت بەرەیەکی سێ قۆڵییان، دژ بەکورد دروست کردبوو، وەی لەو کوردەی کە دەبرا بۆ پۆلیسخانەو فەرمانگەی ئەمنو سەربازگاکان، مەرێ بوو بەدەم کۆمەڵی گەلە گورگەوە، بەوێنە: شوفێرێکی کوردو شۆفێرێکی تورکمان دەعمیان بکردایە ئەوە کوردەکە بەبێ چەندو چوون قەباحەتبار دەکرا، فەلاقە دەکرا، مانگێ زیندان دەکرا، وا باوبوو دەیانگوت: کوردی کەرکووك خوێنی نییە!).

ئەمە مشتێ لە خەروارێکە لەو دەریا ستەمو زوڵمو زۆرەی کە لەکوردی کەرکووك دەکرا، وەمن لەماوەی ئەو (٣٠) سیی ساڵەدا کە لە کەرکووك ژیاوم، وەك کامێرەی شاراوە، زۆر شتم لەم بابەتە کۆکردۆتەوە بۆ کاتی خۆی. جا لەرۆژگارێکا، کەهەموو کوردێ لە کەرکووك، لەسەرو ماڵو مناڵو حاڵی خۆی بەهەناسە دڵنیا نەبوو، زەلامێکی هەست مردوو، لە کوردەکانی کەرکووك، کرا بە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی، لە بەغدا، لەناو دانیشتنی پەرلەمانا هەڵسا، قۆڵی خۆی هەڵماڵی، وە بەهەموو دەنگی خۆی، وەك شێر نەڕاندی: (من فیسارە کەسی کوڕی فیسارە کەسم، نوێنەری کوردەکانی کەرکووکم، ئامادەم دوکتۆرێ بانگ بکەن، بە دەرزی هەموو خوێنەکەم دەربهێننو بیکەنە لەشی کاك صەددامەوە ئۆف ناکەم!!). ئەم بەڕێزە لە کەرکووك من بە گوێی خۆم چەند جارم لێ بیست، کە لەناو کۆڕی دانیشتنا، بۆ شانازی دەیفەرموو: (لە ئەنجومەنی نیشتمانی، نامەیەکی پشتگیریمان بە خوێنی خۆمان بۆ سەرۆك سەددام نووسی، دەیگوت: لەم خوێن بەخشینەدا، من پشکی شێرم بەرکەوت، لەهەموویان زیاتر خوێنم بەخشی!!). کورتو پوخت، بەهۆی دژایەتی بەرەی یەککگرتووی تورکمانو عەرەبو میرییەوە: کورد سەرەڕای ئەو گشتە چەوسانەوەیش، ئەوەی کەپێی بڵێی ئیشوکارو وەزیفە پێی نەدەدرا، بەڵکوو کارمەندی کورد، مەگەر چۆنەها، دەنا لە کەرکووك کارمەندی کوردنەما، هەریەکێ بە لایەکا نەقڵ کرا، زمان حاڵیان ئەوەبوو: (کە وەك ئاژەڵو ئامێرو عەرەبانەو شتی وا، کوردان بەکاربهێنن بۆ خزمەتکاریو بەس، وەك حەماڵیو کەناسیو بۆیاخ

چێتی!). وەکی تریش رۆژانە تەرحیلو تەعریبو تەبعیثو چەوسانەوەو زوڵمو زۆر، بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو، بەردەوام بوو،ماڵو حاڵ لە کورد دەستێنراو تەسلیم بە عەرەبی هاوردە دەکرا، هەروا دێو گەڕەك، لە کەرکووك لەکورد چۆڵ دەکراو پڕ دەکرا لە عەرەبو ناوە کوردییەکانیان دەکرا بە عەرەبی، وەك رەحیماوایان ناونابوو ئەندەلوس، بەیان ویلادەی منداڵ بە کورد نەئەدرا، تاپۆ نەئەدرا، لەکاتێکا کە گەلی کوردی کەرکووك ئەمە حاڵی بوو، نوێنەرەکەیان لە پەرلەمان، ئەوە قسەیو رەفتاری بوو، لەهەموو کەسێ زیاتر دڵسۆزی دوژمنی یەکەمی کورد بوو، ئەمە بۆ؟ ئایا شتی وا ئەقڵ دەیگرێ؟ جامن بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ئەنجامی بەراوردێکی دوورو درێژدا، لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی قووڵو شارەزاییەکی تەواو، لە نەفسیاتی کورد دەڵێم:

(راستە کە کورد بەرگەی هەموو زوڵمو زۆرو کارەساتێ دەگرێ، بەرگەی گوللەو تۆپو تانكو فڕۆك دەگرێ، بەرگەی موشەكو غازو کیمیاباران دەگرێ، چۆك بەدوژمنی خۆی لە مەیدانی نەبەرددا دائەدا، دەست بەقوڕگی شێردا دەکا، بەسەر تەعریبو تەتریكو تەفریسو دەربەدەریدا زال دەبێ، من ئەمانەم هەموو بەچاوی خۆم دیوە بەزیادەوە، بەڵام... بەڵام چی؟ بەڵام جێگەی داخە، بەتایبەتی رۆشنبیرەکانیان، بەرابەر بە پوولو پارە خۆنەگرن، کوونین، بەپارە وەك منداڵ دەیانخەڵەتێنن، کورد گوتەنی: (کورد کە گوێی لەزڕەی پارە بوو گورج فشی دەکا!!).

لەڕاستیدا بیردۆزەیێ هەیە دەڵێ: (سرکە تانەبێ بە مەی نابێ بەسرکە). شێخ جافریش لەپێشا پێشمەرگە بوو، کەبوو بەحاش نەخۆش کەوت، هات بۆ (مستشفی کرکوك العسکری) بەهۆی منەوە، لەقاوشی ئەفسەرەکان خەوت، چونکە من بەهۆی مامە شێخ مەحموودی قەرە چێوارییەوە، کە تەکیەو مزگەوتی هەبوو لە گەڕەکی چوارباغ، کەمن لەوێ فەقێ بووم، ئاشناییم لەگەڵ ئەویش هەبوو، جا ئەم چەند حەقیقەتەم لەدەمی شێخ جافر خۆی بیست:

١- شازده دیناری پێ بوو لەبەر دەمما، لەسەر مێزەکەی من داینا و گوتی: هەموو سەروەت و سامانەکەم ئەم (١٦) دینارەو بڕنەوێکەو دەوری چل سەرفورسانە کە تازە تەعینم کردوون و ئاوبێنەو دەست بشۆ!!

٢- من بۆم دەرکەوتووە، کە ئێمەی موالی حوکومەت، وەك سەربازی لیڤی واین، کە سەربازی سوپای ئینگلیز بوون، هەتا زیاتر دوژمنی ملەتی خۆمان بین باشتر پێش دەکەوین، گەلی کورد نەخوێنەوارە، هەرچی بۆ بکەی بەزایە دەچێ، کەواتە: پیاو خزمەتی خۆی بکا، لەخزمەتی ئەو باشترە!!).

سوبحانەڵلا کێ بڕوا دەکا، کە رژێمێ دوو برات بکوژێ، لەسەر ئەو شێوەی کە لەپێشەوە باسمانکرد، کە شێخ مارف بەرزنجی و شێخ حوسەین بەرزنجی بوون، کەچی براکەیان ئاوا وەك شێخ چۆپی، ئەڵقە بە گوێی ئەو رژێمە بێ؟!

ئافەریم شێخ جافری خاوەنی (١٦) دینارو چل جاش و خاوەنی ئەم فەلسەفەیە، تۆ بووی بە پارێزگاری سلێمانی و بووی بە سەرۆکی مەجلیس تەنفیزی کوردو بووی بەهەموو شتێ لەم کوردستانەدا، بەڵام زۆرینەی پێشمەرگەو سەرکردە کوردەکانیش گۆڕیشیان دەست نەکەوت!!

خودایە! بە رەحمەتی بێ پایانی خۆت فریای ئەم گەلی کوردی چەوساوەو ستەمدیدەیە بکەوە، وە لەم گێژاوی یاری پێکردنە رزگاری بکە، بەتایبەتی بەدووری بگرە لەم جۆرە پەرلەمانە، کە لەهەموو شتێ دەکا لە پەرلەمان نەبێ، کە ئەمە پێناسەکەیەتی:

ئـــــالاو دەســــتوورو پەرلـــــەمان
نـــاوی ئـــاواو شـــاری وێـــران

١٢٨٤- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَأَتْبَعَهُ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَسَاخَتْ فَرَسُهُ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي، وَلاَ أَضُرُّكَ، قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ، قَالَ: فَعَطِشَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَمَرُّوا بِرَاعِي غَنَمٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَأَخَذْتُ قَدَحًا، فَحَلَبْتُ فِيهِ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَمَ) كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، فَأَتَيْتُهُ بِهِ، فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ. {الحديث: ٥٢٠٧ = ٥١٩٨ فم. بخاري. مناقب: ٣٦١٥، ٣٦٥٢، ٣٩٠٨، ٣٩١٧، ٢٤٣٩، ٥٦٠٧. راجع رقم: ١١٥٥ — المتقدم + تجريد/٤، رقم: ١٥١٧ + تاج/٣، زنجيره: ١٠١، ژماره: ٣١٦٠ + تاج/٣، زنجيره: ١٠١، ژماره: ٣١٥٨}:

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم، شوێنی دەکەوێ تا بیکوژێ، یا دیلی بکاو ئەو خەڵاتە وەربگرێ لە قوڕەیش کە بڕیاریان دابوو، بۆ کەسێ پی بکوژێ، یا دیلی بکا. جا پێغەمبەر نزای لێ دەکا کە خودا چارەی بکا، کاتێ لە پێغەمبەرو ئەبوبەکر نزیك دەبێتەوە ماینەکەی سەر سمێ دەداو دەیگلێنێو هەردوو دەستی ماینەکەی لە زەوییەکی رەقەنا، هەتا هەردوو ئەژنۆی دا دەچێ، جا سوراقە کە ئەم موعجیزەیە دەبینێ، عەرزی دەکا: نزام بۆ بکە، زیانم نابێ بۆت، ئەویش دەپاڕێتەوە بۆی. فەرمووی: جا لەڕێگە پێغەمبەر توونی دەبێ، دەگەن بەشوانێ، ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە کاسەیەکی دارینا، بەقەد ژەمی دۆشینی مەڕێ شیرم تێ دۆشیو بردم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەدڵی من لێی خواردەوە).

١٢٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، فَأَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ. {الحديث: ٥٢٠٨ = ٥١٩٩ فم. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٩٤، ٣٤٣٧، ٥٥٧٦. ترمذي. تفسير: ٣١٣٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو شەوەی کە پێغەمبەریان برد بۆ ئیلییا، واتە: بۆ بەیتولەقدیس، لەوێ دوو پیاڵە خواردنەوەیان بۆ هێنا، پیاڵەیێ شیرو پیاڵەیێ مەی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشایان دەکاو پیاڵە شیرەکە وەردەگرێ، جوبرائیلیش دەفەرموێ: (سوپاسو ستایش بۆ خودا کەتۆی خستە سەر رێگەی راستی خۆی، ئەگەر پیاڵە مەیەکەت وەربگرتایە، ئۆمەتت سەریان لێ دەشێواو گومڕا دەبوون). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣١}.

## ١٠٢٥) خواردنەوە بەجامی ئاو خواردنەوە. (٥١٩٤ - ٥٢٠٥)
## بابٌ: الشرْبُ في القَدَحِ

١٢٨٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امْرَأَةٌ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ أَنْ يُرْسِلَ إِلَيْهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَقَدِمَتْ فَنَزَلَتْ فِي أُجُمِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى جَاءَهَا، فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَإِذَا امْرَأَةٌ مُنَكِّسَةٌ رَأْسَهَا، فَلَمَّا كَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، قَالَ: «قَدْ أَعَذْتُكِ مِنِّي»، فَقَالُوا لَهَا: أَتَدْرِينَ مَنْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: لاَ، فَقَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَاءَكِ لِيَخْطُبَكِ، قَالَتْ: أَنَا كُنْتُ أَشْقَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ سَهْلٌ: فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذٍ حَتَّى جَلَسَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: «اسْقِنَا». لِسَهْلٍ، قَالَ: فَأَخْرَجْتُ لَهُمْ هَذَا الْقَدَحَ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ. قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا فِيهِ، قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ بَعْدَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَوَهَبَهُ لَهُ. {الحديث: ٥٢٠٤ = ٥١٩٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٥٥ = ٥٦٣٧ + تجريد/٥، رقم: ١٧٨٨ = ٥٢٥٥، ٥٢٥٧}:

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نوعمانی کوڕی ئەبولجەون، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیسلام بوو، عەرزی حەزرەتی کرد: کچێکی بێوەژنم هەیە، لەناو عەرەبا ژنی واجوان کەمە، ئەگەر بفەرمووی لێتی مارە دەکەم؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی باشە، وەلێی مارەکرد لەسەر دوازدە ئۆقیە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو ئوسەیدی نارد لەگەڵ نوعماندا، کە بیگوێزێتەوە بۆی، وە ئەبو ئوسەید ژنەکەی هێنا، ناوی ئومەیمەی کچی نوعمان بوو، نازناوی بینتولجەون بوو، دایەنەکەیشی کە لەلەی بوو لەگەڵیا هاتبوو، لە قەڵای بەنی ساعیدە کە یەکێکە لە قەڵاکانی مەدینە. لەوێ دابەزی، جا ئەبو ئوسەید هەواڵ دەبا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوا بینتولجەونمان هێنا بە بووکی بۆت، بفەرموو بۆلای هاوسەرەکەت، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە ناو پەردەی بووك و زاوایی، روانی واژنێ بە پەستی دانیشتووەو سەری شۆڕەوە کردووە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە گوفتوگۆ لەگەڵیدا، ژنەکە دەڵێ: پەنا دەگرم بەخودا

لەتۆ، کەدەستم بۆ بهێنی! ئەویش دەفەرموێ: پەنات برد بۆکەسێ کە شایستەی پەنا پێبردنە، ئەوا تۆم پەنادا لەخۆم. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دێتە دەرەوەو بەجێی دەهێڵێ. جا خەڵکەکە کە لەحاڵەکە حاڵی دەبن، بە ئومەیمە دەڵێن: دەزانی هەڵەیەکی گەورەت کرد، دەزانی ئەوە کێ بوو کەهاتە ژوورەوە بۆلات؟ دەڵێ: نەء، نازانم کێ بوو؟ گوتیان: ئەوە پێغەمبەری خودا بوو، کەتۆی مارە کردبوو بۆ خۆی، تۆ بەم کردارە ناشایستەیە، ئەو پایە بەرزەت لەکیس خۆتدا، کەشادببیت بەپایەی هاوسەرێتیی پێغەمبەرو بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز شادببیت بە پلەی دایکی موسوڵمانان، کە دەفەرموێ: (وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ). ئەویش لەپەشیمانیدا بە پەژارەوە گوتی: من لەوە بەدبەختترم کە پیتو فەڕی وام تووش ببێ!).

سەهل فەرمووی: ئەو رۆژە پێغەمبەر خۆیو هاوەڵانی هاتن، تا لەساباتەکەی بەنی ساعیدە دانیشتنو بوون بە میوانمان، پاشان فەرمووی: (ئەی سەعد! خواردنەوەیەکی پاکمان بۆ بهێنە تا بیخۆینەوە). منیش ئالەم جامەدا، کە جامی پێغەمبەر خۆی بوو، خواردنەوەیەکی پاکو حەڵاڵم دەرخوارد دان.

قسە گێڕەوە، کە ئەبو حازیمە فەرمووی: جا سەعد ئەوجامەی دەرهێنا بۆمانو پیشانمانی داو یەکە یەکە ئاومان پێ خواردەوە، بۆ مووفەڕکی، جا لەوەپاش جێنشینی باش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رەزای خودای لێ بێ) داوای ئەو جامەی کرد لەسەعد، کەپێی ببەخشێ، سەعدیش جامەکەی بەخشی پێی).

## ١٠٢٦) هەڵپێچکردنی دەمو هەنگلی کوندەو مەشکەو ئەمانە ناباشە.

(٥٢٢٧ - ٥٢٤١)

## بابٌ: النَّهْيُ عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ

١٢٨٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا. وفي روايةٍ: وَاخْتِنَاثُهَا أَنْ يُقْلَبَ رَأْسُهَا ثُمَّ يُشْرَبَ مِنْهُ. {الحديث: ٥٢٤٠، ٥٢٤١ = ٥٢٣١، ٥٢٣٢ فم. تجريد/ ٥، لاپەڕە: ١٤٧، رقم: ١٨٥١ = ٥٦٢٦، ٥٦٢٥ فتح الباري}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نەهی دەکـرد لـەوە کـەدەم‌و هـەنگڵی کونـدەو جەوەنـدەو مەشـکە، هـەڵپێچ بکـرێ‌و ئینجا دەمی پێوە بنرێ‌و ئاوی لێ بخورێتـەوە). {ریـاض/٢/٢٦٤، زنجیـرە: ١١٢، ژمـارە: ٧٦٢} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٦٧٥ چ/٤}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (٥٢٤١)دا، زوهری دەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە کە کوندەکە، یـا مەشـکەکە دەمەکـەی سـەرەو خـوار بکرێتـەوەو لێـی بخورێتـەوە). {ریـاض/٢، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٧٦٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

هۆی ئەم نەهیە چەند شتێکە: وەك دەمی کوندەکە قێزاوی دەبێ‌و خـەڵکی تـر قێـزی نایـێ لێـی بخواتـەوە، یـا بـەرە بـەرە دەمـی کوندەکـە، بۆگـەن دەبـێ، یـا ڕێ دەکـەوێ، جانـەوەرێ، یـا شـتێ خـراپ چـووەتە نـاو کوندەکـەوەو دەچـێتە ناوسـکی ئەویشـــەوە دەڵـــێن: لەســـەردەمی پێغەمبـــەردا، پیـــاوێ دەم ئـــەنێ بـــە هـــەنگڵی کوندەیەکەوە تووڵە مارێکی تیادەبێ دەچێتە ناوسکی، یا لەبەرئەوەیە گەڵێ جار ئاو دەپەڕێتە قوڕگی، یا لەبەر ئەمانە هەمووی، زۆریی هۆو فرە هۆیی کارێ دروستە.

فەقێ بووم لەپریس، لەلای هەڵەبجە، دەروێشێ دەیەوێ مارێ بخوات، دەینێتـە ناو هەردوو قولی مشتیەوەو سەری مارەکە بەرابەری دەمی خـۆی رادەگـرێ‌و خـۆش خۆش دەڵێ: ها کافر! بتخـۆم، مارەکـە وزاق دەداو خـۆی دەکـا بەقوڕگیـداو دەچـێتە ناو گەدەی، جـا کێشـەیێ بـۆ دەروێشـەکە دروسـت دەبـێ، کـە مارەکـە دەیـەوێ بێتـە دەرەوە، دەروێشەکە دەکۆکێ‌و مارەکە دەگەڕێتـەوە بۆنـاو گـەدەی، لەهانـە سـوورەوە دەروێشەکەیان بەسواری کەرێ برد بۆ هەڵەبجە، جامانەیەکی کردبوو بە لەچك، لـە هەڵەبجـە دەرمانیـــان پێـــدا مارەکـــەی فڕێـــدا، دیمـــەنی کەرەکـــەو دەروێشـــەکەو لەچکەکەی‌و تۆقاوییەکەیم هەر لەبەر چاوە!!

## ١٠٢٧) ڕێگری لەشت خواردنەوە لە حاجەتی زێڕو زیودا. (٥٣٥٦ - ٥٣٩٥)
## بابٌ: النَّهْيُ عَنِ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ

١٢٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِالْمَدَائِنِ فَاسْتَسْقَى حُذَيْفَةُ، فَجَاءَهُ دِهْقَانٌ بِشَرَابٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ فَرَمَاهُ بِهِ، وَقَالَ: إِنِّي أُخْبِرُكُمْ أَنِّي قَدْ أَمَرْتُهُ أَنْ لاَ يَسْقِيَنِي فِيهِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ تَشْرَبُوا فِي إِنَاءِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلاَ تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ وَالْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَهُوَ لَكُمْ فِي الآخِرَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٥٣٦١ = ٥٣٥٢ فم. تجريد/٥/٢٠٩، رقم: ١٨٥٤ = ٥٦٣٤، ٥٦٣٠، ٥٦٣١. نسائي. زينة: ٥٣١٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم فەرمووی: لەخزمەتی حوزەیفەدا بووین، لەمەدائین بووین، کە ئێستا پێی دەگوترێ: سەلمانپاك، حوزەیفە داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، کوێخایێ لە حاجەتێکی زیویندا ئاوی بۆهێنا، ئەویش لێی وەرگرتو جامەکەی بە ئاوەکەوە کێشا پێیدا. ئەوجا پێی گوتن: با پێتان بڵێم بۆچی وام لێی کرد، ئەمە چەندین جارە پێی دەڵێم کە شتی وانەکاو لە قاپو حاجەتی زێڕو زیودا شتی خواردنو خواردنەوەم بۆ نەهێنێ، کەچی ئەو هەرواز ناهێنێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە حاجەتی زێڕو زیودا شت مەخۆنو شت مەخۆنەوە، وە ئاوریشمو دێباجیش لەبەر مەکەن، چونکە ئەمانە، واتە: زێڕو زیوو دێباجو ئاوریشم، لە جیهانا بۆ ئەوانەو لەدوا ڕۆژدا بۆ خۆمانە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٦} + {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٣ چ/٤}.

١٢٨٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ». وفي رواية: «أَنَّ الَّذِي يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ...». {الحديث: ٥٣٥٣، ٥٣٥٤ = ٥٣٤٤، ٥٣٤٥ فم. تجريد/٥/١٤٩، رقم: ١٨٥٤ = ٥٦٣٤}:

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لە حاجەتی زیودا شت بخواتەوە، ئەوە قڵپ قڵپ ئاگری سووری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناو سکی خۆیەوە). لە گێڕانەوەیەکا: (هەرکەسێ لە حاجەتی زێڕدا، یا

له حاجەتی زیودا شت بخوا، یا شت بخواتەوە، ئەوە قلّپە قلّپ ئاگری سووری دۆزەخ دەڕژێنێتە، ناوسکی خۆیەوە. {ریاض/٢/٢٧٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٧٧٨} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٦}.

## ١٠٢٨) لەکاتی شت خواردنەوەدا، لای ڕاست لەپێشترە. (٥٢٥٧ - ٥٢٦١)
## بابٌ: إذَا شَرِبَ فالأَيْمَنُ أَحَقُّ

١٢٩٠- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي دَارِنَا، فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِي هَذِهِ، قَالَ: فَأَعْطَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) وُجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ شُرْبِهِ، قَالَ عُمَرُ: هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، يُرِيهِ إِيَّاهُ، فَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الأَعْرَابِيَّ وَتَرَكَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «الأَيْمَنُونَ الأَيْمَنُونَ الأَيْمَنُونَ». قَالَ أَنَسٌ: فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ. {الحديث: ٥٢٥٩ = ٥٢٥٠ فم. بخاری. هبة: ٢٥٧١ تحفة الأشراف/٩٧٢. تجريد/٣/١٢٣، رقم: ١٠٣٤ = ٢٣٥٢، ٢٥٧١، ٥٦١٢، ٥٦١٩}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆماڵی ئێمە، داوای خواردنەوەی کرد، ئاژەڵێکی وردەمان بۆی دۆشی، ئەوجا لەئاوی ئەم بیرەی خۆمم تێکەڵ کرد، ئەوجا بەدەستی خۆم پێشکەشی پێغەمبەرم کرد، پێغەمبەر لێی خواردەوە، ئەبوبەکر لەلای چەپی پێغەمبەرەوە بوو، عومەریش بەرابەری بوو، عارەبێکی دەشتەکیش لەلای ڕاستیەوە بوو، کە پێغەمبەر لە خواردنەوەکەی لێ بۆوە، عومەر ویستی ئەبوبەکری پیشان بدا، هەتا جامەکە بدا بەو، لەبەرئەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە ئەبوبەکرە، بەلاّم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جامە شیراوەکەی دابە عەرەبە دەشتەکیەکەو نەیدا بە ئەبوبەکرو عومەر، وەبۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە فەرمووی: (لەم جۆرە بابەتانەدا، لای ڕاست لەپێشترە) سێجار فەرمووی: (لای ڕاست لەپێشترە). بۆیە

ئیمامی ئەنەسیش دەیفەرموو: کاری وا نەك جاریّ، بەڵکوو سیّ جار سوننەتە).
{ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٦٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٧٦٠ + ژمارە: ٥٦٩، زنجیرە: ٦٣}.

## ١٠٢٩) مۆڵەت وەرگرتن لە گچکەی لای ڕاست تا خواردنەوە بدریّ بە پیرانی لای چەپ. (٥٢٥٧ - ٥٢٦١)

## باب: في إستئذان الصَّغيرِ في إعطاءِ الشُّيُوخ

١٢٩١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أُتِيَ بِشَرَابٍ، فَشَرِبَ مِنْهُ وَعَنْ يَمِينِهِ غُلاَمٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَشْيَاخٌ، فَقَالَ لِلْغُلاَمِ: «أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلاَءِ»؟ فَقَالَ الْغُلاَمُ: لاَ وَاللَّهِ، لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا، قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي يَدِهِ. {الحديث: ٥٢٦٠ = ٥٢٥١ فم. تجريد/٣/١٢٣، رقم: ١٠٣٣ = ٢٣٥١، ٢٣٦٦، ٢٤٥١، ٢٦٠٥، ٢٦٢٠. تحفة الأشراف: ٤٧٤٤}:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل-ساعیدی (ڕەزای خودایان لیّ بیّ) فەرمووی: جاریّ لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بیّ) بووین، جامیّ خواردنەوەیان هێنا بۆی، پێغەمبەر خۆی لێی خواردەوە، لەلای ڕاستیەوە کوڕێکی لاوی لیّ بوو، لەلای چەپیشیەوە پیرەکان دانیشتبوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) بە کوڕە لاوەکەی فەرموو: (ئایا ڕازی دەبی کە خواردنەوەکە لەپێش تۆدا بدەم بەم پیرانە؟). کوڕەکەیش کە ئیبنو عەبباس بوو، گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! بەشی خۆم لەبەر ماوەی پیرۆزی تۆ بەکەس نادەم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بیّ) بە حوججەت جامەکەی دایە دەستی). {ریاض/٢، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٦٩} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٧٦٠}.

## ١٠٣٠) نەهی کردن لە هەناسەدان لەجامدا، لەکاتی خواردنەوەدا. (٥٢٥٣ - ٥٢٥٦)

## باب: النهي عن التنفس في الإناء

١٢٩٢- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الإِنَاءِ. {الحديث: ٥٢٥٣ = ٥٢٤٤ فم. تجريد/١، رقم: ١٢١ = ١٥٣، ١٥٤، ٥٦٣٠. ترمذي. أشربة: ١٨٨٩. نسائي. طهارة: ٤٧، ٤٨. ابن ماجة. طهارة: ٣١٣}:

ئـەبو قـەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کاتێ شـت دەخۆنـەوە لـەناو جامەکـەدا هەناسـە مـەدەن). {ریـاض/٢، زنجـیرە: ١١٠، ژمارە: ٧٥٩، ٧٦٦} .

**١٠٣١) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی شت خواردنەوەدا هەناسەی دەدا. (٥٢٥٧ - ٥٢٦١)**

**باب: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يتنفَّسُ فى الشَّرَاب**

١٢٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَـالَ: كَـانَ رَسُـولُ اللَّـه (صَـلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) يَتَنَفَّسُ فِى الشَّرَابِ ثَلاَثًا، وَيَقُولُ: «إِنَّهُ أَرْوَى وَأَبْرَأُ وَأَمْـرَأُ»، قَـالَ أَنَـسٌ: فَأَنَـا أَتَـنَفَّسُ فِـى الشَّرَابِ ثَلاَثًا. {الحديث: ٥٢٥٥ = ٥٢٤٦ فم. تجريد/٥/١٤٨، رقم: ١٨٥٣ = ٥٦٣١} :

ئەنـەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابـوو، بەسـێ بـین شـتی دەخـواردەوە، لـەدەرەوەی جامەکـەدا سـێ هەناسـەی دەدا، وە دەیفـەرموو: (بـەم شـێوەیە بـۆ مـرۆڤ پـاراوتر دەبـێو سـاخلەمتر دەبـێو نۆشـتریش دەبێ). {ریاض/٢، زنجـیرە: ١١٠، ژمـارە: ٧٥٧} . ئەنەسـیش دەیفـەرموو: (هـەر لەبـەر ئەمەیـە کـەمنیش لـەناو خواردنـەوەدا سـێ هەناسـە دەدەمو بەیـەك بـین شـت ناخۆمەوە).

**١٠٣٢) ڕێگری لە خواردنەوە بەڕاوەستانەوە. (٥٢٤٢ - ٥٢٥١)**

**باب: النهى عَن الشُرْب قَائما**

١٢٩٤- عَنْ أَبِى هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّـه (صَـلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «لاَ يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا، فَمَنْ نَسِـىَ فَلْيَسْـتَقِئْ». {الحـديث: ٥٢٤٧ = ٥٢٣٨ فم} :

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کەستان بەڕاوەستانەوە شت مەخۆنەوە، ئەگەر لەبیرتان نەبوو شتتان بەسەر پێوە خواردەوە، خۆتان بڕشێننەوە). {ریاض/٢/٢٦٩، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٧٧٢} .

## ١٠٣٣) مۆڵەتدان بە خواردنەوەی ئاوی زەمزەم بەپێوە. (٥٢٤٢ - ٥٢٥١)

## باب: الرخصة في الشُّرب قائماً مِنْ زَمْزَم

١٢٩٥- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ قَائِمًا وَاسْتَسْقَى وَهُوَ عِنْدَ الْبَيْتِ. {الحديث: ٥٢٥١ = ٥٢٤٢ فم. تجريد/٥/١٤٧، رقم: ١٨٥٠ = ٥٦١٧. طرفه في ١٦٣٧ فتح = ٧٨٣ تجريد/٢} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەدەستی خۆم لەئاوی بیری زەمزەمم دا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەڕاوەستانەوە خواردیەوە، لەلای بەیتابوو کە داوای ئاوی خواردنەوەی کرد). {ریاض/٢/٢٦٧، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٧٦٧} + {تاج/٢/٢٨٧، زنجیرە: ١٣٣، ژمارە: ١٧١٤ چاپی/٤} .

## (پوختەی نامەی خواردنەوەکان)

١- هەرچی مرۆڤ سەرخۆش بکا حەرامو نادروستە، ئیتر کەم بێ، یا زۆر، وشك بێ، یا تەڕ، لەمیوە دروست کرابێ یا لەشتی تر، بەهەر ناوێکەوە بێ جیاوازی نییە.

٢- یەکێك لەهۆی قەدەغە کردنی مەی لە فەرموودەی ژمارە: ١٢٦٣دا روونکراوەتەوە.

٣- خواردنەوەی ئارەقخۆر لە قیامەتا، زووخاوو چڵپاوێکە کە لە لەشی دۆزەخیەکان دەچۆڕێتەوە.

٤- لەسەردەمی پێغەمبەردا ئارەق لەچی دروست دەکرا، ژمارە (١٢٦٧ - ١٢٦٩).

٥- نابێ ئارەق بکرێ بە سرکە.

٦- داپۆشینی سەری دەفری خواردنو خواردنەوە، یا بەستنی دەمو هەنگڵی، بەتایبەتی تر بەشەو.

٧- کۆمەڵێ شتی حەڵاڵ کە پێغەمبەر لێی خواردوونەتەوە، وەك: شەربەتی هەنگوینو شیراوو دۆو ماستاوو ئاوی زەمزەمو شیرو ئاو.

٨- جام لەدوا یەکەم کەس کە لێی دەخواتەوە بەلای راستا دەگێڕرێ، لەناو کۆڕدا.

٩- خۆپاراستن لەهەموو شتێ کە ببێ بەهۆی قێزەونیو پەتا تەنینەوە، بەهۆی خواردنەوە لە دەفرێك، پاکیو خاوێنی دەفرەکەو خواردنو خواردنەوەکە مەبەستێکی شەرعییە.

١٠- ناوهێنانی خودا لەسەرەتای شت خواردنەوەو سوپاس کردن لەسەری. {بڕوانە: ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٦٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ٧٥٨}.

١١- لەدەفرو حاجەتی زێڕو زیودا، شت خواردنو شت خواردنەوە نادروستە.

١٢- خواردنەوە بەچەند بینێ بخورێتەوە باشترەو هەناسەدان لەکاتی خواردنەوەدا، بەڵام لەدەرەوەی جامو ئاوەکە.

١٣- خواردنەوە بەپێوە ناباشە، بەڵام لەبەر ناچاری دروستە.

١٤- خواردنەوە لەشتی پیرۆز وەك: ئاوی زەمزەم سوننەتە، یا بەشتێ کە پێغەمبەر پێی خواردبێتەوە واتە: خۆ پیرۆز کردن بە شوێنەواری پیاو چاکان کارێ پەسەندە.

١٥- دەفری پاك رۆڵی نییە لە حەڵاڵیو حەرامیدا.



# ٣٨- نامەی خواردنەکان

## كِتَابُ الأطعِمَتِه

{بڕوانە: تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٥، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٥٣٧٥/١٨٠٠ هەتا ٥٤٦٦/١٨٢١ فتح + تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٦}.

### ١٠٣٤) ناوی خودا هێنان لە خواردەمەنی. (٥٢٢٧ - ٥٢٤١)

### باب: التَّسْمِيَةُ عَلَى الطَّعَامِ

١٢٩٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) طَعَامًا لَمْ نَضَعْ أَيْدِينَا حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَيَضَعَ يَدَهُ، وَإِنَّا حَضَرْنَا مَعَهُ مَرَّةً طَعَامًا، فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ كَأَنَّهَا تُدْفَعُ، فَذَهَبَتْ لِتَضَعَ يَدَهَا فِي الطَّعَامِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِيَدِهَا، ثُمَّ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ كَأَنَّمَا يُدْفَعُ، فَأَخَذَ بِيَدِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لاَ يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا، فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا، فَجَاءَ بِهَذَا الأَعْرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ، فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا». وفي رواية: ثُمَّ ذَكَرَ اسم اللهِ وَأَكَلَ ...{الحديث: ٥٢٢٧، ٥٢٢٨ = ٥٢١٨، ٥٢١٩ فم}:

**حوذەیفە** (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) نانیان دادەنا بۆمان، دەستمان نەدەبرد بۆی هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی پێ نەکردایە، جارێ لەخزمەتیدا بووین، نانیان دانا، لەوکاتەدا کچۆڵەیێ هات، دەتگوت بە پاڵ دەیهێنن، کچۆڵەکە ویستی دەست ببا بۆ نانەکە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) توند دەستی کچۆڵەکەی گرتو نەیهێشت، لەپاشا عەرەبێکی دەشتەکیش هات، ئەویش دەتگوت بە پاڵ دەیهێنن، ویستی لەنانەکە بخوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ئەویشی گرتو فەرمووی: (هەر خواردەمەنیو خۆراكو نانێ، ئەگەر لەکاتی خواردنیدا، ناوی خودای لەسەر نەبرێ،

شەیتان بە حەلاڵی دەزانێ، ئەوە بۆیە لەپێشا ئەم کچۆڵەی هێنا، هەتا نانەکەی پێ حەلاڵ بکا، بۆیە منیش دەستیم گرت، ئینجا ئەوەبوو لەپاشا ئەم عەرەبە دەشتەکییەی هێنا، تا بەو حەلاڵی بکا، ئەوەبوو دەستی ئەویشم گرت، بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، دەستی شەیتان وا لەناو دەستی ئەم کچۆڵەیەدا، کە دەستی وا لەناو دەستی مندا) لە گێڕانەوەیەکا: ئەوجا ناوی خودای هێناو دەستی کرد بە خواردن. {تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٢، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٠ ج/٤} + {ریاض الصالحین/٢، لاپەڕە: ٢٥٠، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٧٣١} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٤٨، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٧٢٨ + ٧٢٩}.

١٢٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا) أَنَّـهُ سَمِعَ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ دُخُولِهِ، وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ، وَلاَ عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ». {الحديث: ٥٢٣٠ = ٥٢٢١ فم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم بەگوێی خۆم بیستم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (پیاو کەدەچێتەوە بۆماڵەوەی، ئەگەر لەکاتی چوونە ماڵو، لەکاتی نان داناندا ناوی خودا بهێنێ، ئیتر شەیتان بەدەستەو بەستەی خۆی دەڵێ: نەجێی شەوو نەشێوتان لێرە بۆنەما، بەلام ئەگەر لەکاتی چوونە ماڵدا یادی خودا نەکا، شەیتان دەڵێ: جێگەی شەوتان دەست کەوت، جا ئەگەر لەکاتی نان خواردنیشدا، دیسان یادی خودای نەکردەوە شەیتان دەڵێ: هەم جێگەی شەوو هەم شێوتان دەست کەوت). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٧٣٠، تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٨} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٧٣٠}.

**ڕوونكردنەوە:**

١. بۆ ئەم جۆرە بابەتە (وەك لە دەلیلولفالیحیندا دەفەرموێ) ژنیش مانەندی پیاوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (النِسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجالِ: ژنان مانەندی پیاوانن).

٢. واتە: بەزاری ئەم سەردەمە، ماڵەكە دەبێ بە ئوتێلو لۆقنتەی شەیتانو شەیتان تەراتێنی تیادەكا.

٣. ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەم شوینەدا دەفەرموێ: ناوی خودا هێنان لە سەرەتای خواردنو خواردنەوەوە سوننەتە، هەروا سوپاسی خودا كردن لە كۆتایانەوە، واباشە بەدەنگی بەرز بیسمیللا بكا، هەتا ببێ بەسەر مەشق بۆ كەسانی تریش، واباشە بڵێ: (بسم الله الرحمن الرحیم) بەوەیش بڵێی: (بِسْمِ الله: بەناوی خودا) سوننەتەكە دێتەجێ، شتی حەرام نە ناوی خودای لێ دەهێنرێو نە سوپاسی لەسەر دەكرێ، ئەگەر لەسەرەتاوە ناوی خودای نەهێنا، لەوە دوایش دەبێ. ئەگەر كۆمەڵێ بوون خودی سوننەتەكە بەگوتنی یەك كەس جێبەجێ دەبێ، بەڵام هەركەسێ بۆ خۆی بیسمیللا بكا ئەوە باشترە. {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٤٨، رقم: ٧٢٩، زنجیرە: ١٠٠}.

## ١٠٣٥) خواردن بەدەستی ڕاست سوننەتە. (٥٢٢٧ - ٥٢٤١)

## باب: الأَكْلُ بِاليَمِينِ

١٢٩٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ». {الحديث: ٥٢٣٣ = ٥٢٢٤ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ كەسێ لەئێوە نان دەخوا، یا شت دەخواتەوە، سوننەتە كە بەدەستی ڕاستی شتەكە بخوا، یا شتەكە بخواتەوە، بەبێ مەهانەی ڕەوا شت بەدەستی چەپی نەخوا،

یا نەخواتەوە، هەتا نەبێ بەلاسکایی شەیتان، چونکە شەیتان بەدەستی چەپی شت دەخواو شت دەخواتەوە!. {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٤}.

١٢٩٩- عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَجُلاً أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِشِمَالِهِ، فَقَالَ: «كُلْ بِيَمِينِكَ»، قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ، قَالَ: «لاَ اسْتَطَعْتَ»، مَا مَنَعَهُ إِلاَّ الْكِبْرُ، قَالَ: فَمَا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ. {الحديث: ٥٢٣٦ = ٥٢٢٧ فم}:

ئیباسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پیاوێ لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی چەپی نانی دەخوارد، حەزرەت پێی فەرموو: (بەدەستی راستت نان بخۆ) گوتی: ناتوانم، حەزرەت پێی فەرموو: (دە هەرگیز نەتوانیت!). کابرا بەدرۆ گوتی ناتوانم، لەڕاستیدا دەعیەی نەدەهات کە بەگوێی پێغەمبەر بکا. فەرمووی: جا نزاکەی پێغەمبەری لێ گیرابوو، خودا پێی نواند، ئیتر جارێکی تر ئەو کابرایە ئەو دەستەیی بۆ نەبرا بۆدەمی). {ریاض/١، لاپەڕە: ١٤٩، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٥٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٥}.

## ١٠٣٦) بخۆر لەبەردەمی خۆیەوە بخوات. (٥٢٢٧ - ٥٢٤١)

## باب: الأكْلُ ممَّا يَلِي الآكل

١٣٠٠- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِى سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنْتُ فِى حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَكَانَتْ يَدِى تَطِيشُ فِى الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِى: «يَا غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ». {الحديث: ٥٢٣٧ = ٥٢٢٨ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ٧٩، رقم: ١٨٠١ = ٥٣٧٦، ٥٣٧٧، ٥٣٧٨}:

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: مناڵ بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەخێوی دەکردم، چونکە زڕکوڕی بووم، کوڕی ئوممو سەلەمە بووم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای

خودا لەهەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی بێ)، کە نانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو لەگەنەکەدا، بە ئارەزووی خۆم، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمێی کردمو فەرمووی پێم: (ڕۆڵە! کە نان دەخۆی لەسەرەتاوە ناوی خودا بهێنەو بیسمیلا بکەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست مەگێڕە بەملاو لادا، مەگەر لەبەر مەهانەی ڕەوا) عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر لەوساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر بیستووە، هەتا ئێستا هەر بەم شێوەیە نان دەخۆم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری کردووم). {ریاض/١/٢٥٠، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢٩٩ + ریاض/٢/٢٤٨، ژمارە: ٧٢٨، زنجیرە: ١٠٠ + تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٧}.

## ١٠٣٧) **خواردن بەسێ پەنجە**. (٥٢٦٢ - ٥٢٧٦)
## **بابٌ: الأَكْلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ**

١٣٠١- عَنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ، وَيَلْعَقُ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَمْسَحَهَا. {الحديث: ٥٢٦٥ = ٥٢٥٦ فم}:

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسێ پەنجە نانی دەخوارد، وە بەرلەوە کە دەستی بسڕێت، بە زمانی دەیلێستەوە). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٩ + تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٨، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٦}.

## ١٠٣٨) **دەست لستنەوە لەپاش خواردن**. (٥٢٦٢ - ٥٢٧٦)
## **بابٌ: إِذَا أَكَلَ فَلْيَلْعَقْ يَدَهُ أَوْ يُلْعِقْهَا**

١٣٠٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا». {الحديث: ٥٢٦٣ = ٥٢٥٤ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ نان دەخۆن دەستی خۆتان مەسڕن، هەتا خۆتان دەیلێسنەوە، یا یەکێکی تر

بۆتــانی دەلێســێتەوە). {تــاج/٣، لاپــەڕە: ٢٠٠، زنجــیرە: ١٦، ژمــارە: ٢٦٥٩} + {ریاض/٢/٢٥٩، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٨}.

## ١٠٣٩) لێستنەوەی پەنجەو حاجەتی چێشت. (٥٢٦٢ - ٥٢٧٦)

## باب: لَعْقُ الأَصَابِعِ والصَّحْفَةِ

١٣٠٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَمَرَ بِلَعْقِ الأَصَابِعِ وَالصَّحْفَةِ وَقَالَ: «إِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ فِى أَيِّهِ الْبَرَكَةُ». {الحديث: ٥٢٦٨ — ٥٢٥٩ فم}:

جـابیر (ڕەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمانی دەدا بـە لێستنەوەی دەستو پەنجەو دەوریو قاپو شتی وا، لەدوا نان خواردن، دەیفـەرموو: (چـونکە ئێـوە نـازانن کـە پیـتو فـەڕی خواردەمەنییەکـەتان بـە کامەوەیـەتی). {ریـاض/٢/٢٦٠، زنجـیرە: ١٠٩، ژمـارە: ٧٥٠} + {ریـاض/١، لاپـەڕە: ١٥١، زنجـیرە: ١٦، ژمارە: ١٦٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٨، ٧٤٩، ٧٥٠، ٧٥١ چ/٢}.

## ١٠٤٠) پاروو ئەگەر بەرەوە بوو، پاك دەكرێتەوەو دەخورێ. (٥٢٦٢ - ٥٢٧٦)

## بابٌ: مَسْحُ اللُّقمةِ إذا سقطتْ وأَكْلُها

١٣٠٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ، حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ، فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمُ اللُّقْمَةُ، فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى ثُمَّ لِيَأْكُلْهَا، وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ، فَإِذَا فَرَغَ فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِى فِى أَىِّ طَعَامِهِ تَكُونُ الْبَرَكَةُ». {الحديث: ٥٢٦٩ = ٥٢٦٠ فم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شـەیتان بۆ هەموو کاروبارێکتان دێت بۆلاتـان، جا ئەگـەر ڕێکـەوت، لـەکاتی نـان خواردنـدا، تیکـەی کەسـێکتان کەوتـە خـوارەوە، باهـەڵی بگرێتـەوەو لـە ئـازارو شـتی وا پـاکی بکاتەوەو ئینجا بیخواتو نەیهێڵێتەوە بۆ شەیتان، بخۆر کە لە نان خـواردن لێ بـۆوە

با پەنجەکانیو دەستی خۆی بلێسێتەوە، چونکە مرۆڤ نازانێ کە پیتو بەرەکەتی خواردەمەنییەکەی بە کامەوەیەتی). {تاج/١٩٩/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٧} + {ریاض/٢٦٠/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٥٢، چ/٢ = چاپی دووەم}.

## ١٠٤١) سوپاسی خودای گەورە لەسەر خواردنو خواردنەوە. (٦٨٦٨)

## باب: فِی الحَمْدِ للّه عَلَى الأَكْلِ والشُّرْبِ

١٣٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا». {الحديث: ٦٨٦٨}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە خۆشنوود دەبێ، لەبەندەی خۆی، بەوە: کە کاتێ بەندە شتێ دەخوا، یا شتێ دەخواتەوە، سوپاسی خودای لەسەر بکا).

## ١٠٤٢) خواردنو خواردنەوە نازو نیعمەتن پرسیاریان لێ دەکرێتەوە. (٥٢٨١ - ٥٢٩٢)

## باب: السُّؤَالُ عَنْ نَعِيمِ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ

١٣٠٦- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ لَيْلَةٍ، فَإِذَا هُوَ بِأَبِی بَكْرٍ وَعُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فَقَالَ: «مَا أَخْرَجَكُمَا مِنْ بُيُوتِكُمَا هَذِهِ السَّاعَةَ»؟ قَالاَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «وَأَنَا وَالَّذِی نَفْسِی بِيَدِهِ لأَخْرَجَنِی الَّذِی أَخْرَجَكُمَا، قُومُوا»، فَقَامُوا مَعَهُ، فَأَتَى رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَإِذَا هُوَ لَيْسَ فِی بَيْتِهِ، فَلَمَّا رَأَتْهُ الْمَرْأَةُ قَالَتْ: مَرْحَبًا وَأَهْلاً، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَيْنَ فُلاَنٌ»؟ قَالَتْ: ذَهَبَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا مِنَ الْمَاءِ، إِذْ جَاءَ الأَنْصَارِیُّ، فَنَظَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَصَاحِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، مَا أَحَدٌ الْيَوْمَ أَكْرَمَ أَضْيَافًا مِنِّی، قَالَ: فَانْطَلَقَ فَجَاءَهُمْ بِعِذْقٍ فِيهِ بُسْرٌ، وَتَمْرٌ، وَرُطَبٌ، فَقَالَ: كُلُوا مِنْ هَذِهِ، وَأَخَذَ الْمُدْيَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ»، فَذَبَحَ لَهُمْ.

فَأَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ، وَمِنْ ذَلِكَ الْعِذْقِ، وَشَرِبُوا، فَلَمَّا أَنْ شَبِعُوا وَرَوُوا، قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُسْأَلُنَّ عَنْ هَذَا النَّعِيمِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمُ الْجُوعُ، ثُمَّ لَمْ تَرْجِعُوا، حَتَّى أَصَابَكُمْ هَذَا النَّعِيمُ». {الحديث: ٥٢٨١ = ٥٢٧٢ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ یان شەوێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتێکی وادا لەماڵ دەردەچێ کە عادەتی نابێ لەو ساتەدا لەماڵ دەربچێ، یا کەس لەوکاتەدا بچێ بۆلای، جا ئەبوبەکرو عومەر هاتن بۆلای، پێی فەرموون: (لەم دەمو ساتەدا چی ئێوەی لەماڵ هێنایە دەرێ؟). فەرموویان: برسێتی، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەوەی کە ئێوەی لەماڵ هێناوەتە دەرێ، هەمان شتیش منی هێناوەتە دەرێ) ئەنجا هەڵسان چوون بۆ ماڵی ئەبو هەیسەمی کوڕی تەییهانی ئەنصاری. ئەم پیاوە باخە خورماو رانە مەڕی زۆری هەبوو، بەڵام نۆکەری نەبوو، کەچوون خۆی لەماڵ نەبوو، کە ژنەکەی پێغەمبەری بینی، گوتی: بەخێربێن، ماڵ ماڵی خۆتانە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەژنەکەی فەرموو: (مێردەکەت لەکوێیە، ئەبو هەیسەمی مێردت لەکوێیە؟) گوتی: چووە ئاوی خواردنەوەمان بۆ بهێنێ، زۆری پێ نەچوو کە ئەبو هەیسەم هاتەوە، کوندەیە ئاوی بەکۆڵەوە بوو، کوندەکەی داناو تەماشای کردنو دەستی کردە ملی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و خۆشو چۆنی لەگەڵ کردنو خۆش خۆش بە پێغەمبەری دەفەرموو: (باوكو دایكم بەقوربانت بن). ئەوجا فەرمووی: سوپاس بۆ خودا، ئەمڕۆ هیچ کەسێ وەك من میوانی بەڕێزو ئازیزی نییە.

فەرمووی: جا ئەبو هەیسەم چوو لەباخەکە هێشوویێ خورمای هێناو داینا بۆیان، هاڵەی مزرو خورماو فەریکە خورمای پێوە بوو، عەرزیکردن: بفەرموون لەمە بخۆن، ئیتر لێیان خواردو لە ئاوی کوندەکەیان کرد بەسەریدا، ئەوجا ئەبو هەیسەم، پەلاماریدا کە نانیان بۆ دروست بکا، کێردێکی هەڵگرت ئاژەڵێ سەربڕێ بۆ قاوەڵتوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (نەکەی ئاژەڵی شیردار

سەربڕی). گێسکە مێیەکی سەربڕی بۆیان، دروستی کردو هێنای داینا بۆیان، کاتێ لەگۆشتی گیسکەکەیان خواردو لەو هێشووە خورمایان خواردو لەو ئاوە سازگارەیان خواردەوەو کەتێرو پاراو بوون لەو نان‌و ئاوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ): (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، لەڕۆژی قیامەتا، پرسیارتان لێ دەکرێ لەم نازو نیعمەتەی کە ئێستا خواردتان‌و خواردتانەوە، برسێتی لە ماڵ دەریپەڕاندن‌و لەپاشا نەگەڕانەوە هەتا ئەم بەهرەو نازو نیعمەتەتان بوو بەنسیب). {تاج/٥، لاپەڕە: ٣٠٨، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٤م}.

## ١٠٤٣) وەڵامدانەوەی دەعوەتی دراوسێ بۆسەر نان خواردن. (٥٢٧٧ - ٥٢٨٠)
## باب: إجابةُ دعْوَةِ الجَارِ للطَّعَامِ

١٣٠٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ جَارًا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَارِسِيًّا كَانَ طَيِّبَ الْمَرَقِ، فَصَنَعَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ جَاءَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ: «وَهَذِهِ؟» لِعَائِشَةَ، فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ»، فَعَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَهَذِهِ»؟ قَالَ: لاَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ»، ثُمَّ عَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَهَذِهِ»؟ قَالَ: نَعَمْ، فِي الثَّالِثَةِ، فَقَامَا يَتَدَافَعَانِ حَتَّى أَتَيَا مَنْزِلَهُ. {الحديث: ٥٢٨٠ = ٥٢٧١ فم}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دراوسێیەکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فارسی بوو، مەرگەی خۆشی لێدەنا، ڕۆژێ مەرگەیێ سازدەکا، ئەوجا دەچێ خوڵکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا بۆ نان خواردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (عائیشەی هاوسەریشم بێت؟) کابرا گوتی: نەخەیر، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دە منیش نەخەیر نایەم) دیسان کابرا خوڵکی پێغەمبەری کردەوە، دیسان پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (عائیشەی هاوسەریشم بێت؟) دیسان کابرا گوتیەوە: نەخەیر بانەیێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (دە بەبێ ئەو منیش نایەم) جا بۆجاری سێیەم خوڵکی پێغەمبەری

كـردەوە، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرمووەوە: (عائیشـەی هاوسەریشـم بێت لەگەڵما؟) لەسەری جاری سێیەما پیاوەکە گوتی: بـەڵێ عائیشـەیش بێت، جا پێغەمبەرو عائیشە هەڵسانو بەرەو ماڵی کابرای فارسی، خێرا ڕۆیشتن).

## ١٠٤٤) کەسێ دەعوەت کرابێو کەسێ تر شوێنی بکەوێ. (٥٢٧٧ - ٥٢٨٨)
## بابٌ: مَنْ دُعِيَ إلى طعامٍ فتبعهُ غيرُهُ

١٣٠٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَـانَ رَجُـلٌ مِـنَ الأَنْصَـارِ، يُقَالُ لَهُ (أَبُو شُعَيْبٍ)، وَكَانَ لَهُ غُلَامٌ لَحَّـامٌ، فَـرَأَى رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، فَعَرَفَ فِي وَجْهِهِ الْجُوعَ، فَقَالَ لِغُلَامِـهِ: وَيْحَكَ اصْنَعْ لَنَا طَعَامًا، لِخَمْسَةِ نَفَرٍ، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَامِسَ خَمْسَةٍ، قَالَ: فَصَنَعَ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَاهُ خَامِسَ خَمْسَةٍ، وَاتَّبَعَهُمْ رَجُلٌ، فَلَمَّا بَلَغَ الْبَابَ قَـالَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ هَذَا اتَّبَعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ رَجَعَ»؟ قَالَ: لَا بَلْ آذَنُ لَـهُ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ. {الحـديث: ٥٢٧٧ = ٥٢٨٨ فـم. تجريـد/٥/٨٧، رقـم: ١٨١٤ = ٥٤٣٤، ٢٠٨١، ٢٤٥٦، ٥٤٦١. ترمذي. نكاح: ١٠٩٩. تحفة الأشراف: ٩٩٩٠}:

ئەبو مەسعوودی بەدری ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێکی ئەنصـاری، ناوی ئەبو شوعەیب بوو، خولامێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، کاتێ پێغەمبـەری بینـی ڕوانی نیشانەی برسێتی لەڕووی دیارە، بە خولامەکەی خۆی فەرموو: (داماو نـەبی! نانێ دروست بکە، بەشی پێنج کەس بکات، من دەمەوێ پێغەمبەرو چوار کەسی تر خولك بکەم). فەرمووی: ئەویش نانەکەی دروست کرد، ئەوجا ئەبو شوعەیب چوو بۆلای پێغەمبەرو لەگەڵ چوار کەسی تردا خولکی کردن بۆ نان خواردن، جا کاتـێ کەوتنــە ڕێ، پیـاوێ تـریش شـوێنیان کـەوت، کـە گەیشـتنە بـەردەرگای ماڵەکـە، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەخاوەن ماڵەکـەی فـەرموو: (ئـەم پیـاوە شـوێنمان کەوتووە، کە تۆ خولکت کردین ئەومان لەگەڵ نەبوو، جا ئەگەر ڕێـی دەدەی ئـەوا دێتـە ژوورەوە، ئەگـەر حـەزیش نەکـەیت ئـەوا دەگەڕێتـەوە؟). (خانـە خوێکـەیش گوتی: قوربان! ڕێگەی ئەدەم). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٧٣٩}.

## ١٠٤٥) پێشخستنی میوان. (٥٣٢٧ - ٥٣٣٤)
## بَابٌ: فِي إِيثَارِ الضَّيْفِ

١٣٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي مَجْهُودٌ، فَأَرْسَلَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلاَّ مَاءٌ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُخْرَى، فَقَالَتْ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى قُلْنَ كُلُّهُنَّ مِثْلَ ذَلِكَ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلاَّ مَاءٌ، فَقَالَ: «مَنْ يُضِيفُ هَذَا اللَّيْلَةَ رَحِمَهُ اللَّهُ تعالى»، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَحْلِهِ، فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لاَ إِلاَّ قُوتُ صِبْيَانِي، قَالَ: فَعَلِّلِيهِمْ بِشَيْءٍ، فَإِذَا دَخَلَ ضَيْفُنَا، فَأَطْفِئِي السِّرَاجَ، وَأَرِيهِ أَنَّا نَأْكُلُ، فَإِذَا أَهْوَى لِيَأْكُلَ فَقُومِي إِلَى السِّرَاجِ حَتَّى تُطْفِئِيهِ، قَالَ: فَقَعَدُوا وَأَكَلَ الضَّيْفُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، غَدَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «قَدْ عَجِبَ اللَّهُ مِنْ صَنِيعِكُمَا بِضَيْفِكُمَا اللَّيْلَةَ». {الحديث: ٥٣٢٧ = ٥٣١٨ فم. تجريد/٤/١٧٤، رقم: ١٤٨٩، ٣٧٩٨، ٤٨٨٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ عارەبێکی سارا نشین، هات بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبرسانا لاکەی سەرم دێ! ئەویش یەکە یەکە ناردی بۆ خواردن بۆلای هاوسەرەکانی خۆی (ڕەزای خودایان لێ بێ) بەڵام هیچی لێ هەڵنەکڕانن، یەکە یەکە فەرموویان: سوێندم بەو خودایەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری ڕاستو دروست، ئاوی لێ دەرچێ هیچی تر گومان نابەم، ئەوجا فەرمووی: (ئای بۆ پیاوێ، ئەم شەو داڵدەی ئەم پیاوە بداو میوانداریی پێ بکا، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)!.

پیاوێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەمشەو میوانداریی پێ دەکەم، جا بردیەوە بۆ ماڵەوە، بەژنەکەی خۆی گوت: ئەمە میوانی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ درێغی لەگەڵ مەکە، ژنەکەی گوتی: باشە، بەڵام بەخودا بەس خواردنی مناڵەکان گومان دەبەم. گوتی: کاتێ مناڵەکان داوای شێویان کرد، گورگانە شەوێیان بۆ بکەو بیانخەوێنەو کە نانەکەت بۆ ئێمە دانا، بە بیانووی چرا چاك کردنەوە خۆشت وەرەو چراکە بکوژێنە، وا خۆمان پیشان

دەدەیمـەن کـە ئێمـەیش لەگەڵیـدا دەخـۆین، ئـەم شـەو خۆمـان بەسـکی خـاڵی شـەو دەکەینەوە، با میوانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێ خزمـەت نـەبێ‌و نانەکـەی بەتێرو تەسەلی بخوا، شەوێ هەر شەوێکە، هەرچۆنێ بێ دەڕوا، ژنەکەیشی وایکـرد، جا بۆ بەیانی کە پیاوەکە چۆوە بۆ خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەڕاستی خودای گەورە، ئەم شەو سـەیری هـات لـەوکارە جوانـەی کەئێوە هەردوکتان کردتان لەگەڵ میوانەکەتانا). {تاج/٤/٥١٤، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٤١٦٢}.

## ١٠٤٦) خواردەمەنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکا. (٥٣٣٥ - ٥٣٣٩)

## باب: طَعَامُ الإثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَة

١٣١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «طَعَامُ الاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ وَطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ». {الحديث: ٥٣٣٥ = ٥٣٢٦ فم. تجريد/٥/٨١، رقم: ١٨٠٤ = ٥٣٩٢. ابن ماجة. أطعمة: ٣٢٥٤. تحفة الأشراف: ٢٨٢٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نانی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکا، وەنـانی سـێ کـەس بەشـی چـوارکەس دەکـا). {ریـاض/٢/٢٦٢، زنجـیرە: ١١٠، ژمـارە: ٧٥٥ + ژمـارە: ٧٥٦ + تـاج/٣/٢١٢، زنجـیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٦٩٥}.

١٣١١- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الاثْنَيْنِ يَكْفِي الأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الأَرْبَعَةِ يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ». {الحديث: ٥٣٣٦ = ٥٣٢٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نانی یەك کەس بەشی دوو کەس دەکا، وەنانی دوو کـەس بەشـی چـوار کەس دەکـا، وەنـانی چـوار کـەس بەشـی هەشـت کـەس دەکـا). {تـاج/٣، لاپـەڕە: ٢١٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٦٩٥}.

**١٠٤٧) موسوڵمان کەمخۆرەو بەقنیاتە، بێبڕوا چاو برسییە.** (٥٣٤٠ - ٥٣٤٧)

**بابٌ: المُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِى مِعًى وَاحِدٍ وَالكافِرُ يَأْكُلُ فِى سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ**

١٣١٢- عَنْ جَابِرٍ وَابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِى مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِى سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ». {الحديث: ٥٣٤٣ = ٥٣٣٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو زۆری دەخوارد، کاتێ موسوڵمان بوو، کەمخۆر بوو، کە ئەمەیان عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (موسوڵمان کەمخۆرەو بە قەناعەتەو خواردنی بەپیتو فەرە، بەلام کافرو بێ بڕوا چاو برسییەو سکەڕۆو سکدڕاوەو خواردنی بێ پیتو فەرە، بۆیە هەردەخواو هەر تێر نابێ، وەك حەوت ورگی هەبێ وایە). {تاج/٣/١٩٧، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٤} + {تەجرید/٥/٨١، ژمارە: ١٨٠٥ = ٥٣٩٤، ٥٣٩٣، ٥٣٩٥}.

١٣١٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَافَهُ ضَيْفٌ وَهُوَ كَافِرٌ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَاةٍ، فَحُلِبَتْ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ، حَتَّى شَرِبَ حِلاَبَ سَبْعِ شِيَاهٍ، ثُمَّ إِنَّهُ أَصْبَحَ، فَأَسْلَمَ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَاةٍ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِأُخْرَى فَلَمْ يَسْتَتِمَّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمُؤْمِنُ يَشْرَبُ فِى مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَشْرَبُ فِى سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ». {الحديث: ٥٣٤٧ = ٥٣٣٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی بێباوەڕ (کافر) بوو بەمیوانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیکرد بزنێکیان بۆ دۆشیو شیرەکەیان هێنا بۆی، ئەویش خواردیەوە، پاشان بزنێکی تریشیان دۆشی بۆی، ئەویشی خواردەوە، تا لەسەر ئەو حاڵە شیری حەوت بزنی خواردەوە، بۆ سبەینێ پیاوەکە ئیسلام بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بزنێکیان بۆ دۆشی، شیرەکەی خواردەوە، فەرمانی کرد بزنێکی تریشیان دۆشی بۆی، بەلام بۆی تەواو نەکرا، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موسوڵمان بۆ شت خواردنەوە یەك سکی هەیە، بەلام

بێباوەڕ (کافر) دەڵێی حەوت سکی هەیەو هەر حەوتیان پڕدەکا). {تاج/٣/١٩٨، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٥}.

## ١٠٤٨) باسی خواردنی کوولەکە. (٥٢٩٣ - ٥٢٩٥)

## بابٌ: فِي أَكْلِ الدُّبَّاءِ

١٣١٤- عَنْ أَنَسِ بن مالك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلٌ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجِيءَ بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبَّاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْكُلُ مِنْ ذَلِكَ الدُّبَّاءِ وَيُعْجِبُهُ، قَالَ: فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ جَعَلْتُ أُلْقِيهِ إِلَيْهِ وَلاَ أَطْعَمُهُ، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: فَمَا زِلْتُ بَعْدُ يُعْجِبُنِي الدُّبَّاءُ. {الحديث: ٥٢٩٤ = ٥٢٨٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەرگدروویێ نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و بانگی کرد. فەرمووی: منیش لەگەڵ حەزرەتدا چووم، کە نانەکەی دانا، برێتی بوو لەنانی جۆو مەرگەی کوولەکەو لەتکە گۆشت، سەرنجمدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەملاو لای لەگەنەکەوە کوولەکەی دەچنییەوەو دەیخوارد، ئیتر منیش لەو رۆژەوە هەتا ئێستا حەزم لە کوولەکەکەیە). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢١٧، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٧٠٧ – ش/د/ت/ن}.

ئەمەی سەرەوە گێڕانەوەی ژمارە: ٥٢٩٣ی موسلیمە، ئەمەیش گێڕانەوەی ئێرەیە. {تەجرید/٣/٢٣، ژمارە: ٩٥٠ = ٢٠٩٢ فتح الباری}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەرو بانگی کرد، منیش لەگەڵیدا چووم، مەرگەیەکیان دانا، کوولەکەی تیادابوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە کوولەکەکەی دەخواردو حەزی لێی بوو، منیش کە ئەوەم رەچاو کرد، کوولەکەکەم دەخستە بەردەمی پێغەمبەرو خۆم نەمدەخوارد. ئەنەس فەرمووی: ئیتر لەوساوە من حەزم لە کوولەکەیە).

## ١٠٤٩) سركه پێخۆری چاكه. (٥٣٠٠ - ٥٣٢٣)

## باب: نِعْمَ الإِدَامُ الخَلُّ

١٣١٥- عَنْ طَلْحَةُ بْنُ نَافِعٍ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِي ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَأَخْرَجَ إِلَيْهِ فِلَقًا مِنْ خُبْزٍ فَقَالَ: «مَا مِنْ أُدُمٍ»؟ فَقَالُوا: لاَ إِلاَّ شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ، قَالَ: «فَإِنَّ الْخَلَّ نِعْمَ الأُدُمُ»، قَالَ جَابِرٌ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). وَقَالَ طَلْحَةُ: مَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ جَابِرٍ. {الحديث: ٥٣٢١ = ٥٣١٢ فم}:

تەلحەی كوڕی نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جابیری كوڕی عەبدوللاّ (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتم‌و بردمی بۆ ماڵی خۆیان، نۆكەرەكە چەند پارچەیێ كولێرەی بۆمان هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا پێخۆر هەیە كە بەم نانەوە بیخۆین؟) گوتیان: نەء، بەس تۆزێ سركە هەیە، فەرمووی: (بیهێنن، سركە پێخۆری چاكە!). جابیر فەرمووی: ئەوەتی ئەم گوتەیەم، لە وەسپی سركەدا، لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، سركەم خۆش دەوێ، تەلحەیش فەرمووی: ئەوەتی ئەم فەرموودەیەم لەجابیر بیستووە حەزم لەسركەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٧١٥، ٢٧١٦ چ/٤} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٥٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٧٣٧}.

## ١٠١٠) خواردنی خورماو كۆكردنەوەی ناوكەكەی لەنێوانی دوو پەنجەدا. (٥٢٩٦ - ٥٢٩٧)

## باب: فِي أَكْلِ التَّمْرِ وَإِلْقَاءِ النَّوَى بَيْنَ الإِصْبَعَيْنِ

١٣١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أَبِي، قَالَ: فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَامًا وَوَطْبَةً، فَأَكَلَ مِنْهَا، ثُمَّ أُتِيَ بِتَمْرٍ، فَكَانَ يَأْكُلُهُ وَيُلْقِي النَّوَى بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، وَيَجْمَعُ السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى، قَالَ شُعْبَةُ: هُوَ ظَنِّي، وَهُوَ فِيهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ إِلْقَاءُ النَّوَى بَيْنَ الإِصْبَعَيْنِ، ثُمَّ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الَّذِي عَنْ يَمِينِهِ،

قَالَ: فَقَالَ أَبِي وَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ: ادْعُ اللَّهَ لَنَا، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مَا رَزَقْتَهُمْ وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ». {الحديث: ٥٢٩٦ = ٥٢٨٧ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی بوسر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بوو** بەمیوانی باوکم، خواردەمەنیو خورماو کەشكو رۆنمان بۆ دانا، لێی نۆش کرد، پاشان خورمایان بۆدانا، لێی دەخواردو ناوکەکەی لەنێوانی دوو پەنجەیدا کۆدەکردەوە، کە پەنجەی شایەتمانو پەنجەی ناوەڕاستی بوو، تا لەپاشا، لە جێگەیەکی گونجاودا فڕێی دا.

شوعبە، کە لەڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا، مامۆستای مامۆستاکەی موسلیمە، دەفەرموێ: گومانی بەهێزم وایە، کە لە دەق (مەتن)ی ئەم فەرموودەیەدا، خودا یاربێ، ئەوەی تیایە کە دەفەرموێ: (... ناوکەکەی لەنێوانی دوو پەنجەیدا کۆدەکردەوە، کە پەنجەی شایەتمانو پەنجەی ناوەڕاستی بوو، تا لەپاشا، لە جێگەیەکی گونجاودا فڕێی دا). فەرمووی: ئەوجا خواردنەوەیەکی حەڵاڵیان بۆیهێنا، لێی خواردەوەو دایە دەستی ئەو کەسەی کە لەلای راستیەوە بوو، تا لێی بخواتەوەو جامەکەی بەلای راستا بگەڕێ. باوکم لەوکاتەدا کە لغاوی وڵاخەکەیی گرتبوو بۆی، عەرزی کرد: (قوربان! نزامان بۆ بکەو بۆمان بپاڕێرەوە!) ئەویش فەرمووی: (ئەی خودایە! پیتو فەڕ بخەرە ئەو رزقو رۆزییەی کەپێت بەخشیونو، لێیان خۆشبەو رەحمیان پێ بکە).

**روونکردنەوە:**

١- **عەبدوڵڵای کوڕی بوسری ئەل-مازنی** (رەزای خودای لێ بێ) **خۆیو باوکیو دایکیو** عەطیەی برایو صەممای برای، هەر پێنجیان هاوەڵ (واتە: صەحابە)ی پێغەمبەر بوون، لە حیمص لە تەمەنی نەوەدو چوارساڵیدا، لەساڵی هەشتاو هەشتی کۆچیدا مردووە، لەپیاوان (ریجال)ی صەحیحەینە لە بوخاریدا یەك فەرموودەی هەیە، کە فەرموودەی ژمارە: (١٤١٤ تجرید = ٣٥٤٦ فتح الباری).

## ١٠١١) خواردنى خورما به چيچكانەوە. (٥٢٩٩ - ٥٣٠٠)
## بابٌ: أَكْلُ التَّمْرِ مُقْعِياً

١٣١٧- عَنْ أَنَسِ بن مالك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَمْرٍ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْسِمُهُ وَهُوَ مُحْتَفِزٌ يَأْكُلُ مِنْهُ أَكْلاً ذَرِيعًا، وَفِي رِوَايَةٍ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُقْعِيًا يَأْكُلُ تَمْرًا. {الحديث: ٥٢٩٩ = ٥٢٩٠ فم}:

ئەنەسى كوڕى ماليك (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەرم بينى (دروودى خوداى لەسەر بێ) بە چيچكانەوە خورماى دەخوارد). {تاج/٣/١٩٥، زنجيرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٨ چ/٤} + {رياض/٢، لاپەڕە: ٢٥٨، رقم: ٧٤٧، زنجيرە: ١٠٨}.

گێڕانەوەى ئێرە ئاوايە: ئەنەس دەفەرموێ: خورمايان بۆ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) هێنا، ئەويش بە قنچكانەوە بە پەلە دابەشى دەكرد بەسەر كەسانى شياودا، بەپەلە پەل خۆشى لێى دەخوارد).

## ١٠١٢) ئەو ماڵەى كە خورماى تيانەبێ، خەڵكەكەى برسين. (٥٣٠٤ - ٥٣٠٥)
## باب: بَيْتٌ لا تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ

١٣١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ:قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):«يَا عَائِشَةُ بَيْتٌ لاَ تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ،يَا عَائِشَةُ بَيْتٌ لاَ تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ، أَوْ جَاعَ أَهْلُهُ»، قَالَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. {الحديث: ٥٣٠٥ = ٥٢٩٦ فم}:

عائيشەى هاوسەرى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێو رەزاى خودا لەگشت هاوسەرەكانى بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (ئەى عائيشە! ئەو ماڵەى كە خورماى تيانەبێ، خەڵكەكەى برسين!). فەرمووى: دووجار، يا سێجار، لەسەر يەك واى فەرموو، يا فەرمووى: (خەڵكەكەى برسييان دەبێ!). {تاج/٣/٢٢٣، زنجيرە: ٢٢، ژمارە: ٢٧٢٢}.

**روونكردنەوە:**

مەبەست لەم فەرموودەیە پەسنی جوانی خورمایە، لەگەڵ روونكردنەوەی ئەوەدا: كە زەخیرە خستن، بۆ خێزانو ماڵو میوان كارێكی رەوایەو ئیشێكی فرە خاسە، واباشە مرۆڤ لەم لایەنەوە درێغی نەكاو قایمەكاری بكا، بەپێی باوی جوانی ناو كۆمەڵ، واباشە لەهەر وڵاتێ چی قووتو بژێوی سەرەكی بێ، وەك خورما لە دوورگەی عەرەبا، گەنمو جۆ لە كوردستانی خۆمانا، برنج لە هەندێ وڵاتی تردا، واباشە كە مرۆڤ لەو بژێوییە باوە قایمە بكا، لەسەر ئەم بنەمایە، خەڵكی هەورامان بۆیان هەیە بڵێن: ماڵێ گوێزی تیانەبێ خەڵكەكەی برسییە. لە مامۆستاكانی خۆمم بیستووە (رەحمەتی خودایان لێ بێ)، كە مەلا ئەحمەدی نۆدشە هەڵە لە ئیمامی شافیعی دەگرێ، دەفەرموێ: توویش قووتە، لەبەرئەوە زەكاتی لێ دەكەوێ، شافیعی (رەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: زەكات لەتوو ناكەوێ، چونكە مرۆڤی پێ ناژی، تاساڵێ گرانی دەبێ، خەڵكەكە هەر توو دەخۆن هیچی تریان دەست ناكەوێ، بەهۆی ئەوەوە تووشی سكچوونێكی سەختی وادەبن كە لێیان دەمرێ، ئەوكاتە مەلا ئەحمەدی نۆدشە پەشیمان دەبێتەوەو لەپیسایی مردووەكان دەدا لەریشی خۆیو دەفەرموێ: جارێ تر هەڵەی واناكەم كە هەڵە لەسەر مەزهەبی خۆم بگرم. هەزار (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەهەموو لایەكیان.

**١٠١٣) رێگری لە خواردنی خورما دوو دەنك دوو دەنك پێكەوە.** (٥٣٠١ - ٥٣٠٣)

**باب: النهي عن القِرَنِ في التَّمْر**

١٣١٩- عَنْ جَبَلَةَ بْنَ سُحَيْمٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ أَصَابَ النَّاسَ يَوْمَئِذٍ جُهْدٌ، وَكُنَّا نَأْكُلُ، فَيَمُرُّ عَلَيْنَا ابْنُ عُمَرَ وَنَحْنُ نَأْكُلُ فَيَقُولُ: لاَ تُقَارِنُوا فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى عَنِ الإِقْرَانِ، إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ، قَالَ شُعْبَةُ: لاَ أُرَى هَذِهِ الْكَلِمَةَ إِلاَّ مِنْ كَلِمَةِ ابْنِ عُمَرَ. يَعْنِي الاِسْتِئْذَانَ. {الحديث ٥٣٠١ = ٥٢٩٢ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٥٨، ژمارە: ١٠٦٥ = ٢٤٥٠٠، ٢٤٨٩، ٢٤٩٠. أبو داود. أطعمة: ٢٨٣٤. ترمذي. أطعمة: ١٨١٤} :

جەبەلـەی کـوڕی سـوحەیم فـەرمووی: سـاڵێ گرانـی بـوو، لـەکاتی جێنشـینی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا، لەسەر وڵاتـی حیجاز، لـەباتی پـارەی مووچـەی سـاڵانە، ئیبنو زوبەیر خورمای پێمانـدا، ئێمـەیش دەمـانخوارد، جاری وادەبـوو، عەبـدوڵڵای کوڕی عومەر تێدەپەڕی بەلامانا، لەوکاتەدا ئێمە خـەریکی خورمـا خـواردن بـووین، دەیفەرموو: (جووت جووت مەخۆن) چونکە خۆشەویسـت (دروودی خودای لەسەر بێ) نـەهیی دەکرد لەوە کە مرۆڤ دوو دەنك دوو دەنك خورما پێکەوە بخوا، مەگـەر بەمـەرجێ هاوڕێکانی ڕێگەی ئەوەی پێ بدەن.

شـوعبە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) کـە کەسـی سـێیەمە، لـە ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـەدا، دەفەرموێ: (ئەوەی کە دەفەرموێ: مەگەر بە مەرجێ هاوڕێکانی ڕێگەی ئەوەی پـێ بدەن، وا دەزانم ئەم ڕستەیە قسەی ئیبنـو عومـەر خۆیـەتی). {تـاج/٣، زنجـیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٦٩٨} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٥٤، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٧٣٩}.

## ١٠١٤) خواردنی خەیارو ڕوتاب. (٥٢٩٨)

## بابٌ: أَكْلُ القِثَّاءِ بِالرُّطَبِ

١٣٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْكُلُ الْقُثَّاءَ بِالرُّطَبِ. {الحديث: ٥٢٩٨ = ٥٢٨٩ فـم. تجريـد/٥/٨٧، رقـم: ١٨١٥ = ٥٤٤٠، ٥٤٤٧، ٥٤٤٩. أبو داود. أطعمة: ٣٨٣٥. ترمذي. أطعمة: ١٨٤٤. ابن ماجة. أطعمة: ٣٣٢٥. تحفة أشراف/٥٢١٩}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی جەعفـەری کـوڕی ئـەبو طالیـب (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: (پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) تروزی بە فەریکە خورما (ڕوتاب)ەوە دەخوارد). {تـاج/٣/٣٥٩، زنجیرە: ٧١، ژمـارە: ٣٠١٤} + {تـاج/٣، لاپـەڕە: ٢١٨، زنجـیرە: ٢١، ژمـارە: ٢٧٠٨}.

**روونكردنەوە:**

**أ/ ئـەم فەرموودەيـە (مُتفَـقٌ علَيْـهِ)ييـە، رشـتەكەی لـە رشـتە چـوارينەكانی بوخاریو موسليمە، رشتەكەی لە بوخاريدا ئاوايە:**

**١- مامۆستای بوخاری، ناوی عەبدولعەزيزی كوڕی عەبدوڵلايە.**

**٢- مامۆستای مامۆستاكەی ناوی ئيبراهيمی كوڕی سەعدی كوڕی ئيبراهيمە.**

**٣- سەعدی كوڕی ئيبراهيم، كە باوكی ئيبراهيمی ناوبراوە.**

**٤- عەبدوڵلای كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبو طاليب.**

**لە موسليمدا رشتەكە ئاوايە:**

**١- مامۆستای موسليم، ناوی يەحيای كوڕی يەحيای تەميمیيە.**

**٢- ئيبراهيمی كوڕی سەعدی كوڕی ئيبراهيم.**

**٣- سەعدی كوڕی ئيبراهيم، كە باوكی ئيبراهيمی ناوبراوە.**

**٤- عەبدوڵلای كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبو طاليب.**

**ب/ دەق (مەتن)ی فەرموودەكە لە بوخاريدا ئاوايە:**

**{رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّـاءِ} . لـە موسـليما ئاوايـە: {رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ} .**

**رەچاوكردنی ئەم جۆرە جياوازييە لەفظييە، كە كاريگەری لەواتادا نييە، زيانی نييە، ئەمەيش پەيوەندی بە كۆمەڵێ ڕێساو ياساوە هەيـە، كـە لێـرەدا مـەودای ئـەو درێژە كاريە نييە.**

## ١٠١٥) بەری دار سيواك. (٥٣١٧)

## باب: فِي الْكَبَاثِ الأَسْوَدِ

**١٣٢١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّـا مَـعَ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِ(مَرِّ الظَّهْرَانِ) وَنَحْنُ نَجْنِي الْكَبَاثَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ مِنْهُ»، قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّكَ رَعَيْـتَ الْغَـنَمَ؟ قَـالَ: «نَعَـمْ وَهَـلْ**

مِـنْ نَبِـيّ إلاَّ وَقَـدْ رَعَاهَـا»؟ أَوْ نَحْـوَ هَـذَا مِـنَ الْقَـوْلِ. {الحـديث: ٥٣١٧ = ٥٣٠٨ فـم. تجريد/٤/٤٨، رقم: ١٣٦٠ = ٣٤٠٦، ٥٤٥٣. تحفة الأشراف/٣١٥٥}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: جارێ لەمـەڕو ظـەهران، لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا بـووین (درودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەری دار سـیواکمان دەڕنـی، خۆشەویسـت (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ڕەشـەکەی بـڕنن، ڕەشـەکەی خۆشـە) عـەرزمانکرد: قوربـان! دەڵێـی شـوانی رانـت کـردووە، کـەوا باشـی لێ دەزانیـت؟ فـەرمووی: (بـەڵێ رانم لەوەڕانـدووە، بۆچـی پێغەمبـەر هەیـە کـە شـوانیی رانـی نەکردبێ؟). {تاج/٣، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٧١٠}.

## ١٠١٦) **خواردنی گۆشتی کەروێشك**. (٥٠٢٢)

## بابٌ: أَكْلُ الأَرْنَبِ

١٣٢٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَـالَ: مَرَرْنـا فَاسْـتَنْفَجْنَا أَرْنَبًـا بِ(مَـرِّ الظَّهْرَانِ)، فَسَعَوْا عَلَيْهِ، فَلَغِبُـوا، قَـالَ: فَسَـعَيْتُ حَتَّـى أَدْرَكْتُهَـا، فَأَتَيْـتُ بِهَـا أَبَـا طَلْحَـةَ، فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِوَرِكِهَا وَفَخِذَيْهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَتَيْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَبِلَهُ. {الحديث: ٥٠٢٢ = ٥٠٠٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩٧ = ٢٥٧٢، ٥٤٨٩، ٥٥٣٥. أبـو داود. أطعمـة: ٣٧٩١. ترمـذي. أطعمـة: ١٧٨٩. نسـائي. صيدو ذبائح: ٤٣٢٢. ابن ماجة. صيد: ٣٢٤٣. تحفة الأَشْرَافِ: ١٦٢٩}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەمەڕو ظـەهـران کەروێشکێکمان هەڵسان، کوڕ گەل نیشتنە سەری تا مانـدوو بـوون، بـەڵام مـن نیشـتمە سـەری هـەتا گرتم، ئەوجا بردم بۆ ئـەبوطـەلحەی زڕبـابم، ئـەبو طـەلحـە سـەری بـڕیو هـەردوو سمتەکەیو هەردوو رانەکـەی نـارد بـۆ پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) مـن بـۆیم بـرد، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) وەری گـرت). {تـاج/٣، لاپـەڕە: ١٤٩، زنجـیرە: ١، ژمـارە: ٢٥٥١}.

## ١٠١٧) خواردنی گۆشتی بزن مژه. (٥٠٠١ - ٥٠١٨)

## باب: في أكْلِ الضَّبّ

١٣٢٣- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ: أَخْبَرَهُ أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (رَضيَ اللهُ عَنْـهُ) (الَّـذِي يُقَالُ لَهُ: سَيْفُ اللَّهِ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) عَلَـى مَيْمُونَـةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهِـيَ خَالَتُـهُ وَخَالَـةُ ابْـنِ عَبَّـاسٍ، فَوَجَـدَ عِنْـدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدَّمُ إِلَيْهِ طَعَامٌ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِـرْنَ رَسُـولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ: هُوَ الضَّبُّ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ، فَرَفَـعَ رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّـهِ؟ قَـالَ: «لاَ وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ»، قَالَ خَالِـدٌ: فَاجْتَرَرْتُـهُ فَأَكَلْتُـهُ، وَرَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْظُرُ فَلَمْ يَنْهَنِـي. {الحـديث: ٥٠٠٩ = ٤٩٩٦ فـم. أبـو داود. أطعمة: ٣٧٩٥. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٢٧}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: خالیـدی کـوڕی وەلیـد، کـەپێی دەگـوترێ: سـیف الله: شمشـێری خـودا، هـەواڵی پێمـدا فـەرمووی: لەگـەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چـووین بـۆ مـاڵی مەیموونـە، کـە هاوسـەری پێغەمبـەر بـوو، وە پـووری مـن‌و ئیبنـو عـەبباس بـوو، خوشـکی دایکمـان بـوو، بـزن مژەیـەکی برژاویان دانا بۆی، کە حەفیدەی کچی حاریث لە نەجدەوە هێنـابووی بـەدیاری بـۆ مەیموونـەی خوشـکی، دەسـتووری پێغەمبـەر وابـوو، کـە خواردەمەنییـەکیان دادەنـا بۆی، بۆیان روون دەکردەوە کە چییەو ناویان دەهێنا بۆی، جا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی درێژکرد بۆی کەلێی بخوا، ئافرەتێ لە ئامادەبوان گوتی: ئەی ژنگـەل! عەرزی پێغەمبەر بکەن کە ئەوە چییە کەوا خەریکە دەیخوات. ژنەکانیش گوتیـان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە گۆشتی بزن مژەیە کە بۆمان داناویت. ئیتر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کێشایەوە، خالیـدی کـوڕی وەلیـد فـەرمووی: منـیش گـوتم:

ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: (نەء، حەرام نییە، بەڵام لەوڵاتی ئێمە نییە، لەبەرئەوە دەبینم دڵم نایبات). خالید فەرمووی: جا منیش رام کێشا بۆلای خۆمو لەبەرچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستم کرد بەخواردنی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیبی لێ نەکردم لەخواردنی). {تاج/٣/١٥٠، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٢}.

١٣٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي فِي غَائِطٍ مَضَبَّةٍ وَإِنَّهُ عَامَّةُ طَعَامِ أَهْلِي، قَالَ: فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقُلْنَا: عَاوِدْهُ، فَعَاوَدَهُ، فَلَمْ يُجِبْهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ نَادَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الثَّالِثَةِ فَقَالَ: «يَا أَعْرَابِيُّ! إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ أَوْ غَضِبَ عَلَى سِبْطٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ فَمَسَخَهُمْ دَوَابَّ يَدِبُّونَ فِي الأَرْضِ، فَلاَ أَدْرِي لَعَلَّ هَذَا مِنْهَا، فَلَسْتُ آكُلُهَا وَلاَ أَنْهَى عَنْهَا». {الحديث: ٥٠١٨ = ٥٠٠٥ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرەبێکی سارانشین هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من نیشتەجێی شیوو دۆلێکم بزن مژەی زۆرە، خۆراکی زۆرینەی کەسوکارەکەمە ئایا دروستە یانا؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە، ئێمەیش پێمان گوت: پرسیارەکەی لێ دووبارە بکەرەوە، ئەویش دووبارەیکردەوە، بەڵام وەڵامی نەدایەوە تاسێ جار، جا لەپاش جاری سێیەم بانگی کردو پێی فەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی کاکەی عەرەب! خودای گەورە نەفرەتو لەعنەتی کردووە، لە بەرەبابێ لە بەرەبابەکانی نەوەی ئیسرائیلو غەزەبی لێ گرتوونو کردوونی بە جانەوەرو دەعباو دەعەجانیو لەناو ئەم زەوییەدا دەخولێنەوەو دێنو دەچن، منیش نازانمو مەترسی ئەوەم هەیە کە ئەمەیش لەوان بێ، جا لەبەرئەوە نەخۆم دەیخۆمو نە بەکەسیش دەڵێم مەیخۆن!).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەمەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم فەرموودەیەدا دەیفەرموێ، کە بۆیە گۆشتی بزن مژە ناخوا، چونکە دەترسێ بزن مژە لەو تیرەو بەرە بابانەبن لەبەنی ئیسرائیل، کە خودا کردوونی بە مەیموون و بەراز، ئەمە لەپێش ئەوەدا بووە کە خودا ئاگاداری بکا: (کە خودای گەورەو سەروەر هەر هۆزێکی فەوتاندبێ، یا هەر هۆزێکی سزا دابێ و کردبنی بە مەیموون و بەراز، بنەبڕی کردوون و وەچەی لێ نەخستوونەتەوە). {بڕوانە: موسلیم. قەدەر. ژمارە: ٦٧١٤ + تاج/٥، لاپەڕە: ٣٥٩، ژمارە: ٥١٦٨، زنجیرە: ٨ ج/٤. تاج الأصول. المجلد الخامس. مبحث (الآجال والأرزاق محدودة) ص١٩٤. دار الفكر بيروت. الطبقة الرابعة}.

## ١٠١٨) خواردنی کوللە. (٥٠١٩ - ٥٠٢١)

## بابٌ: أَكْلُ الجَرَادِ

١٣٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ. {الحديث: ٥٠١٩ = ٥٠٠٦ فم. تجريد/٥/١٢٤، رقم: ١٨٣١ = ٥٤٥٩. أبو داود. أطعمة: ٣٨١٢. ترمذي. أطعمة: ١٨٢١. نسائي. صيد وذبائح: ٤٣٦٧. تحفة الأشراف: ٥١٨٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەوت غەزا، یا شەش غەزامان، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە، کە لەو غەزایانەدا، لەگەڵ پێغەمبەردا کوللەمان دەخوارد). {تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٠ ج/٤}.

## ١٠١٩) خواردنی گیانلەبەرانی ئاوی و گیانلەبەرانی دەریا فڕێی بداتە دەرەوە. (٤٩٧٤ - ٤٩٨٠)

## باب: أَكْلُ دَوابِّ البَحْرِ وَمَا أَلْقى

١٣٢٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَمَّرَ عَلَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ نَتَلَقَّى عِيرًا لِقُرَيْشٍ، وَزَوَّدَنَا جِرَابًا مِنْ تَمْرٍ لَمْ يَجِدْ لَنَا غَيْرَهُ، فَكَانَ

أَبو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرَةً تَمْرَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِهَا؟ قَالَ: نَمَصُّهَا كَمَا يَمَصُّ الصَّبِيُّ، ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهَا مِنَ الْمَاءِ فَتَكْفِينَا يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ، وَكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنَا الْخَبَطَ، ثُمَّ نَبُلُّهُ بِالْمَاءِ فَنَأْكُلُهُ، قَالَ: وَانْطَلَقْنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَرُفِعَ لَنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ كَهَيْئَةِ الْكَثِيبِ الضَّخْمِ، فَأَتَيْنَاهُ فَإِذَا هِيَ دَابَّةٌ تُدْعَى الْعَنْبَرَ، قَالَ: قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ، ثُمَّ قَالَ: لاَ بَلْ نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدِ اضْطُرِرْتُمْ فَكُلُوا، قَالَ: فَأَقَمْنَا عَلَيْهِ شَهْرًا، وَنَحْنُ ثَلاَثُ مِائَةٍ حَتَّى سَمِنَّا، قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْتَرِفُ مِنْ وَقْبِ عَيْنِهِ بِالْقِلاَلِ الدُّهْنَ وَنَقْتَطِعُ مِنْهُ الْفِدَرَ كَالثَّوْرِ، أَوْ كَقَدْرِ الثَّوْرِ، فَلَقَدْ أَخَذَ مِنَّا أَبُو عُبَيْدَةَ ثَلاَثَةَ عَشَرَ رَجُلاً فَأَقْعَدَهُمْ فِي وَقْبِ عَيْنِهِ، وَأَخَذَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلاَعِهِ، فَأَقَامَهَا، ثُمَّ رَحَلَ أَعْظَمَ بَعِيرٍ مَعَنَا، فَمَرَّ مِنْ تَحْتِهَا، وَتَزَوَّدْنَا مِنْ لَحْمِهِ وَشَائِقَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّهُ لَكُمْ، فَهَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ فَتُطْعِمُونَا»؟ قَالَ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْهُ فَأَكَلَهُ. {الحديث: ٤٩٧٤ = ٤٩٥٩ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٣٥٦، رقم: ١٦٠٥ = ٤٣٦٠، ٢٤٨٣، ٢٩٨٣، ٤٣٦١، ٤٣٦٢، ٥٤٩٣}:

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەشکرێکی سێ سەد کەسی نارد بۆ قەراخی دەریا، وە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحی کرد بەسەر لەشکریان، من خۆم لەو لەشکرەدا بووم، سێ سەد سوار بووین، ناردینی منەی کاروانێکی قوڕەیشمان دەکرد، پڕ هەمانەیێ خورمای پێماندا، جگە لەوە هیچی تر نەبوو بمانداتێ، دەرچووین، ئەبو عوبەیدە ڕۆژی سەرو یەك دەنك خورمای پێمان دەدا، فەرمووی: منیش بە جابیرم گوت: جا تاقە دەنکێ خورما، بەکەڵکی چیتان دەهاتو چیتان لێ دەکرد؟ فەرمووی: وەك چۆن منالی ساوا مەمکی دایکی دەمژێ، ئاوا ئەو دەنکە خورمایەمان دەمژیو ئاومان دەکرد بەسەریدا، ئیتر بەشی ئەو ڕۆژە تا ئێوارێی دەکردین، بە گەڵا کوتکیش گەڵای دارشیلان (قەرظ: سلم)مان دەوەراندو بەئاو تەڕمان دەکردو دەمانخوارد.**

فەرمووی: لەپاشا گەیشتینە سەر کەناری دەریا، روانیمان وا لەوێ لە دوورەوە، شێوە تەپۆڵکە لمێکی زەبەلاحمان لێ دەرکەوت، کە چووین بۆ سۆراخی، روانیمان وا لاشەی نەهەنگێکە کەپێی دەگوترێ: عەنبەر، چونکە بۆنی خۆشی عەنبەر، لەناو ریخۆڵەکانی دەردەهێنرێ، لەکەنار دەریاکە بەمردوویی کەوتووە، فەرمووی: ئەبو عوبەیدە فەرمووی: (ئەمە مردارەوە بووە، لەبەرئەوە حەرامەو نادروستە، کەواتە لێی مەخۆن).

لەپاشا بڕیاریداو فەرمووی: راستە کە ئەمە مردارەوە بووە، بەڵام لێی بخۆن، بۆ ئێمە حەڵاڵە، چونکە یەکەم: ئێمە نێردراوانی پێغەمبەری خوداین‌و پێغەمبەر ناردووینی بۆ ئەرکێکی ئایینی پیرۆز، دووهەمیش: ئێمە ناچارین‌و لێمان قەوماوەو کەوتووینەتە تەنگانەی برسێتییەوە، کەواتە لێی بخۆن. فەرمووی: جایەك مانگی رەبەق لەسەری دامانکوتاو، ئەو سێ سەد کەسە دەستمانکرد بە لێخواردنی، هەتا تەواو قەڵەو بووین‌و هەناوێکمان تێ هاتەوە.

بەچاوی خۆم دەمدی کە بە کووپەو گۆزەی گەورە رۆنمان لە کالانەی چاوی هەڵدەگۆزی، وە پارچەی وامان لێ دەبڕی بەقەد لاکی جوانە گایەك دەبوو، ئەبو عوبەیدە سیازدە پیاوی لێ هەڵبژاردین، هەر سیازدەیان لە کالانەی چاویدا دانیشتن‌و جێیان بۆوە، ئەوجا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد دوو پەراسووی ئەو نەهەنگەیان راست کردەوەو لەبنەوە کەمێ بڵاویان کردنەوەو لەسەرەوە نووکەکانیان نووساندن بەیەکەوە، لەچەشنی دوولا شیپانەی دەرگای دەروازە، ئەوجا فەرمانی کرد وشترێکی زەبەلاحیان کۆپانکردو پیاوێکی فیلە تەنمان تیادا بوو، لەسەر ئەو کۆپانەوە سواری ئەو وشترەی کردو بەژێر ئەو دوو پەراسووەدا رۆیشت سەری نەیدا لە پەراسووەکان. بڕێ لە گۆشتەکەیمان پارچە پارچە کردو زەردمانکردو نیوە کوڵ کرد، لەگەڵ خۆمانا بردمانەوە بۆ مەدینە، کاتێ چووینەوە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەمان باسکرد بۆی، فەرمووی: (ئەوە رۆژیو رزقێکی پاك‌و پیرۆز بووە، خودا رەخساندوویەتی بۆتان، ئایا لەو گۆشتەتان

لەلاماوە، هەتا دەرخواردی ئێمەیشی بدەن؟). فەرمووی: جا لەو گۆشتە بەشی پێغەمبەرمان دا، لێی خوارد. {تاج/٣، لاپەڕە: ١٥٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٢٥٦١ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: لە (دائرة المعارف البريطانية)دا دەڵێ: جاری وا هەیە (٣٠) سیی مەتر درێژە، کێشی (سەنگی: وەزنی) دەگاتە (١٣٦٠٠٠) سەدو سیی‌و شەش هەزار کیلۆ، گەورەترین گیانلەبەری ئاوییە.

### ١٠٢٠) خواردنی گۆشتی ئەسپ‌و ماین دروستە. (٤٩٩٧ - ٥٠٠٠)

### بابٌ: فِى أكْلِ لُحُومِ الخَيْلِ

١٣٢٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِى لُحُومِ الْخَيْلِ. {الحديث: ٤٩٩٧ = ٤٩٨٣ فم. بخاري. مغازي: ٤٢١٩، ٥٥٢٠، ٥٥٢٤. أبو داود. أطعمة: ٣٧٨٨. ترمذي. أطعمة: ١٧٩٣. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٣٨ز تحفة الأشراف/٢٦٣٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای خەیبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کرد لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵی، وە ڕێگەی خواردنی گۆشتی ئەسپ‌و ماینی دا. {تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٣}.

١٣٢٨- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَسًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَكَلْنَاهُ. {الحديث: ٤٩٩٩ = ٤٩٨٦ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٢٥، رقم: ١٨٣٢ = ٥٥١١، ٥٥١٠، ٥٥١٢، ٥٥١٩}:

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، ئەسپێکمان سەربڕی‌و خواردمان. {تاج/٣، ژمارە: ٢٥٥٤، زنجیرە: ١}.

### ١٠٢١) ڕێگریی لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵی. (٤٩٨١ - ٤٩٩٦)
### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ

١٣٢٩- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. {الحديث: ٤٩٨٣ = ٤٩٦٨ فم. بخاری. ذبائح وصيد: ٥٥٢٧}:

ئەبو ثەعلەبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردنی گۆشتی کەری ماڵی نادروست کردووە).

١٣٣٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَيْبَرَ، أَصَبْنَا حُمُرًا خَارِجًا مِنَ الْقَرْيَةِ فَطَبَخْنَا مِنْهَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَلاَ إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْهَا فَإِنَّهَا رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ، فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ بِمَا فِيهَا وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِمَا فِيهَا. {الحديث: ٤٩٩٥ = ٤٩٨٢ فم. بخاری. مغازی: ٤١٩٩، ٥٥٢٨. تحفة الأشراف: ١٤٥٢}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەیبەری ئازادکرد، کۆمەڵێ کەری ماڵیمان دەست کەوت، لەدەرەوەی گوندەکە، سەرمان بڕینو لەوکاتەدا، کە چێشتمان دەکرد لە گۆشتەکەیانو خەریکی کوڵانی گۆشتەکەیان بووین لەسەر ئاگر، جارچی پێغەمبەر لەناومانا جاڕی هەڵدا: ئاگاداربن کە خوداو پێغەمبەری خودا ڕێگەی ئەوەتان نادەن، کە گۆشتی گوێدرێژ بخۆن، چونکە ئەوە چەپەڵو پیسەو لەکاری شەیتانە، ئیتر خەڵکەکە مەنجەڵەکانیان بە گۆشتەکەوە قلپ کردەوە، لەکاتێکا کە هێشتا قوڵپە قوڵپ دەکوڵان لەسەر ئاگرەکە). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٥٦، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٦٤}.

### ١٠٢٢) ڕێگری لە خواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار. (٤٩٦٥ - ٤٩٧٣)
### باب: النَّهْيُ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ

١٣٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ». {الحديث: ٤٩٦٩ = ٤٩٥٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار، خواردنی گۆشتەکەی حەرامە).

**١٠٢٣) هەر باڵندەیێ چنگ‌و نینۆکی تیژی هەبێ، خواردنی گۆشتەکەی نادروستە.** (٤٩٦٥ - ٤٩٧٣)

**بابٌ: النَّهْيُ عَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ**

١٣٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ. {الحديث: ٤٩٧٠ = ٤٩٥٥ فم}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەخواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدارو لەخواردنی گۆشتی باڵندەیێ کە چنگ‌و چڕنووکی هەبێ‌و ڕاوی پێبکا، خواردنی گۆشتی ئەم دوو جۆرە جانەوەرەی قەدەغە کردووە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٧٣}.

**١٠٢٤) خواردنی سیر ناباش‌و ناپەسەندە.** (٥٣٢٤ - ٥٣٢٦)

**باب: كراهية أكْلِ الثُوم**

١٣٣٣- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَزَلَ عَلَيْهِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي السُّفْلِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي الْعُلْوِ، قَالَ: فَانْتَبَهَ أَبُو أَيُّوبَ لَيْلَةً فَقَالَ: نَمْشِي فَوْقَ رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟! فَتَنَحَّوْا فَبَاتُوا فِي جَانِبٍ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «السُّفْلُ أَرْفَقُ»، فَقَالَ: لاَ أَعْلُو سَقِيفَةً أَنْتَ تَحْتَهَا، فَتَحَوَّلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي الْعُلْوِ وَأَبُو أَيُّوبَ فِي السُّفْلِ، فَكَانَ يَصْنَعُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) طَعَامًا، فَإِذَا جِيءَ بِهِ إِلَيْهِ سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِهِ، فَيَتَتَبَّعُ مَوْضِعَ أَصَابِعِهِ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فِيهِ ثُومٌ، فَلَمَّا رُدَّ إِلَيْهِ سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقِيلَ لَهُ: لَمْ يَأْكُلْ، فَفَزِعَ، وَصَعِدَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَحَرَامٌ هُوَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ وَلَكِنِّي

أَكْرَهُهُ»، قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ مَا تَكْرَهُ أَوْ مَا كَرِهْتَ، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُؤْتَى. {الحديث: ٥٣٢٦ = ٥٣١٧ فم}:

ئـەبو ئـەيیوبی ئەنصـاری (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: لەسـەفەری كۆچـا، كاتـێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی گەیشـتە شاری مەدینـە، لـەماڵی مـن دابـەزی، خانووەكەم دووقات بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەقاتی خـوارەوە دادەنیشت، خۆمو خێزانەكەیشم لەقاتی سەرەوە دادەنیشتین، چونكە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) میوانو پێشوازیكاری زۆر دەهات، قاتی خوارەوە بۆ ئەو لەبارتر بـوو، جا شـەوێ ئەبو ئەیيوب بیردەكاتەوەو دەفەرموێ: چـۆن دەبـێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـە خـوارەوە بـێو ئێمـە بەسـەریا هاموشـۆ بكـەینو بێینو بچـین؟! جا ئـەو شـەوە لـە لاتەنیشتێكەوە شـەو دەكەنـەوە، ئـەوجا ئـەبو ئـەيیوب حاڵەكـەی عـەرزی حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) كـرد، ئـەویش فـەرمووی: (قـاتی خـوارەوە بـۆ ئێمـە لـەبارترە، بەتایبەتی لەبەر هاموشۆكەران!).

ئەبو ئەیيوب عەرزیكرد: ناچمە سـەربانێ كـەتۆ لـەژێریابی) ئـیتر جێگەكـەیان ئاڵوگۆڕكرد، پێغەمبەرو ئەبوبەكر چوونە سەرەوە، ئەبو ئەیيوبو ژنەكەشی هاتنـە قـاتی خـوارەوە، دەسـتووری ئـەبو ئـەیيوب وابـوو، كاتـێ نـانی دروسـت دەكـرد بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەپاش ئـەوە كـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێـی دەخـوارد، دەیانهێنایـەوە بـۆلای ئـەبو ئـەيیوب، دەیپرسـی: كامـە جێگـە دەسـتی پێغەمبەرە، جا لەجێگە پەنجـەكانی پێغەمبـەرەوە لەخواردنەكەی دەخـوارد، رۆژێ نـانێكی بـۆ دروسـت دەكـا، سـیری تیادەبـێ، كاتـێ دەیهێننـەوە بـۆلای ئـەبو ئـەیيوب، دەپرسێ كامە جێگە پەنجەكەی پێغەمبـەرە؟ دەڵـێن: لێـی نـەخوارد، ئـەبو ئـەیيوب شەڵەژاو چووە سەرەوە بۆلای، عـەرزیكرد: قوربـان! ئایـا سـیر حـەرامو نادروسـتە وا لێیـت نـەخوارد؟ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (نـەء، حـەرامو نادروسـت نییە، بەڵام من خۆشیم لێی نایە، لەبەرئەوە نایخۆم!).

ئەبو ئەیيوبیش فەرمووی: (دەی منیش خۆشیم لەوشـتە نایـێ كـەتۆ خۆشـیت لێی نەیێ).

فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر وابوو، فریشتە دەهاتن بۆ خزمەتیو گفتوگۆی لەگەڵ ەکردن، حەزی نەدەکرد لەو کاتانەدا دەمی بۆنی سیری لێ بێ!)

**روونکردنەوە:**

١- بڕوانە ئەم ژمارانە کە لەپێشەوە، لەبەرگی یەکەما رابوردن: ژمارە: ٢٥١ مختصر صحیح مسلم = ١٢٤٨ شرح صحیح مسلم + ژمارە: ١٢٥٣/٢٥٢ + ژمارە: ١٢٥٨,/٢٥٣

٢- پێغەمبەر لەماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری حەوت مانگ مایەوە، هەتا مزگەوتەکەی دروست کرد. بۆ ژینن‌نامەی ئەبو ئەییوب بڕوانە ژمارە/١٠٩ لەپێشەوە. بڕوانە: تەجرید بوخاری، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٤١/١١٧/١٤٤ فتح الباری.

## ١٠٢٥) پۆشینی نەنگی خۆراك. (٥٣٤٨ - ٥٣٥٢)
## بابٌ: فِي تَرْكِ عَيْبِ الطَّعَامِ

١٣٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَابَ طَعَامًا قَطُّ، كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ سَكَتَ. {الحديث: ٥٣٥١ = ٥٣٤٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٢٦ = ٣٥٦٣، ٥٤٠٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خراپەو نەنگ لەخواردنو نانو ئاو بگرێ، دەستووری وابوو ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە وازی لێ دەهێناو بەسو نەنگو رەخنەی لێ نەدەگرت). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٥٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٧٣٦} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٦}.

## (پوختەیەکی کورتی نامەی خواردنەکان)

١- هەر خۆراکێ ناوی خودای لێ نەهێنرێ شەیتان بە حەلاڵی دەزانێو لێی دەخواتو پیتو فەڕی نامێنێ.

٢- شەیتان نەفامو نەزان بەکاردەهێنێ بۆ گەیشتن بە مەبەستی گلاوی خۆی، شەیتان شت دەخواتو دەخواتەوە.

٣- دروست نییە لە خواردنو خواردنەوەی حەرام ناوی خودا بهێنرێ، بەڵکوو کاری وا گاڵتەکردنە بە ئایین. خوا پەنامان بدا.

٤- سوننەتە خواردنو خواردنەوە بەدەستی راست بێ، مەگەر لەبەر ناچاری.

٥- واباشە مرۆڤ لەبەردەمی خۆیەوە بخوات، مەگەر هۆیەکی رەوا هەبێ.

٦- سوپاس کردنی خودا لەسەر نانو ئاو سوننەتە.

٧- زەخیرە خستن بۆ بژێویی خێزان بەپێی باوی ناسراوی ناو کۆمەڵ پەسەندە.

٨- کۆمەڵێ گیاندار کە گۆشتیان دەخورێ یا ناخورێ.

٩- دروست نییە نەنگو رەخنە لەنانو ئاو بگیرێ، بەلاّم شتێ کە دڵ نەیبا، واباشە بەزۆر نەیخۆیت.

١٠- خۆڵو گڵو قوڕو بەردو دارو درەختو گژوگیاو پووشو رووەك بەگشتیو کانو کانزا، وەك خوێو قیرو نەوتو بەنزینو غازو ئاوو زەهرو ژەهرو هەرچی تر هەیە لەسەر زەوی، گیانلەبەرو پاشەڕۆو بەرهەمی گیانلەبەری لێ دەرچێ، ئەمانە هەموو لە بنەڕەتدا پاکن، لەبەرئەوە حەرام نین، بەلاّم بەم سێ مەرجە:

أ/ زیان لەگیانو جەستەو هۆشی مرۆڤ نەدەن، ئەگەر شتی وا رووبدا، خواردنو خواردنەوەیان نادروستەو تاوانە، وەك کەسێ ئەوەندە نەوت، یا زەهر، یا گووژاڵك بخوات کە بیکوژێ، یا شەلو شێتو گێڕو ویڕی بکا یا هەر زیانێکی تری لێبدا.

ب/ لەشەرعا، بە پیس، یا بەحەرام دانەنرابێ، وەك مەیو بادەو تلیاكو هەموو ماددەیەکی سەرخۆشکەرو بکوژو پیس یا حەرام.

ج/ تێکلاّوی شتی پیسی شەرعی نەبووبنو بەشتی پیس پیس نەبووبن، وەك بەردێکی جیقناوی، یا دارێکی گلاّو بوو.

١١- خواردنو خواردنەوەکانو گیانلەبەران لەپێشەوە بڕیارەکانیان زانران، گەرچی بەکورتیش بوو.

# پێڕستی سەرە باسەکان

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ١ | **٢٧- نامەی تۆڵەی تاوان (حودوود)** |
| ١ | ٨١٤) تۆڵەی شەرعی کەسێ کچ یا کوڕبێ، بێوەژن یا بێوە پیاوبێو داوێنپیسی بکا (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦) |
| ٢ | ٨١٥) بەردە بارانی ژنو پیاو، کاتێ داوێنپیسی بکەن |
| ٣ | ٨١٦) حەدد جێبەجێ دەکرێ لەسەر کەسێ کەپێ لەکردنی تاوانی داوێنپیسی بنێ. (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦) |
| ٥ | ٨١٧) پێلێنەر چوارجار پێلێنان لەداوێنپیسی دووبارە دەکاتەوە، چاڵێ بۆ بەردەبارانکراو هەڵ دەکەنرێ ژنی دووگیان دوادەخرێ تا منالەکەی دادەنێ، بەردەبارانکراو نوێژ لەسەر تەرمەکەی دەکرێ. (٤٣٨٩ - ٤٤٢٦) |
| ٧ | ٨١٨) ئەگەر خاوەن نامەکان، خاوەن پەیمان بوون (واتە: ئەهلی ژیممە بوون) لەسەر داوێنپیسی سەنگەسار دەکرێن |
| ٨ | ٨١٩) داری حەدد دەدرێ لە کەنیزەك (ژنی کۆیلە) ئەگەر داوێنپیسی بکا |
| ٩ | ٨٢٠) ئاغای کۆیلە داری حەدد ئەدا لەکۆیلەی خۆی |
| ١٠ | ٨٢١) سزای دزیو ئەو ئەندازەیە لەماڵی دزراو، کەدەبێ بەهۆی بڕینی دەستی دز. |
| ١٠ | ٨٢٢) دەستی دز دەبڕرێ لەسەر شتێ کەبایی سێ درەم بێ |
| ١١ | ٨٢٣) لەسەر هێلکەیێ دەست دەبڕرێ |
| ١١ | ٨٢٤) جڵەوگیری لەتکاکردن بۆ جێبەجێ کردنی حەددێکی شەرعی(٤٣٨٦ - ٤٣٨٨) |
| ١٣ | ٨٢٥) سزای مەینۆشیی - ژمارەی جەڵدی حەددی ئارەقخواردنەوە چەندە |
| ١٥ | ٨٢٦) ژمارەی دار لێدانی تەمێکردن. (٤٤٣٥) |
| ١٥ | ٨٢٧)کەسێ شایانی حەددێ بێ لەحەددە شەرعییەکان، وە ئەو حەددەی بەسەردا جێبەجێ کرا، ئیتر ئەوە دەبێ بەکەفارەتی ئەو گوناهە بۆی(٤٤٣٦ - ٤٤٣٩) |
| ١٨ | **٢٨- نامەی دادوەریو شایەتیدان** |
| ١٨ | ٨٢٨) بڕیاری شەرع بەپێی رووکارە (حوکم بەپێی زاهیرە) هەندێ کەسیش لە بەڵگە سازیدا بەدەمو پلترە |
| ١٩ | ٨٢٩) باسی رق ئەستوورو شەڕانی. (٦٧١٧ - ٦٧٢٥) |
| ١٩ | ٨٣٠) بەڵگەو نیشانە لەسەر داواکارە، داوا لێکراویش، ئەگەر نەچووە ژێری، ئەوا سوێندی لەسەرە. |
| ٢٠ | ٨٣١) بڕیاردان بەپێی سوێندو شایەتیی شایەتێ. (٤٤٤٧) |
| ٢٠ | ٨٣٢) لەکاتی توورەییدا، دادوەر نابێ کەسێ دادگایی بکا. (٤٤٦٥ - ٤٤٦٦) |

٨٣٣) دادوەر کاتێ بڕیار دەدا ئەگەر بۆ دۆزینەوەی بڕیاری دروست تێکۆشێ، ئیتر بیپێکێ، یا هەڵەبکا، پاداشی بۆهەیە. (٤٤٦٢ - ٤٤٦٤) ٢١

٨٣٤) ڕاجیایی تێکۆشەرانی شەرع لەبڕیاردا. (٤٤٧٠ - ٤٤٧١) ٢١

٨٣٥) دادوەر ناوبژی لەنێوانی هاوداواکانا دەکا. (٤٤٧٢) ٢٢

٨٣٦) نموونەی باشترین شایەت. (٤٤٦٩) ٢٣

## ٢٩- نامەی دۆزراوە ٢٤

٨٣٧) بڕیاری هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو. (٤٤٧٣ - ٤٤٨٥) ٢٤

٨٣٨) هەڵگرتنەوەی داکەوتووی حاجیان ٢٥

٨٣٩) کەسێ گومبوویێ حەشاربدا. (٤٤٨٦ - ٤٤٨٧) ٢٥

٨٤٠) نەیی کراوە لەدۆشینی ئاژەڵی خەڵکی بەبێ مۆڵەتی خاوەنی. ٢٦

## ٣٠- نامەی میوانداری ٢٧

٨٤١) کەسێ بەئەرکی میوانداریی هەڵ نەسێت ٢٧

٨٤٢) فەرمانکردن بەمیوانداریی. (٤٤٨٨ = ٤٤٩١) ٢٧

٨٤٣) دەسگیرۆیی یەکتری بەماڵی زیادە. (٤٤٩٢) ٢٨

٨٤٤) فەرمانکردن بە کۆکردنەوەی پاشەڕۆك و بنبۆڵی توێشە بەرەو نانەبەرەو شتی واو دەستگیرۆیی لەم لایەنەوە. (٤٤٩٣) ٢٨

## ٣١- نامەی خەباتو تێکۆشان ٣٠

٨٤٥) فەرمایشتی خودای گەورە: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا} لەگەڵ باسی گیانی شەهیدان ٣٠

٨٤٦) دەرگاکانی بەهەشت وان لەسای سێبەری شمشێردا. (٤٨٨٨ - ٤٨٨٩) ٣١

٨٤٧) هاندان لەسەر خەباتگێڕانو گەورەیی خەباتگێڕان. (٤٨٣٦ - ٤٨٤٣) ٣٢

٨٤٨) بەهۆی غەزاو خەباتگێڕانەوە، پلەو پایەی بەندەی موسوڵمان بەرز دەبێتەوە. (٤٨٥٦) ٣٤

٨٤٩) باشترین کەس خەباتگێڕە لەڕێگەی خودادا بەسەرو بەسامان. (٤٨٦٣ ٤٨٦٨) ٣٥

٨٥٠) ئەوەی بمرێو غەزای نەکردبێو لەدڵیشەوە بەتەمای غەزا نەبووبێ(٤٩٠٨) ٣٥

٨٥١) گەورەیی غەزاکردن لەدەریادا. (٤٩١١ - ٤٩١٤) ٣٦

٨٥٢) خێری پاسەوانیی ناو سەنگەرەکانی سەر سنوور. (٤٩١٥ - ٤٩١٦) ٣٧

٨٥٣) تاقێ کۆششو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا لەهەموو سامانو موڵکی جیهان چاکترە. ٣٨

٨٥٤) فەرمایشتی خودای گەورە: {أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِندَ اللّهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ}. (٤٨٤٤ – ٤٨٤٩) ٣٩

٨٥٥) هاندان لەسەر داواكردنی شەهیدبوون. (٤٩٠٦ - ٤٩٠٧) ٤٠
٨٥٦) گەورەیی پایەی شەهیدیی لەرێگەی خودای گەورەدا. (٤٨٤٤ - ٤٨٤٩) ٤١
٨٥٧) رۆڵی نیازو نیازپاكی لە دامەزراندنی كارو كردەوەكاندا. (٤٩٠٤ - ٤٩٠٥) ٤١
٨٥٨) خودای گەورە رازییە لەشەهیدانو شەهیدانیش رازین لەخودا ٤٤
٨٥٩) شەهید جۆری زۆرە. (٤٩١٧ - ٤٩٢٢) ٤٦
٨٦٠) تاعوون شەهادەتە بۆ هەموو موسوڵمانێ. (٤٩١٧ - ٤٩٢٢) ٤٧
٨٦١) خودا لەهەموو گوناهێكی شەهید خۆش دەبێ بێجگە لەقەرز (٤٨٥٧ - ٤٨٦١) ٤٨
٨٦٢) كەسێ لەسەر ماڵی خۆی بكوژرێ شەهیدە. (٣٥٨ - ٣٦٠) ٤٩
٨٦٣) فەرمایشتی خودای گەورە: {رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ} ٥٠
٨٦٤) كەسێ جەنگ بكا هەتا شەریعەتی خودا سەربكەوێ. (٤٨٩٦ - ٤٨٩٩) ٥١
٨٦٥) كەسێ بۆ رواڵەتیو ناوو شۆرەت بجەنگێ. (٤٩٠٠ - ٤٩٠١) ٥٢
٨٦٦) زۆریی پاداش لەسەر جەنگین لەرێگەی خودادا. (٤٨٩٠ - ٤٨٩٥) ٥٥
٨٦٧) غەزاكارو جەنگاوەر، ئەگەر پێكرا، یا بەسەلامەتیو دەسكەوتی جەنگەوە گەڕایەوە. ٥٥
٨٦٨) پاداشی كەسێ تفاقو چەك بۆ جەنگاوەرێ دابین بكا. (٤٨٧٦ - ٤٨٨٤) ٥٦
٨٦٩) كەسێ تفاقی جەنگ ئامادە بكاو دوایی نەخۆش بكەوێ، بابیدات بەكەسێكی تر كەخۆی بچێ بۆ غەزا. (٤٨٧٦ - ٤٨٨٤) ٥٧
٨٧٠) قەدرو رێزی پیاوانی تێكۆشەرو خەباتگێڕ. (٤٨٨٥ - ٤٨٨٧) ٥٨
٨٧١) سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەر: {لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِى ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} ٥٩
٨٧٢) باسی دوو پیاو یەكێكیان یەكێكیان دەكوژێو هەردووكیشیان دەچنە بەهەشت. (٤٨٦٩ - ٤٨٧١) ٦٢
٨٧٣) كەسێ بێباوەڕێ بكوژێ، لەپاشا پابەندبێ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەجوانی. (٤٨٧٢ - ٤٨٧٣) ٦٣
٨٧٤) كەسێ وشترێ لەرێگەی خودادا ببەخشێ. (٤٨٧٤ - ٤٨٧٥) ٦٤
٨٧٥) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ}. (٤٩٢٣ - ٤٩٢٦) ٦٥
٨٧٦) هاندان لەسەر فێربوونی مەشق لەسەر چەك. (٤٩٢٣ - ٤٩٢٦) ٦٦
٨٧٧) خێرو خۆشی لەناوچەوانی ولاخی بەرزە گرێدراوە. (٤٨٢٢ - ٤٨٣٢) ٦٧
٨٧٨) راستو چەپ سپی یا بەپێچەوانەوە لە ولاخی بەرزەدا ناباشە. ٦٨
٨٧٩) پێشبڕكێ لەنێوانی چەند ولاخێكی بەرزەداو پەروەردەكردنو قاڵكردنیان. ٦٩
٨٨٠) سەبارەت بەئایەتی: {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ}. (٤٨٨٨ - ٤٨٨٩) ٧٠
٨٨١) كەسێ بەهۆی نەخۆشییەوە نەچێ بۆ غەزا. (٤٩٠٩ - ٤٩١٠) ٧١

## ٣٢- نامەی کارنامە ٧٤

٨٨٢) باسی فەرماندەکانی سوپاو ئامۆژگاری خێریان. (٤٤٩٦ - ٤٥٠٣) ٧٤

٨٨٣) فەرمانکردن بەنێردە سەربازییەکان بەئاسانکاریی. (٤٤٩٦ - ٤٥٠٣) ٧٨

٨٨٤) ناردنی نێردە سەربازیەکانو کەسێ لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ غەزا. ٧٩

٨٨٥) سنووری نێوانی بچووك کە رێگەی پێ نەدرێ بچێ بۆ جەنگو نێوانی گەورە کە رێگەی پێ بدرێ بچێ بۆ جەنگ. (٤٨١٤ - ٤٨١٥) ٨٠

٨٨٦) رێگە نەدراوە کە قورئان ببرێ بۆ وڵاتی دوژمن. (٤٨١٦ - ٤٨١٩) ٨١

٨٨٧) سەفەر لە تەرە ساڵو لەوشکە ساڵاو وچانگرتنی شەو لەدووری چەقی رێگەوبان. ٨٢

٨٨٨) سەفەر پارچەیەکە لەئێشو ئازار. (٤٩٣٨) ٨٣

٨٨٩) ناباشە کە رێبواری گەڕاوە لەسەفەر، بەشەو لەناکاودا بکا بەماڵدا. ٨٣

٨٩٠) بانگەشەی پێش دەستپێکردنی جەنگو لەناکاو پەلاماردانی دوژمن ٨٤

٨٩١) نامەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پادشاکانی سەردەمی خۆی، داوای لێ دەکردن کە رووبکەنە خودای گەورە. (٤٥٨٥ - ٤٥٨٧) ٨٥

٨٩٢) نامەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نووسی بۆ هیرەقل، داوای لێکرد کە ئیسلام ببێ. (٤٥٨٣ - ٤٥٨٤) ٨٦

٨٩٣) بانگەوازی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ قەبووڵی پەیامی خودای گەورەو حەوسەڵەو ئارامگرتنی لەسەر ئێشو ئازاری دوو رووەکان(٤٦٢٥ - ٤٦٣٧) ٩٣

٨٩٤) نەبیکردن لە بێپەیمانی. (٤٥٠٤ — ٤٥١٣) ٩٦

٨٩٥) پەیمان بەجێهێنان (٤٦١٥) ٩٧

٨٩٦) موسوڵمان شەڕخواز نییەو حەزی لەئاشتیو لاشەڕییە، بەڵام کەتووشیش .... تاد ٩٨

٨٩٧) نزاکردن لەدوژمن. (٤٥١٨ - ٤٥٢١) ٩٩

٨٩٨) شەڕ بەفڕوفێڵ دەبڕێتەوە. (٤٥١٤ - ٤٥١٥) ١٠٠

٨٩٩) داوای کۆمەکی لەبت پەرست ناکرێ. (٤٦٧٧) ١٠٠

٩٠٠) ئافرەتانیش لەگەڵ پیاواندا دەچن بۆ غەزا. (٤٦٥٧ - ٤٦٦٠) ١٠١

٩٠١) ژنو منداڵو پیرەمێرد لەجەنگا ناکوژرێن. (٤٥٢٢ - ٤٥٢٣) ١٠٤

٩٠٢) پێکانو زامداربوونو کوژرانی ژنو منالی ساوای دوژمن لەکاتی بەسەرردانو شەبەیخوونی شەودا. (٤٥٢٤ - ٤٥٢٦) ١٠٥

٩٠٣) برینی باخی دوژمنو سووتاندنی. (٤٥٢٧ - ٤٥٢٩) ١٠٥

٩٠٤) بردنی خۆراکی خاکی دوژمن. (٤٥٨٠ - ٤٥٨٢) ١٠٧

٩٠٥) دەسکەوتی تالآنی حەلآلکراوە بۆ ئەم نەتەوەی ئیسلامە بەتایبەتی. (٤٥٣٠) ١٠٧
٩٠٦) باسی ئەنفال، کەئەو ماڵی تالآنیەیە، کە لەکاتی جەنگا، بەزەبری شیرو تیرو بەهێزی بازوو لە ناموسوڵمانەکان دەستێنرێ. (٤٥٣١ - ٤٥٤٠) ١٠٩
٩٠٧) لە دەستکەوتی جەنگ پشك دادەنرێ بۆ پەلێ لە لەشکری ئیسلام، کەبچن بۆ غەزا ١١١
٩٠٨) نەفل (واتە: ماڵی تالآنی جەنگ کەلە ناموسوڵمانان بەجەنگ وەردەگیرێ) دەکرێ بەپێنج بەشەوە، پێشەوای موسوڵمانان سەرپەرشتی دابەشکردنی پێنج یەکی ماڵی تالآنی دەکاو ئەو چوار بەشەکەی تریشی بۆ تالآنی پەیداکەرەکانە ١١١
٩٠٩) کەسێ لەغەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێ، تفاقو کەلوپەلەکەی رووت دەکاتەوەو دەیبا بۆخۆی. ١١٢
٩١٠) تفاقی کوژراو دەدرێ بەهەندێ لە بکوژانی، بە ئیجتیهادو تێڕوانین. ١١٤
٩١١) جاری واهەیە بەهۆی کۆشش (إجتهاد)ەوە چەكو تفاقی رووتەوەکراو لەکوژراو نادرێ بەبکوژی. (٤٥٤١ - ٤٥٤٧) ١١٦
٩١٢) رووتەوەکراو (سەلەب) گشتی دەدرێ بەبکوژ. (٤٥٤١ - ٤٥٤٧) ١١٨
٩١٣} هەندێ بەشدانی تایبەت لە دەسکەوتی جەنگ بەهەندێ کەس‌و گۆڕینەوەی دیلی موسوڵمان بەدیلی ناموسوڵمان. {٤٥٤٨} ١٢١
٩١٤} بەشی کاتی رێکەوتن‌و پشکی پێنج یەك کە لەدەستکەوتی جەنگی دەدرێ. ١٢٣
٩١٥} چۆنێتی دابەشکردنی فەیأ، کە ئەو دەستکەوتە تایبەتەیە، کە لەکاتی ئازادکردنی شوێنێ لەخاکی ناموسوڵمانەکان دەست دەکەوێ، بەبێ شەڕو شۆڕو کوشتار، کەپێی دەگوترێ: فەیأ، واتە: ماڵی مفت. {٤٥٤٩ — ٤٥٦٠} ١٢٤
٩١٦} باسی پشکی سوارەو پیادە. {٤٥٦١ - ٤٥٦٢} ١٣٤
٩١٧} ژن‌و بەندە لەتالآنی جەنگ پشکیان بۆ دانانرێ وەك پشکی جەنگاوەرەکان، بەلآم چکێکیان پێ دەدرێ، منداڵ‌و ژنیش ناکوژرێن لەکاتی جەنگا، مەگەر جەنگ بکەن یا ببن بەژێر پێوە. ١٣٥
٩١٨} بەردانی دیل بەخۆڕاییو بەپیاوەتی. {٤٥٦٤ - ٤٥٦٥} ١٣٦
٩١٩} چۆلکردنی مەدینە لە جوولەکە. {٤٥٦٦ - ٤٥٧٠} ١٣٩
٩٢٠} دەرکردنی جوولەکەو گاورەکان لەدوورگەی عەرەب. {٤٥٦٦ - ٤٥٧٠} ١٤٠
٩٢١} بریاری شەرع سەبارەت بەوانە کە جەنگ بەرپا دەکەن‌و پەیمان دەشکێنن. ١٤٠

## ٣٢- نامەی کۆچکردن‌و غەزەوات

١٤٣
٩٢٢} کۆچەکەی پێغەمبەرو نیشانەکانی پێغەمبەر. {٧٤٣٨} ١٤٣
٩٢٣} باسی غەزای بەدر. {٤٥٩٧} ١٤٦
٩٢٤} فریشتەی فریا، یاریدەی لەشکری ئیسلام دەدەن، گۆڕینەوەی دیل بەدیل، یا بەردانیان بەرابەر بەسەرانە، حەلآلکردنی تالآنی بۆ لەشکری ئیسلام ١٥٠

٩٢٥} قسەکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) لەگەڵ کوژراوانی بێباوەڕەکانی غەزای بەدر لەپاش مردنیان. {٧١٤٠ - ٧١٥٣} ١٥٥
٩٢٦} باسی غەزای ئوحود. {٤٦١٧ - ٤٦٢٣} ١٥٧
٩٢٧} زامداربوونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕۆژەکەی غەزای ئوحوددا. ١٥٨
٩٢٨} لەڕۆژی غەزای ئوحوددا جوبرائیلو میکاییل لەباتی پێغەمبەر دەجەنگان. ١٥٩
٩٢٩} خودا زۆر تووڕەیە لەکەسێ پێغەمبەری خودا بیکوژێ. {٤٦٢٤} ١٦٠
٩٣٠} ئازاردانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەنی هۆزەکەیەوە. ١٦١
٩٣١} ئارامگرتنی پێغەمبەران لەسەر ئێشو ئازاری هۆزو گەلەکانیان. ١٦٦
٩٣٢} کوشتنی ئەبو جەهل. {٤٦٣٨ - ٤٦٣٩} ١٦٧
٩٣٣} کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف. {٤٦٤٠} ١٦٨
٩٣٤} باسی غەزای زاتوریقاع. {٤٦٧٦} ١٧٤
٩٣٥} باسی غەزای ئەحزاب، کەپێشی دەگوترێ: غەزای خەندەك. {٤٦١٦} ١٧٥
٩٣٦} باسی جوولەکەی بەنی قورەیزە. {٤٥٧٧} ١٧٩
٩٣٧} باسی غەزای ذیقەرەد. {٤٦٥٣ - ٤٦٥٥} ١٨٠
٩٣٨} داستانی ڕێکەوتننامەی حودەیبییەو ڕێکەوتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ هۆزی قورەیشدا. {٤٦٠٥ - ٤٦١٤} ١٩٧
٩٣٩} غەزای خەیبەر. {٣٠٧} ٢٠١
٩٤٠} کۆچکاران بەخشراوەکان دەگێڕنەوە بۆ یاریدەدەران، لەپاش ئازادکردنی وڵاتان بۆیان. ٢٠٣
٩٤١} ئازادکردنی مەککەو چوونە ناوی بەزەبرو زۆرو لێبووردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەڵکەکەی. {٤٥٩٨ - ٤٦٠٤} ٢٠٥
٩٤٢} لابردنی بتەکان لەدەوری کەعبە. {٤٦٠١} ٢١٠
٩٤٣} لەپاش ئازادکردنی مەککە، ئیتر قورەیشی لەسەر وەرگەڕان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ناکوژرێ. {٤٦٠٣} ٢١٣
٩٤٤} لەپاش ئازادکردنی شاری مەککە پەیمان دەدرێ لەسەر ئیسلامەتیو خەباتگێڕانو خێر بەگشتی. {٤٨٠٣ - ٤٨١٠} ٢١٤
٩٤٥} لەپاش ئازادکردنی مەککەو ئیسلام بوونی خەڵکەکەی، کۆچکردن وەك پێش ئازادکردنی مەککە پێویست نییە، بەڵام غەزاکردنو تێکۆشانو خەباتگێڕانو نیازی پاك هەتا ڕۆژی قیامەت هەردەمێنن. {٤٨٠٣ - ٤٨١٠} ٢١٥
٩٤٦} کەسێ کۆچکردن ئەستەم بێ بۆی با کاری خێری تر زۆربکا. ٢١٦
٩٤٧} هەندێ کەس مۆڵەتی پێ دراوە، کە لەپاش کۆچکردن بۆ مەدینە، بڕوات لەدەشت نیشتەجێ بێ ٢١٧

